ژماره 29

گۆڤارێکی مێژوویی وەرزییە،
کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی مێژوویی کوردستان دەریدەکات

# مێژوو

منتدى إقرأ الثقافي

www.iqra.ahlamontada.com



سالی هەشتەم

زستانی 2014

هەموو ئەو بابەتانەی لە گۆڤاری مێژوو بڵاودەبنەوە نوسەرەکانیان لێیان بەرپرسیارن
تەنیا سەروتار نەبێت کە گۆڤاری مێژوو لێی بەرپرسیارە


- گۆڤار : مـێژوو
- ژمارە : (٢٩)
- تیراژ : (٥٠٠) دانە
- چاپخانە : ڕۆژهەڵات



کوردستان / هەولێر - کۆڵانی پشت سەرۆکایەتی زانکۆی سەلاحەددین

g.mezhu@yahoo.com

g.mezhu@hotmail.com

# پێرست

◀ سەروتار



◀ توێژینەوە



◀ القسم العربي

◄ کەشکۆڵی گۆڤار

# دوای سەدەیەك

## سەروتار

(٢٠١٤) سـەدەیەك بەسـەر دوو ڕووداوی گـرنگ لەسـەر ئاسـتی جیهـان و کوردسـتان تێدەپـەڕێت، یەکـەمیان: شـەڕی یەکـەمی جیهـانی (١٩١٤–١٩١٨)، دووەمیـان لـە سـێدارەدانی شـێخ عبدالـسلام بـارزانی(١٩١٤). دیـارە یەکـەمیان لەسەر ئاستی جیهان و دووەمیان لەسەر ئاستی کوردستانە.

لە دوای سەدەیەك ئەوروپا مەینەتییەکانی شـەڕی بـۆ دەرکـەوت بۆیـە ئێـستا شەڕ لەم کیشوەرەدا دوورە بەڵام بەداخەوە کەم وڵاتی ڕۆژهەڵات هەیە بەدەست شەڕی نێوان دوو دەوڵەت یان شەڕی ناوخۆ یان مەترسی تیرۆر نەناڵێنی.

کوردستان لە کاریگـەری شـەڕی یەکـەمی جیهـانی بـەدوور نـەبوو هەرچـەندە کوردستان خاوەن کیانێکی سیاسی نەبوو لەو کاتدا بەڵام بووە گۆڕەپـانی شـەڕو لـەم ڕووەوە قوربـانی زۆری دا. بۆیـە سـەرەتای سـەدەی بیـستەم بـۆ کـورد نەهامەتی فرەی لەخۆوەگرتبوو.

لە لایەکی تر لە ساڵی (١٩١٤) شێخ عبدالسلام بارزانی سەرکردەی دیاری کورد لە سێدارەدرا لـە لایـەن دەسـەڵاتدارانی (اتحـاد والترقـي) لـە دەوڵـەتی عوسمـانی، بەڵام دوای ئەم ڕووداوە بنەماڵەکەی بەردەوام بوون لـە خـەبات تـاکو ئـەمڕۆ واتـە سەدەیەك لە خەباتی بەردەوامی بێ پچڕان لە ڕێگای شێخ أحمدی بـارزان و مـەلا مستەفای بارزانی و ئێستاش سەرۆکی هەرێمی کوردستان بـەڕێز مـسعود بـارزانی. ئەمەش تایبەتمەندییەکی خەباتی بنەماڵەی بارزانییە لـە بزوتنـەوەی نەتەوایـەتی و ڕزگاریخوازی کوریدا کە مـاوەی سـەدەیەکە بەردەوامـە ئـەم لایەنـە لـە مێـژووی سەرکردەکانی تری کوردو بنەماڵەکانیان لە دواییدا بەرچاو ناکەوێت.

پاش سەدەیەك لە شەهیدكردنی شێخ عبدالسلام بارزانی كورد بەچی گەیشتووە لە كوردستانی عێراق كورد حكومەتی هەرێمی كوردستان و پەرلەمانی كوردستانی هەیە كورد لە ڕێگای بۆرییەوە نەوت بۆ توركیا ڕەوانە دەكات و داهاتەكەی لە بەرژەوەندی بزووتنەوەی نەتەوایەتی كورد بەكاردەهێنرێت، خوێندن لە كوردستان بە زمانی كوردییە لە قۆناغی زانكۆش دا ئەو شتەی كە شێخ عبدالسلام لە سەرەتای سەدەی بیستەم داوای دەكرد.

بۆیە دوای سەدەیەك دەتوانین بڵێین شێخ عبدالسلام بارزانی یەكەم مامۆستای بزووتنەوەی نەتەوایەتی كوردی بوو لە سەرەتای سەدەی بیستەم لە كوردستانی عێراق.

# ڕۆڵی عەشیرەتی شەمێران
# ( یەزدان بەخشی )
# لەبزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کورد

نوسینی: ئارام مەجید عەلی

## دەسپێك

ئەگەر ئاورێك لەمێژووی کورد بدەینەوە و باس لەشۆڕش و ڕاپەڕینەکانی کورد بکەین،ئەوا بێگومان ناکرێت لەوەدا ڕۆڵی عەشیرەت و هۆزەکان فەرامۆش بکرێت،چونکە بەشێوەیەکی گشتی بەشێکی بەرچاو لەشۆڕش و ڕاپەڕینەکان بریتی بوون لەهەوڵی سەرۆك عەشیرەتەکان و ئەندامانی هۆز و عەشیرەتەکان،بەتایبەت لەناوچەکوردیەکاندا، ئەمەش لەبەر ئەوەی بەشێکی مێژووی کەلتور و مێژووی کورد و شۆڕشەکانی مۆرکێکی عەشیرەت گەری و هۆزگەری بەسەریدا زاڵبووە،ئەمەش لەهەندێك کاتدا بەزیان بەسەر کورددا شکاوەتەوە و بوەتە هۆی لاوازی هەست و هۆشی نەتەوەی و پەرتەوازەی کۆمەڵگەی کوردی،لەلایەکی تر بەقازانج بۆ کورد شکاوەتەوە و چەندان سەرۆك عەشیرەت و کوێخای گوندەکان توانیویانە چەندین میرنشین و میرنشینەدەوڵەت دامەزرێنن و مەردانە لەبەرامبەر دوژمندا خەباتێکی بەرچاو بکەن و بۆماوەیەك خۆیان ڕاگرن.

مێژووی کوردیش لەبیری عەشیرەت گەری بەدەر نەبووە،ئەوەی هەمان بووە لەمێژوودا وەك دەوڵەت و میرنشینەکانی سەردەمی ئیسلام و میرنشینەکانی سەدەی حەڤدەوهەژدەیەم ئەمانە بەحوکمی نەبوونی بیری نەتەوەی سیمایەکی عەشیرەت گەری و ناوچەگەری خۆی بەسەردا فەرزکردوون،ئەمە هەر بەوە نەوەستاوە لەمێژووی سەردەمەکانی پێشوتردا هەبوبێت بەڵکو ئێستاش لەگۆرەپانی ئەم سەردەمەی مێژووی کورددا بوونی هەیە،لەمەوە دەگەینە ئەوەی بڵێین عەشیرەت و کوردایەتی دووڕووی یەك دراون و خەباتی عەشیرەت گەری بەشێکی دانەبڕاوی مێژووی کوردە و ناکرێت مێژوو خۆی لێ بێدەنگ بکات.

ئەوەی پێوستە بۆ مێژوو بیلێم ئەوەیە هەرگیز مەبەستم ئەوە نیە عەشیرەت گەری بنووسم و خلێلگەریانە بیربکەمەوە و باس لەدەمارگیری عەشیرەت گەری بکەم و رۆحی عەشیرت گەری زیندوو بکەمەوە و بگەرێمەوە خاڵی سەرەتا، بەڵام مەبەستمە مێژوویەك بنووسمەوە شایەنی باسکردن بێت و دووربێت لەهەموو بنەمایەکی دەمارگیری خێڵەکی و شانازیکردن و پێیاهەڵدانێك، ئەوەی هەیە دەمەوێت وەك خۆی بینووسمەوە،بەڵام عەشیرەتی شەمێران وەك هەموو عەشیرەتەکانی تری کوردستان لەبەرامبەر دوژمندا مێژوویەکی هەیە دەمەوێت ئەو مێژووە و مێژووی ئاوەدان کردنەوە و ناوی گوندەکان تۆمارکەم تەنها وەك مێژوو نەك شتی دیکە.

ئەوەشی هەیە لەسەر شەمێران و شەمێرانیەکان بەشێوەیەکی کرچ و کاڵ لەنێو هەندێك سەرچاوەکاندا هەیە و تائێستا کتێبێکی ئەوتۆم بەرچاو نەکەوتووە لەسەر ئەم عەشیرەتە بەدرێژی باسیان بکات،بۆیە دەمەوێت دوور لەهەموو وەلابوونێك بۆ ناوچەگەری و عەشیرەت گەری چەردەیەك لەمێژووی ئەم عەشیرەتە بۆ شەمێرانیەکان بنووسمەوە،چونکە ئەمانە وەك عەشیرەتەکانی تر

خـاوەن خـەباتێکن ناکرێـت هـەروا فـەرامۆش بکرێـت و نەنوسرێتەوە،چـونکە لەکاتێکـدا هەنـدێك لەجافـەکان و عەشـیرەتەکانی تـر لەگـەڵ شـێخ مـەحمودی نەمرنەبوون و هاوکاری نەبوون و دژایەتیان دەکرد،ئەمانـە وەك تیرەیـەکی جـاف هاوسـۆزی و هاوکاریـان بـۆ خەباتەکـەی شـێخ دەربـڕی و لەناوچـەکانی خۆیانـدا ڕووبەڕووی ئینگلیزەکـان وەسـتانەوە زیانیـان پێگەیانـدن، ئەمـەش لاپەڕەیـەکی زێڕینە بۆ شەمێرانیەکان، وەلەشۆرشی ئەیلول و شۆڕشی نـوێی گەلەکـەمان هـەم وەك ناوچەکەیان و هەم وەك پێشمەرگە خـەباتێکی دیـارو بەرچـاویان هـەبووە و لـەو پێناوەشـدا چـەندان قوربانیـان داوەو خاکەکەشـیان ڕووبـەڕووی کاولکـاری بوەتەوە و گوندەکانیشیان وەك سەرجەم کوندەکانی تـری کوردسـتان لـەکۆتایی حـەفتاکانی سـەدەی بیـستەم دووچـاری ڕاگواسـتن و چـۆڵکردن بوونەتـەوە، لەڕاستیدا لەنووسینەوەی ئـەم توێژینەوەیـەدا خـۆم بـەدوور گرتـووە لەهەنـدێك لایـەنی عەشـیرەت گـەری وەك باسـکردن و پیاهەڵـدان بەشـەڕ و کوشـتار و پیاهەڵـدانی بـێ بنـەماو دوور لەمـەنتقی مێـژووی، ئـەوەی لـەڕابردوودا ڕوویـدا لەشەڕی عەشیرت گەری ئەوە کەوتە نێو زبڵدانی مێژووەوە،بـەلاّم ئـەوەی ئێـستا شـایەنی باسـکردنە عەشـیرەتی شـەمێران پەیوەندیـەکی بـاش و بتـەوی لەگـەڵ سـەرجەم عەشـیرەتەکانی ترداهەیـەو گەیـشتووەتە ئاسـتی ژن و ژنخـوازی و بەهێزبوونی پەیوەندی کۆمەلاّیەتی،ئەمـەش لـەم سـەردەمەی ئێستادا بەتـەواوی ڕەنگی داوەتەوە، ئەوەی شایەنی باسکردنە پێم وایـە ئەمـە یەکـەم توێژینەوەیـە بەم شـێوەیە تائێـستا لەسـەر عەشـیرەتی شـەمێران و گونـدەکانی بەشـێوازێکی ئـەکادیمی نوسـرابێت و میتـۆدی مێـژوویی لەنوسـینەوەیدا بەکارهاتبێت،ئەمـەش بەپشت بەست بەو هەوڵ و مانـدوبوون و گەڕانـەم بـەدوای سەرچـاوەی نوسـراو و پێوست کەدەستم کەوتبێت.

وەك هەموو کارەکانی پێشووترم دەخوازم لەهەموو هەڵە و کەم و کورتیـەکانم ببورن،چونکە ئەم کارە هەروا ئاسان نەهاتووەتـە بـوون بـەڵکو بەرهـەمی هـەوڵو مانـدووبوونی چەندسـاڵێکە و مانـدوو بـونێکی زۆرم چەشـتووە بـەئامادەکردن و نوسـینەوە و رێکخـستنەوەی، هـەوڵم داوە مێتـۆدی مێـژوویی لەنوسـینەوەی ناوەرۆك و پەراوێز و ڕوونکردنەوەکاندا بەکاربهێنم بەرگێکی توێژینەوەی مێژوویی بکـەم بەبەریـدا.لێـرەدا دەمـەوێت ئـەوە بخەمـەڕوو ئـەوەی مـن نوسـیومە لـەم توێژینەوەیـەدا بریتیـە لـەو دەقانـەی لەنێوسەرچـاوەکاندا هـاتووە و پـشتم بەسەرچاوەکان بەستووە،بەلاّم بەشێکی گرنگ ماوەتەوە ئەویش لایەنی مەیدانی توێژینەوەکەیە دەربارەی ژیانی خەڵك و داب و نەریت و ناوی گونـدەکان و چـەند لایـەنێکی دیکـەی مەیدانیەئەمـەش کـاتی زۆری دەویـست،بۆیە دەخـوازم تـەمـەن باقی بێت ئەوەش بکەم یان کەسێکی تر ئەوە بکات،ئەوەی مـن نوسـیومە تـەنها هەر ئەوەشم دەست کەوتووە،دەخوازم لەهەڵەکەم و کورتیەکانم ببورن.

## ناوی شەمێران

وەك ئاشکرایە کاتێك توێـژەر بیـەوێت توێژینەوەیـەك لەسـەر عەشـیرەت یـان ناوچـەیەکی دیـاری کـراو بکـات سـەرەتا پێویـستە ئامـاژە بـەوەبکات نـاوی ئـەو عەشیرەتە یان ئەو ناوچەیە لەچیەوە سەرچاوەی گرتووە و چۆن هاتووەتە بوون و مێژووەکەی بۆ کـەی دەگەڕێتەوە،ئەمـەش لەهـەموو توێژینەوەیـەکی مێژوویـدا پێوستەگرنگی پێبدرێت،ئێمەش سەرەتا دەمانەوێت لەمەوە دەست پـێ بکـەین و ڕاو بۆچـونەکان کۆبکەیـنـەوە و بیخەینەڕوو،سـەبارەت بـەناوی شـەمێران(یـەزدان بەخشی *)وەك هـەموو ناوچـەکانی دیکـەی کوردسـتان کـەناوە بـۆ عەشـیرەتێکی کورد و ناوە بۆ ناوچەیەکی دیاری کراوی ناوچەیی کوردستان ڕاو بۆچونی جیاواز

هەیە،هەندێك لەو بۆچونانە پشتیان بەسەرچاوە بەستوە و هەندێکیان بەزارەکی هاتوون.

وەك زانراوە شەمێران ناوچەیەکی شاخاوی و سەخت و دژوارە،سروشت بەوردەکارییەوە رازاندویەتیەوە،بەوردی هێشتا نەزانراوە بنەمای ئەم ناوە لەچیەوە وەرگیراوە،هۆیەکەشی ئاشکراو مەعلومە ئێمەی کورد و مێژووی میللەتەکەمان مێژووی جوگرافیای ولآتەکەمان لەلایەن دوژمنانەوە نوسراوەتەوە،بابگەڕێیینەوە سەر وشەی شەمێران و لەم ڕووەوە بیرورا زۆرە و ئەم ناوەش ناوی ئەمڕۆ نیەو لەبەر ئەوە دەڤەرەکە ناوچەیەکی گرنگی سەردەمی دەسەلآتی ساسانیەکان بووەتا بەئەمڕۆ ئاسەواری دەسەلآتەکە وەك:ئاگردان،قەلآ،دژ و پرد و ڕێچکە ڕێگەی زۆری تێدایە[1]، سەبارەت بەناوی شەمێرانیش ئەم ڕایانە لەبەردەستن و بەم شێوە لەنێو سەرچاوەکان هاتوون:

**یەکەم:** ڕایەك هەیە کەوا ناوی شەمێران لەناوی «شەك مەیدان»ەوە هاتوە ئەو ناوچەیەش ئێستا لەژێر ئاودایەو نزیك گوندی کانی کەوەو تولەبیەو مەبەست لەناوی شەك مەیدان ئەوە بووە کاتی خۆی مەڕومالآتیان لەو ناوچەیە مۆڵداوە ئەمەش لەژیانی ئاژەڵداریداباوە کەلەکاتی گەرمای نیوەڕواندا ئاژەڵەکان لەسێبەرێکداکۆدەکەنەوە.

**دووەم:** بۆچونێکی تر پێی وایە ناوی شەمێران لەناوی «شەش میران»ەوە هاتوە، ئەمەش پێی وایە لەسەردەمی کۆندا شەش میر لەناوچەکەدا حوکمڕانیان کردووە و لەوەوە ناو نراوە شەشمیران دواتر ناوەکە بووە بەشەمیران و بەدانیشتوانی ناوچەکەش وتراوە شەمێرانی[2] ،هەر سەبارەت بەناوی شەش میران بەڕێز خوسرەوجاف لەکتێبەکەی خۆیدا ئاماژە بەوەدەکات و دەڵێت:شەمێرانیەکان بۆ خۆیان لایان وایە وشەی شەمێران لە(شەش میران)ەوە

هـاتووه و بـووه بەشـەمێران[٣]، هـەر دەربـارەی شـەش مـیران بـەڕێز کـاك حەمەسەعید شەمێرانی دەڵێت:شەمێران لە(شـەش مـیران)ەوە هاتووە،قەڵایـەکی دێرین هەیە لەنێوان شەمێران و تاوگۆزیدا کە تائێـستاش پاشمـاوەی ماوە،گوایـە شەش میری لێبووە ناونراوە شەش میران[٤].

**سێیەم:** رایەکی ترهەیـە کـە پێـی وایـە نـاوی شـەمێران لـەناوی ﴿شـومە﴾وە هـاتوە کـە کەسـێکی ئێرانـی بـوە دواتـر بـە﴿شـومران﴾ناسـراوە وەپاشـتر بـوە بە﴿شەمێران﴾، شوم یان شومران کەسێکی ناودار بوەو هاتوەتە ﴿پشت قەڵا*﴾ کە دەکەوێتە نێوان شەمێران و سەرشاتەی تاوگۆزی لەو قەڵایەدا ژیـاوە ئـەکرێت لەگەڵ کۆمەڵێك کەسدا بوبێت و لەوێدا ژیابیـت چـونکە لەرێگـەی بـەردو قـسڵەوە ناوی بۆ ئـەو قەڵایـە راکێـشاوە ئەمـەش لەمێـژوودا کارێـك بـوە بەتـەنیا کەسـێك ئەنجام نەدراوە بـەڵکو بـەکاری هـەرەوەزی کـراوە.سـەبارەت بـەم قەڵایـە بـەڕێز خوسـرەوجاف دەنوسـێت:قەڵایـەك لـەو دەڤـەرەدا ناسـراوە بەقـەڵای شـەمێران ئاسەواری سەردەمی دەسەڵاتی ئیمپراتۆری ساسانییە[٥].

**چـــوارەم:** رایــەکی تــریش هەیــە کــەپێی وایــە نــاوی شــەمێران لــەناوی گوندی﴿بەشی ئەحمەدبەگ﴾ەوە هاتوە ئەم گوندە یەکـەمین و کـونترین گونـدی ناوچـەکە بـووە، کەسـە بەتەمەنـەکانیش دەڵـێن سـەرەتا بەوناوچـەیە وتـراوە شەمێران،ئەگەر سەیرێکی ژمارەی گوندەکانی ناوچەی شـەمێران بکـەیت ئـەوەت بـۆ دەردەکـەوێت لەجێگـە نـاوی گونـدی (بەشـی ئەحمـەد بـەگ) نـاوی شـەمێران نوسراوە و بەهەمان شـێوەش لەسـەر نەخـشەکاندا هـەر بـەناوی شـەمێران نـاوی تۆمارکار کراوە،بڕوانە ئەو نەخشەیەی لەبەشی وێنەکاندایە، وە هەنـدێك لـەپیاوە بەتەمەنەکان دەڵێن:گوندەکانی تری شەمیران دوای گوندی بەشی ئەحمـەد بـەگ درووست بوون.

**پێنجەم:** بۆچونێکی تر هەیە پێی وایە لەسەردەمێکدا (زێی سیروان) لەنێوان هەردوو دەسەڵاتی عوسمانی و ئێرانیدا سنووری جیاکەرەوە بووە،ئەو ناوچەیە لەچوارچێوەی قەڵەمڕەوی ئێراندا بووە و پێی وتراوە(شیمه از ایران) واتە (دیمەنێك یان وێنەیەك لەئێران*) پاشان ناوەکە گۆڕاوەو بوە بە شەمێران[٦].

**شەشەم:** ڕایەکی تر هەیە پێی وایە ناوی شەمێران دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئاشوریەکان،ئەمەش پاش ئەوەی ناوچەکەیان لەبەردەستدا بوو ئەو ناوچەیەیان ناوناوە ناوچەی(سمور مات) وە (سمیرامیشی) پێ دەڵێن، دواتر ئەم وشەیە بەسەر زمانەوەبووە سەمیرات و پاشان گۆڕانکاریەکی تری بەسەردا هاتوە بووە بەسەمیران و دواینجاریش گۆڕاوە بۆ (شەمێران*)[٧].

**حەوتەم:** هەرسەبارەت بەناوی شەمێران بەڕێز کاك حەمەسەعید سەرۆك عەشیرەتی شەمێران دەڵێت: ناوی شەمێران لە( شامیران)ەوە هاتوە[٨].

**هەشتەم:** ئەوەی شایەنی باسە شەمێرانیەکان سەرەتا بە(یەزدان بەخشی*) ناوبراون،تەنانەت خەڵکی تیرەکە دەڵێن:باپیرە گەورەیان پیاوێکی ژیر و سەلیقەداری سەردەمی خۆی بووە بەناوی( یەزدان بەخش)[٩]،لەمەوە ئەکرێت بڵێین ناوی شەمێران سەرەتا یەزدان بەخشی بووە دواتر بەمرووری زەمەن بووە بەشەمێران.

**نۆیەم:** ڕایەکی دیکە هەیە ئاماژە بەوەدەکات ناوی شەمێران لە(شیمورو) هاتوە،لەساڵی ٢٠٠١ دا (ئایدم) بۆچونیکی خستەڕوو کەدەڵێت: پێدەچێت ناوی شاری (شیمورو)ئەو جیگایەی بەشی ڕۆژهەڵاتی لای شاری دەربەندیخان بیت کەناوچەیەکی شاخاوی سەختەو پێی دەوترێت (شەمێران)[١٠].

لەڕاستیدا دیاری کردنی هەریەك لەو بۆچونانە هەروا کارێکی ئاسان نیە،چونکە بەڵگەیەکی مێژووی گرنگ لەبەردەستدا نیە ئەوە بسەلمێنێت، وە

جگـە لـەوەش سـەرەتا ئەمانـە بەیـەزدان بەخـشی ناسـراون و دواتـر گـۆڕاوە بۆشەمێران واتـە نـاوی شـەمێران لەچـاو (یـەزدان بەخـشی)دا نـوێترە و تەنانـەت لەناوی تیرەی جافەکانیش هەر بەیەزدان بەخشی هاتووە،بەلاّم لەگەلّ ئەوانەشـدا ناکرێت نەتوانرێت یەکێك یان دوان لەو بۆچونانە بەپەسـەند نـەزانرێت دەربـارەی ناوی شەمێران،ئەوەی لەنێو خەلّکی شەمێراندا باوە و لەسەر زارە ئەو بۆچـونەیە کەدەلّێت ناوەکە لەناوی شەش میرانـەوە هاتوە،ئەمەلەلایـەك و لەلایـەکی تـریش ئـەو ڕایـەش پەسـەندە کـەکاتی خـۆی بەبەشـی ئەحمـەد بـەگ وتـراوە شەمێران،چونکە لەسەر نەخشەکانیش هەر بەشەمێران ناوی هاتوە،ئەوەی گرنگە لـە مێـژوو و ئەمرۆشـدا ناوچـەکە بەشـەمێران ناسـراوە و بەخەلّکەکەشـی دەلّـێن شەمێرانی.

## مێژووی ئاوەدان کردنەوەی ناوچەی شەمێران

لەراستیدا دیاریکردنی سالّێك یان ڕووداوێك بۆ ئاوەدانکردنەوەی گونـدێك یـان شارێك هەروا کارێکی ئاسان نیە لەمێژوودا بەتایبەت لەمێژووی نەتـەوەی کـورد و عەشیرەتەکانی کوردا.

ئەمە یەکێکە لـەو گرفتانـەی ڕووبـەڕووی توێـژەر دەبێتـەوە کاتێـك دەیـەوێت باس لـەئاوەدان کردنـەوە و دروسـت بـوونی مێـژووی ناوچـەیەك بکـات، ناوچـەی شەمێرانیش بەهەمان شێوە چـونکە تائێـستا نوسـراوێکی ئـەوتۆ دەربـارەی ئـەو ناوچـەیە و مێـژووی ئـەو ناوچـەیە نیە،ئەوەشـی هەیـە بەسـتراوەتەوە بـەهاتنی جافـەکانی ئێـران بـۆ ئەوناوچـانە، بـەلاّم لەڕاسـتیدا خـودی ناوچـەکە چـەندین شوێنەوار و گۆڕستانی لێیە کە گوزارشتن بۆ مێژووی کۆنی ئاوەدانی ئەو ناوچەیە و کەلەمێژە ئاوەدانە و خەلّکی تێدا ژیـاوە،لێرەدا دەپرسـم ئایـا ئـەو گۆڕسـتان و

شوێنەوارانە هی خەڵکی ناوچەکەیە یان کەسانی تر؟ ئەمەپرسیارێکە وەلامدانەوەی هەروا کارێکی ئاسان نیەو توێژینەوەیەکی باشی دەوێت ئەویش پێویستی بەگەران و پشکنینی شوێنەوارناسان دەبێت تائەنجامێکی باش دەخەنە روو، ئەوەشی هاتووە دەربارەی مێژووی ئاوەدانکردنەی ناوچەی شەمێران چەند رایەکی کەم و ئالۆزە و پێویستی بەپێشبینی و گریمانە دەکات وەك ئەمانەی خوارەوە:

**یەکەم**: مێژووی ئاوەدانکردنەوی ئەو ناوچەیە کۆنە بەحوکمی بوونی چەندین شوێنەوار و پاشماوەی شوێنەواری و بوونی چەند گۆرستانێك لەناوچەکاندا،دیارە ئەمەش مێژووی کۆنی هەیە و نازانرێت بۆ چ سەردەمێك دەگەرێتەوە و سەرەرای ئەوەش گۆرستانی جولەکەی تێدایە ئەمانەش قسە هەڵدەگرن و شایەنی قسە لە سەرکردنن واتە مێژووی ئاوەدانکردنەوەی ناوچەی شەمێران کۆنە.

**دووەم**: بەرێز حەکیم مەلاساڵح لەکتێبەکەیدا باس لەوە دەکات هەندێك لەناوەکانی ئەو ناوچەیە ئاڤێستاین وەك(شەمێران،عارەوان ،وەرمن) کەواتە ئەم ناوە ئاڤێستایانە دەگەرێنەوە بۆ کتێبی ئاڤێستای زەردەشت کەئەمەش مێژوویەکی کۆنی هەیەو دەگەرێتەوە بۆسەردەمی ژیانی زەردەشت لەساڵی(٦٦٠-٥٨٣پ.ز)،دواتر ئەوناچانە کەوتوەتە دەست فارسەکان،وەك ئاشکرایە ژمارەیەك لەخەڵکی کوردستانی باشور لەسەدەی پێنجەمی زاینیدا ئاینی مەسیحیان وەرگرتووە،بەلام پاش ماوەیەکی کەم لەژێردەستی،سەردارێکی ئێرانی بەناوی (پاو*) کەبەفەرمانی (یەزگوردی)کیسرای فارس نێردراوەتە ناوچەکە زۆربەی خەڵکانی کوردستانی بەگشتی و شارەزووری بەتایبەتی گەراندۆتەوە سەرئاینی زەردەشتی، (پاو) ماویەك لەشەمێراندا ماوەتەوە،ئەوەش بەلگەیەکی ترە کە ئەوکاتە ئەو ناوچەیە ئاوەدان بووە[11]،ناوچەی شەمێران

یەکێك بوە لەوناوچانەی کەبەدرێژایی مێژوو لەسەر بیروباوەڕی زەردەشتی بوون و خۆر و ئاگریان پەرستوە و هەتاوەکو سەرهەڵدانی ئاینی ئیسلام لەسەر ئەو بیروباوەڕەی خۆیان مابوونەوە[12]،ئەمەش شتێکی ئاسایەو زۆربەی گەلانی خۆرهەلاتی ناوەراست پەیڕەوی ئاینی جۆراوجۆریان کردوە تاو ئەو کاتەی ئاینی ئیسلام گەیشتووەتە ناوچەکە و سەردەمی ئاینەکانی دیکە بەرەو لەناوچوون ڕۆیشتوون.

**سێیەم**:تیرەی (یەزدان بەخشی)کەزۆر جار بە(شەمێرانی)ناو دەبرێن و بەشێکن لە(ئێلی مورادی)، ماوەیەکی زۆر لەکۆچ و کۆچباردا بوون بەلاّم پاش شەڕی(حسەین شەهید* )لەسەر ئاوی( شلێر) لەنێوان (ئێلی مورادی)و ئەو تیرە و خێلاّنە ڕوویداوە ئەو کات لەشارەزووردا ژیاون و پێش (ئێلی مورادی)هاتوونەتە ناوچەکەوە[13] بۆدرێژەی ئەو ڕووداوە بەڕێز سەرۆك عەشیرەتی شەمیران کاك حەمە سەعید دەڵێت:عەشیرەتی یەزدان بەخشی تیرەیەکی جافە و ولەسەردەمی حەمەپاشای جافدا لەنزیك پێنجوێن شەرێکی گەورە لەنێوان جاف و گەڵباخی ڕوودەدات،گەڵباخیەکان لوتکەی شاخی قەلاّی کچێ دەگرن و ئیتر بالاّدەست دەبن بەسەر جافەکاندا ،بۆیە حەمە پاشای جاف دەڵێت: هەرکەس ئەو شاخەم بۆ بگرێت خەلاّتی دەکەم،ئەوکات سەرۆکی عەشیرەتی یەزدان بەخشی ناوی (وەسمانی خالّە)دەبێت، ئەویش ڕاوێژ بەخزمان و ناودارانی عەشیرەتەکەی دەکات و بڕیار دەدەن قەلاّکە بگرن،سەرئەنجام هێرشی بۆدەکەن و قەلاّکە دەگرنەوە،بەمەش جاف سەرکەوتن بەدەست دێنێت،حەمە پاشای جاف بەوەسمانی خالە دەڵێت: چیت دەوێ بتدەمێ؟ئەویش داوای ناوچەی شەمێران دەکات بۆئەوەی واز لەکۆچەری بهێنن،ئەویش ڕازی دەبێت و ئیتر لەوکاتەوە شەمیرانیەکان لەوێدا نیشتەجێ بوون[14]،

لێرەوە یەزدان بەخشیەکان وازیان لەژیانی کۆچەرییەتی و ڕەشماڵنشینی هێناوە و لەناوچەی شەمێراندا بەڕەزامەندی (پاشای جاف) نیشتەجێ بوون و بەرەبەرە ئەم گوندانەیان دروست کردووە کەبریتین لە(ولۆەر،دەنگەوەرە،وەرمن،چەمەڕەش،مامەشەوی،عارەبان،کانی کەوە،بەشی ئەحمەد بەگ،تولەبی،بەشی پیرك،دولی ناوحەد)[١٥]، لەڕاستیدا بەڕای ئێمە ئەم ڕایە نزیکە لەڕاستیەوە چونکە شەمیرانیەکان جافن و لەنزیك ئەو رووداوەدا هاتونەتە ناوچەکەو نیشتەجێ بوون و وەسەرەتای ئاوەدان کردنەوەی ناوچەی شەمێران لەلایەن شەمێرانیەکانەوە دەگەڕسێتەوە بۆ ئەم سەردەمە.

**چوارەم**: هەندێك لەنوسەران مێژووی ئاوەدانی هەندێك لەگوندەکان دەگێڕنەوە بۆ پێش هاتنی ئاینی ئیسلام، ئەوەتا گوندی(عارەوان )کەیەکێکە لەگوندەکانی ناوچەی شەمێران کەمێژووی ئاوەدان بونەوەی زۆر کۆنەو مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ پێش هاتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام[١٦]،بەلام ئەوەی جێگەی پرسیارە لێرەدا ئەوەیە کە ئایا پێشتر شەمێرانیەکان لەم گوندەدا بوون و ئاوەدانیان کردوەتەوە یان کەسانی دیکە ئەمەیان کردووە ئەمەش پێوستی بەتوێژینەوەی ورد هەیە تابگەین بەڕاستی چونکە لەدوای ڕووخانی (دەوڵەت ماد)ەوە کورد ژێردەستە بوەو هەمیشە لەکۆچ و باردا بوە و لەژێردەستی داگیرکەرانیدا توشی ماڵوێرانی ڕاگواستن بووە،ئەوەتا تائەم سەردەمەی ئێستاش ئەو بستە خاکەی کە کورد هەیەتی لەلایەن داگیرکران و دراوسێ کانیەوە پێی ڕەوانابینرێت.

**پێنجەم**:ئەگەر ئاوەدانکردنەوەی ناوچەکانی شارەزوورو دەوروبەری بەستینەوە بەهاتنی جافەکانی ئێران بۆئەم ناوچانە ئەوا پێمان وایە ئەم هاتنە لەنیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەی زاینیدابووە ،بەمەش پێدەچێت ئەو ناوچانە

لەسـەدەی هـەژدەی زاینیـدا ئاوەدانکرابێتنەوە،ئەمـەش پەیوەسـتە بـەهاتنی (زاهیربەگ)ی جافـەوە لەسـاڵی ١٧٣٧ بۆناوچـەکانی ژێردەسـەڵاتی بابانـەکان[١٧] چونکە بەگزادەکانی جاف تاساڵی ١٧١٨ خاوەن دەسەڵاتی خۆیان بوون بەسـەر ناوچـە هۆزەکـانی خۆیانەوە،بـەڵام دواتـر نـاکۆکی کەوتـە نێـوان ئـەوان و ئەردەڵانیـەکان و دواتـر ئەردەڵانیـەکان هێزێکـی باشـیان ئامـادەکردو سـەرۆکی جافـەکانیان کوشـت و کوڕەکـەی و براکەشـیان کوشـت،ئەمەش بویـە هـۆی کۆچـکردنی ژمارەیـەکی زۆر لەسـەرۆك و خێزانـەکانی هـۆزی جـاف لەناوچـەی (جوانڕۆ)و پەنایان برد بۆلای میرانی بابان لەقەڵاچۆلان و بەرەو ڕۆژئاواو ڕووبـاری سـیروان کـشان،بەمەش دەرکـەوتنی مێـژووی هـۆزی جـاف دەگەڕێتـەوە بـۆ کۆچکردنی زاهیربەگ کە زیاتر لە سەد دەوار نشینی لەگەڵدابوو[١٨].

لەڕاستیدا پێم وایە ئەگەر ئاوەدان کردنەوەی ناوچەکان ببەستینەوە بەهاتن و کۆچـی جافەکانەوەلەڕۆژهـەڵاتی کوردسـتانەوە بـۆ باشـوری کوردسـتان ئـەوا بەشێوەیەکی گشتی دەتـوانین بڵێین ناوچـەی شـەمێران ودەوروبـەری لـەنیوەی یەکـەمی سـەدەی هەژدەیـەم ئـاوەدان کراوەتـەوە و تائـەمڕۆش بـەئاوەدانی ماوەتەوە.

## سنوری جوگرافی ناوچەی شەمێران

ئەگـەر بگەڕێنـەوە بـۆ مێـژوو سـەبارەت بـە دەسـت نیـشانکردنی سـنوری ناوچەکان ئەوە کارێکی ئاسان نەبوە لەو سەروەختانەدا بەتایبەت سنوری هـۆزو خێڵەکان کەهەریەکەیان ناوچـەیەکیان بۆخۆیـان قـۆرغ کردبوو،چـونکە ئاشـکرایە سنوری هۆز و تیرەکان تاڕادەیەك نادیارن، ئەمەش پەیوەسـت بـووە بەفاکتـەری سیاسی و هەم فاکتەری کۆمەڵایەتی و خێڵەکی کەبەردەوام کێشەی لەسەر بـووە

بەردەوام بەهۆی هێرشەکانەوە لەزیاد و کەم بوونەوەدا بوو لەو سەردەم و قۆناغەدا، ناوچەی شەمێرانیش بەهەمان شێوە و دیاری کردنی سنوورەکەی هەروا کارێکی ئاسان نەبووە ئەمەش بەهۆی کەمی سەرچاوەی مێژووی لەو بارەیەوە و وەدژواری و سەختی ناوچەکەش لەلایەکی تر،بەلاٌم ئەمەش ناکاتە ئەوەی ئێمە بەتەوای دەستەوسان بوەستین و نەتوانین سنوری ناوچەکە دیاری کەین،بۆیە دەشێت بلێین سنوری ناوچەی شەمێران وەك خاك و ناوچە بەشێکە لەخاکی کوردستان و دەکەوێتە بەشی باشوری رۆژ هەلاٌتی باشوری کوردستان و لەرووی پارێزگاوە سەر بەپارێزگای سلێمانیە و لەرووی قەزاشەوە سەر بەقەزای دەربەندیخانە،ئەم سنورەش گرنگی و بایەخی تایبەتی خۆی هەیە لەبەر ئەوەی ئەم ناوچەیە سنورێکی زۆری بەئاو دەور دراوە بەشێکی زۆریشی بەدارو درەختی جوان و ڕازاوە دەور دراوە و لەهەردوو بارەکەشدا دیمەنێکی جوان و ڕازاوەی بەخشیوەتە ناوچەکە و کردوویەتی بەسەیرانگەی گونجاو.

سەبارەت بەسنوری جوگرافی ئەم ناوچەیە دەکرێت ئەوە بلێین بەشێوەیەکی گشتی سنوری ئەم ناوچەیە دەکەوێتەخۆرهەلاٌتی (دەریاچەی دەربەندیخان *)و باشوری خۆرئاوای شاری هەڵەبجە[19].

* ئەم عەشیرەتەسنوری جوگرافیایان لەنێوان ناوچەی (شەمێران و هەڵەبجە) هەن،هەندێکیشیان لەدیوی ئێرانن بۆنمونە لە ڕەوانسەر و مەریوان هەن[20]،سنووری شەمێران لەباکورەوە (زێی سیروان) و لەخۆرئاوا و باشوریەوە شاخی (بەمۆ) و لەخۆرهەلاٌتیەوە سنوری دەوڵەتی (عیراقە بەئێرانە)وە،بەمەش ناوچەکەش بەگشتی هەرلەنزیك گوندی( نێرگزەجاڕ)ەوە هەتاوەکو سەربەنداوی دەربەندیخان دەگرێتەوە[21] بەشێوەیەکی گشتی سنووری ئەم ناوچەیەش بەردەلاٌن و شاخاوییە و زەوی کشتوکاڵی کەمە، زۆربەی زەوییە تەخت و

کـــشتوکاڵیەکانی ناوچــــەکە کـــاتی خـــۆی کەوتوەتــــە ژێـــر دەریاچــــەی دەربەندیخانەوە،وەکشتوکاڵیش بەزۆری لەناوچـەوگوندەکانی(کـانی کەوە،بەشـی ئەحمەد بەگ،تولەبی)دەکرێت[٢٢].

هەروەها ناوچەی شەمێران دەکەوێتە ڕۆژهەلآتی بەستی دەربەندیخان[٢٣]، ئەم بەستە لەتەنگەبەری دەربەندیخان لەسەر ڕووباری دیالە دروست کـراوە,لەبەسـتە بەردینەکانە لەنزیك تێکەڵکردنەوەی هەردوو لقـە ڕووبـاری دیالـە،ئاوی سـیروان و ئاوی تانجەرۆ. ڕووبەری ئەستێڵك و گۆمی خۆراکدانی بەنداوەکە(١٧٨٥٠کم$^2$) یـەو بەرزیەکـەی ١٢٨م و درێژیەکـەی ٥٢٥مـەترە. بەسـتەکە لەچـەند دەرگایـەك پێـك هاتووە کە بۆمەبەستی ئاودێری و بەرهەم هێنانی وزەی کارەبـا بەکاردێن،بـەرزی هـەر یەکـەیان ١٥مـەتر و پانیـان ١٥مـەتر و لەتواناياندایـە لـە ٤٩٣مـەتری ڕووی دەریـاوە ١١٤٠٠م$^3$\چـرکە ئـاو تێپـەڕ بکـەن، هـەروەها توانـای بەرهـەم هێنـانی ١١٢٥٠٠کیلۆوات\کاتژمێر کارەبایان هەیە،بەنداوەکە ٣ملیار م$^3$ئاو دەگرێت و بـڕی ئــەو نیــشتوانەی ڕووبارەکــە دەیهــێنێ دەگاتــە ٧٠٠تــۆنی مــەتری بــۆ هــەر کیلۆمەترێکی چوارگۆشە.زەوی بەرفراوان لەپارێزگاکانی دیالە و سلێمانی بەئاوی بەنداوەکە ئـاو دەدرێـن و ئاوەکـە بۆچـەندین مەبەسـتی دیکـە بـەکار دەهێنرێـت[٢٤]،ناوچەی شەمێران سنورێکی زۆری بەئاوی ئـەم بەنـداوە دەور دراوە ئەمـەش لـەباکوری ڕۆژهەلاتیەوەلـە گونـدی دڵـف وبەشـی پیرکـەوە دەسـت پێـدەکات و تەنانــەت گونـدەکانی عـارەوان و مامەشــی وچــەمەڕەش دەخاتــە ژێرئـاوەوەو لەوێـشەوە درێــژ دەبێتــەوە تابەنـداوی دەربەنـدیخان لـەنزیك گونـدی زمنـاکۆ ئەمەلەلایەك،لەلایەکی تر ناوچەیەکی زۆری بەشاخ و بـەرزایی دەوردراوە ئەمـەش بەشاخی زەواڵی دەست پێدەکات و درێژ دەبێتەوە لەباکوری ڕۆژهەت و باشـوری ڕۆژهەلآتیەوە تاشاخی زمناکۆ لەڕۆژئاوایەوە، ئـەوەی گرنگـە بوترێـت وەك چـۆن

بەشێکی خاکی ئەم ناوچەیە کەوتوەتە ژێر ئاوەوە بەهۆی دروست کردنی (بەربەستی دەربەندیخان*)ەوە بەهەمان شێوە و بگرە زۆر بەخراپتر بەشێکی زۆری سنوری ئەم ناوچەیە لوغم ڕێژ کراوە ئەمەش نەك تەنیا زیانی بەبەشێکی زۆری خاکەکەی گەیاندوە کەبەکەڵکی ئەوە نایەت بکرێت بەکشتوکاڵ بەهۆی زۆری ڕێژەی مینەوە،لەهەمان کاتدا زیانێکی زۆریشی بەدانیشتوانی ناوچەکە گەیاندووە و چەندان کەسی کردوە بەقوربانی و چەندان کەسی تریشی کەم ئەندام کردوە.

## ژمارەی گوندەکانی شەمێران

سەبارەت بە ژمارەی گوندەکانی شەمێران لەسەرچاوەکادا ڕاو بۆچونی جیاواز بەرچاو دەکەوێت لەهەریەکەیاندا ناوی ژمارەیەك گوند هەیە،هەندێك ژمارەی گوندەکان بەدوازدە گوندو هەندێکی دیکە بەهەشت و هەندێکی دیکە بەچواردە گوند ئەژماری دەکەن و لەگەڵ ئەوانەشدا لەسەر نەخشەی پارێزگای سلێمانیدا بە نۆ گوند ناویان نوسراوە وەك(وڵوەر،دەنگەوەرە، کۆکۆی، چەمەڕەش، کانی کەوە،شەمێران، توڵەبی، دڵف، بەشی پیرك)،ئەم جیاوازیانەش دەکرێت بەهۆی ناوەکانیان بووبێت کەهەندێك گوند ناوی جیاوازی هەبێت ،یان هەندێك گوندیان ژمارەیەکی کەم ماڵی تیابووە قورسایی ئەوەی نەبووە لەسەر نەخشەناوی تۆماربکرێت یان بەهۆی ئەوەی هەندێك گوندیان بووبن بەژێرئاوەوە گوندەکە نەماوە وائێستا ژمارەی ناوەکانیان جیاوزن و تەنانەت لەهەندێك لەسەرچاوەکاندا مانای ناوی هەندێك لەگوندەکان هاتووە ڕاوبۆچونی جیاوازی لەسەرە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو واتا دەماودەمییە لەخەڵکەوە هاتوە.

بەهەر حاڵ لێرەدا بەڕیز ناوی گوندەکانی شەمێران دەنوسین و دەیانخەینە ڕوو، سەبارەت بە ژمارەی گوندەکانی شەمێران بەڕێز حەمەسەعید سەرۆك عەشیرەتی شەمێران ژمارەی گوندەکانی شەمیران بەچواردە گوند ناودەبات بەم شێوەیە(وڵوەر ، زمناکۆ ، دەنگەوەر ، کۆکۆیی ، ، دۆڵی ناوحەد ، کانی کەوە ، (وەرمن*) ، بەشی ئەحمەدبەگ ، تووڵەبی ، (دڵفی سەروو ، دڵفی خواروو)، بەشی پیرك ،((عارەوان*)،چەمەڕەش، مامەشەهید*))[٢٥]،وەکەسایەتیەکی وەك (ئێدمۆنز) ژمارەی گوندەکانی شەمێرانی دیاری کردوە و نوسیویەتی لەشەش گونددا نیشتەجێن و ئەیوب ڕۆستەم ئەم ژمارەیەی ئێدمۆنزی ڕاست کردوەتوە و دەڵێت: ژمارەی گوندەکان دوازدە گوندن دیسان ئەمیش کەوتوەتەوە هەڵەوە کە بەم ژمارەیە ناویان دەهێنێت[٢٦]، د.عەبدولاّ غەفور لەبەرگی دووەمی کتێبی گوندەکانی کوردستان لەباسی قەزای هەڵەبجە، بەم شێوەیە ناوی گوندەکان و ژمارەی دانیشتوانیانی دەهێنێت و پێی وایە تەنها یازدە گوندن وەك:((بەستی پیرك (بەشی پیرك)) ١٧٠کەس، ((تولەبی(تۆڵەبی)٢٨٥کەس، (شمیران(شەمێران)٢٨٨کەس،(کانی کەوە)٣٢٧کەس،((دولی ناوحد)٤٠کەس،((ولوەر(وڵوەر)١٨٧کەس،(دلف)دلفی سەروو٤٧کەس و دلفی خواروو٦٢کەس)،(کوکوی شمیران)کۆکۆیی شەمێران)٢٦١کەس،((دەنکروەرە(دەنگەوەرە)٩٠کەس،((زمناکو(زمناکۆ)٢١٢کەس،((وەرمن)١٦٦کەس،ئەوانە ژمارەی دانیشتوانی گوندەکانن بەپێی سەرژمێری دانیشتوانی عیراقی ساڵی ١٩٧٧)[٢٧]،وەلەلایەکی تر حەکیمی مەلاساڵح لەکتێبەکەیدا(هەڵەبجە لەئامێزی مێژوودا) تەنها ناوی چواردە گوندی هێناوە بەڕای ئەو واتە تەنیا ئەوچواردە گوندە ناویان هەبووە،وەدەڵێت بەرلەوەی ئەمانەبێنە ناوچەکە گوندەکانی(دڵف،وەرمن،پشت قەلاّ)ئاوەدان بوون[٢٨].

هەروەها شەوكەتی حاجی مشیر لەكتێبەكەیدا ئەویش سەبارەت بەژمارەی گوندەكانی شەمێران تەنها ناوی سیازدە گوند دەهێنێت و دەڵێت: هەموو ئەمانە سەربەعەشیرەتی جافن[٢٩].

هەروەها مەحمودعەزیز لەكتێبی(مێژووی هۆزی جاف و ژیانی تیرەكانی)دەنوسێت:(هۆزی یەزدان بەخشی،لەو (٨)گوندە سێگۆشەیەی شەمێراندا نیشتەجێن لەبەش و ڕەگەزی ((جافی مورادین*))[٣٠]،ئەگەر نوسەر مەبەستی لەو ژمارەیە ئەوەبێت گوندەكانی شەمێران تەنها ئەو هەشت گوندەن ئەوا كەوتوەتە هەڵەوە،چونكە ژمارەی گوندەكانی شەمێران لەوە زیاترە.

هەر سەبارەت بە ژمارەی گوندەكانی عەشیرەتی شەمێران،عباس العزاوی المحامی لەكتێبی(موسوعه عشائر العراق) ناوی یازدە گوندی هێناوە وەك:(كانی كەوە ،شەمێران ، توڵەبی ،دڵف ،چەمەڕەش ،وڵوەر ،(وزمان*) ،زمناكۆ ،شەك مەیدان ،بەشی پیرك،((كیوی كینم*))[٣١] لەهەمان كاتدا ئەم نوسەرە سەبارەت بە كۆی ماڵەكانی گوندەكانی شەمێرانی سەر بەناوچەی هەڵەبجە دەڵێت: ژمارەیان نزیكەی (١٠٠٠) ماڵێك دەبێت،[٣٢] .

هەروەها ئەحمەد حسێن محەمەد سەبارەت بەژمارەی گوندەكانی شەمێران دەنوسێت:ژمارەی دیهاتەكانی شەمێران یازدە دێ بووە بەم شێوەیەش ناویان دەبات و باسیان دەكات((یەكەم:كانی كەوە" كەزۆربەی هۆزی خاڵە لەم دێیە دانیشتوون و دێیەكی ئاوداری خۆشە و زەویەكەی تەختانیە. دووەم:بەشی ئەحمەدبەگ" دێیەكی ئاودارە و زەویەكەی لێژە و بەڵام زەوی دەشتای هەیە بۆكشتوكاڵ.سێیەم:توڵەبی"ئەم دێیە ئاوی كەمە بەڵام زەوی تەختانی بۆكشتوكاڵی زستانە زۆرە و هەندێك بەراوی هەیە بۆ كشتكاڵی هاوینە.چوارەم :چەمەڕەش"كەدێیەكی بەواریدات بوو بۆكشتوكاڵ زۆر چاك

بوو.پێنجەم:عارەبان"ئەم گوندە لەسەر ڕووباری سیروان بوو بەڵام زیاتر بۆ کشتوکاڵ لەڕووباری تانجەرۆ کەڵکیان وەر ئەگرت چونکە جۆگەیان لەو ڕووبارە بۆ هەڵئەگیرا بەئاسانی بۆسەر زەوی کشتوکاڵ.شەشەم:مامەشەهید"ئاوی کەم بوو بۆکشتوکاڵ هەرچەندە نزیکی ڕووباری سیروان بوو بەڵام ڕێڕەوی ڕووبارەکە زۆر نزم بوو ئاویان بۆ سەر نەئەخرا بۆ سەر زەوی کشتوکاڵیان،ئەوان زیاتر کشتوکاڵی دانەوێڵەیان ئەکرد ئەوەی زیاتر پشت بەئاوی باران دەبەستێت.

حەوتەم: بەشی پیرك"ئەم دێیەش هەر لەسەر ڕووباری سیروان بوو بەڵام لەبەر نزمی ڕێڕەوی ڕووبارەکە و نەبوونی هۆی سەرخستنی ئاو وەك (مەنزەخە) پەمپ زۆر کەڵکیان لەڕووبارەکە وەر نەئەگرت بۆ مەبەستی کشتوکاڵی.هەشتەم:دلف"دێیەکی ئاودار بوو کشتوکاڵی هاوینەیان لێئەکردلەپاڵ کشتوکاڵی زستانەدا،چەندماڵێك بوون و دانیشتوانی زۆر نەبوو.نۆیەم:بەشی هاجە"دانیشتوانی ئەم گوندە دووسێ ماڵێك ئەبوون دێیەکی ئاودار بوو کشتوکاڵی هاوینەیان لێ ئەکرد لەپاڵ کشتوکاڵی زستانەدا.دەیەم:وەرمن"ئەمانیش چەند ماڵێك ئەبوون لەدامێنی چیای زەواڵیدا بەشی خۆیان کشتوکاڵیان هەبوو.یازدەیەم: دەنگەوەرە"ئەمانیش چەند ماڵێکی کەم بوون ژیانیان بەکشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕوماڵات دابین ئەکرد.دوازدەیەم:کۆکۆیی" ئەم دێیە ئاوی کشتوکاڵیا کەم بوو بۆ دابینکردنی ژیانیان پشتیان بە چاندنی دانەوێڵە و بەخێوکردنی مەڕوماڵات ئەبەست. سیازدەیەم:ولۆەر"ئاوی کشتوکاڵیان هەبوو لەبەر ئەوە کشتوکاڵی هاوینەیان ئەکردلەپاڵ کشتوکاڵی زستانەدا.چواردەیەم:دۆڵی ناوحەد"ئەمانە دووسێ ماڵێك ئەبوون زیاتر بۆ بژێوی ژیانی خۆیان پشتیا بە بەخێوکردنی مەڕوماڵات و کشتوکاڵی زستانە ئەبەست چونکە ئاویان کەم بوو. پازدەیەم:زمناکۆ"ئەمانە

بەقەد پاڵێکی سەختەوەن ئاویان هەیە بەڵام چونکە شاخاوییە کشتوکاڵیان زۆر نیە لەبەر ئەوە جێکەی تەختانی کەمە باخ و باخاتیان هەیە,زۆرتر خەریکی بەخێوکردنی مەڕوماڵاتن.

بەڵام بەداخەوە پاش تەواو بوونی سەدی دەربەندیخان ئاوی ڕووباری سیروان بەربەست کراو بووبەدەریاچە و شەش دێی بەپیتی شەمێران ئاو دایپۆشین[٢٣]،

هاوکات لەگەڵ ئەم دەقانەشدا کەلەسەرچاوەکاندا هاتوون ئەگەر بەوردی سەرنجێك بدەی لەو نەخشەی گوندەکانی شەمێران ئەوا بەڕوونی ئەوەت بۆ دەردەکەوێت کەناوی ئەم دوازدە گوندە تۆمارکراوە لەسەر نەخشەکە بەم شێوەیە(زمناکۆ،ولوەر،دەنگەوەرە،کۆکۆیی،وەرمن،شەمێران،کانی کەوە،تولەبی،دۆڵی ناوحەد،چەمەڕەش،دلف،بەشی پیرك)لەڕاستیدا پێم وایە هەندێك لەو نوسەرانە سەبارەت بەژمارەی گوندەکانی شەمێران کەوتونەتە هەڵەوە ئەمەش لەبەر ئەوەبوە ئەوانە هەر لەدوورەوە لەسەر گوندەکانی شەمێرانیان نوسیوە و ژمارەی ماڵەکانیان هێناوە یان بەهەڵە ناوی هەندێك گوندیان تۆمارکردبێت یان بەهەڵە ناوی گوندەکەیان پێ وترابێت ئەگەر بڕوانیتە ناوەکان ئەم ڕاستیەت بۆ دەردەکەوێت،یان بەپێی زانیاری سەرنەخشەکان تەنها ناوی ئەوگوندانەیان نوسیوە کەلەسەر نەخشەکەدا بوونی هەبووە،بۆیە پێم وایە ژمارەی گوندەکان چواردە گوندن،بوڵام ئەوەی ئێستا لەسەر ئەرزی واقیع بوونی هەیە بریتن لەدوازدە گوند وەك(زمناکۆ،ولوەر،دەنگەوەرە،کۆکۆیی،وەرمن،بەشی ئەحمەدبەگ(شەمێران)،دلف،بەشی پیرگ،تولەبی،کانی کەوە،دۆڵی ناوحەد،ئیمامیزامن)،ئەمەش بەپێی ئەوناوانەی لەسەرچاوەکاندا هاتوون،چونکە گوندی مامەشەوی و چەمەڕەش کەوتونەتە ژێرئاوەوە و لەبری گوندی

عـارەوانیش گونـدی ئیمـامیزان ئـاوەدان کراوەتـەوە. لێـرەدا نـاوی هەنـدێك لەگوندەکانی شەمێران دەخەینەڕوو وەك ئەوەی لەسەرچاوەکاندا هاتووە وەك:

یەکەم: زمناکۆ: ئەم گوندە دەکەوێتە قەدپاڵی شـاخی زمنـاکۆ بەمـەش نـاوی گوندەکـە هەربـەناوی ئـەو شـاخە خۆیـەوە ناونراوە،سـەبارەت بـەناوی زمنـاکۆ لەبنەڕەتدا وشەکە لە(سامناك هۆ) وە هاتووە ئەمەش بەمانای شـاخی ترسـناك ، بەپێی ڕۆژگـاریش ناوەکـە گـۆڕانی بەسـەرداهاتووە و بووەبـە (زمنـاکۆ) نوسـەری تەفسیری قورئانی پیرۆزی زمناکۆ (مامۆسـتا مەلاسـەعیدی زمنـاکۆ)خـەڵکی ئـەم گوندە بووە[٢٤].

دووەم:دەنگەورە: سەبارەت بەناوی ئەم گوندەش دوو بۆچوون هەیە:

یەکەمیان"ئاماژە بـەوە کـراوە کەئـەم گونـدە لەکۆنتروپێشوتردا لەیـەکێك لەتەنگەبەریەکانی ڕووی سەرەوەی گوندەکەبوە و دواتر گوندەکـە گوازراوەتـەوە بۆ ئەم جێگایەی ئێستایان تـاوەکو نزیـك تـربن لـەو ڕێگایـەی کەبەناوچـەکەیاندا براوە دواتر وشەی(تەنگەبەر)یش بەپێی ڕۆژگار بووە بەم ناوەی ئێستای.

دووەمیان"هەنـدێ کەسـی تـری گوندەکـەو ناوچـەکە ئامـاژە بـەوە دەکـەن لەکۆندا کوێخای گوندەکەیان دەنگی بەرزبوە و بەمەش پێیان وتووە (دەنگەورە) و ناوی گوندەکەش لەمەوە ناونراوە[٣٥]،

سێیەم: کۆکۆی: ئـەم گونـدە کەوتوەتـە ناوسـنوری شـەمێرانەوە،ناوی ئـەم گوندە ئاڵوگۆر کراوە ناوی (کو وەکوهی)یەکەبەمانی ئەوەی تیرەیـەکی کۆچـەری بـوون و ئـەم کێـو ئـەوکێویان کردووەبەکۆمـەڵ کۆمەڵ،گوندەکەشـیان ئـاوەدان کردوەتەوەهەربەناوی تیرەکەیانەوەناویان لێناوە،چونکە ئـەم گونـدە دەچێتەوە سەرتیرەی (کۆکۆی)لای دەشتی زەهاو، لەدوو کەسـایەتی دیـاری ئـەم کوندەش

هەردوو نوسەر(مەلامەحمودی کۆکۆی و ئەلی محمد بەگ)بوون[٣٦]،سنوری ئەم گوندەش لەنێوان هەردوو گوندی دەگەوەرە و وەرمندایە.

چوارەم: وەرمن– وەرەمن:بەپێی وتەی دانیشتوان و خەڵکی گوندەکە باسیان لەوە کرد کەلەکۆندا ئەوکەسەی گوندەکەی ئاوەدان کردوەتەوە رێگەی داوە بەهەموو کەسێك کەلەئاواییەکەدا نیشتەجێ ببێت و بەهەموو دەورو بەرەکەی وتوە (وەرنەلای من)دواتر ئەم شێوازە وتنە کورت کراوەتەوە بۆ(وەرەمن)و ناوی گوندەکەش بەو ناوەوە ناوی لێنراوە و ناسراوە[٣٧]،بەلآم ئەم گوندە لەئێستادا بە (وەرمن) ناو دەبرێت و گوندەکەش کەوتوەتە بناری شاخی( زەواڵی[٣٨])و لەنێوان هەردووگوندی کۆکۆی و بەشی ئەحەمد بەگدایە.

پێنجەم:چەمەڕەش: ئەم گوندە کەوتوەتە سەر رۆخی دەریاچەی دەربەندیخان ،سەبارەت بەناوی گوندەکەش دەوترێت لەناوی ئەو چەمە قوڵەی بەردەم گوندەکە وە ناونراوە کەلەبەر قوڵیەکەی مەیلە و ڕەش و سەوزێکی تۆخ دەڕوانێ و لەو چەمەشەوە ناوی گوندەکە ناونراوە[٣٩]،چەمەڕەش،بەلآم بەهۆی دروست کردنی بەنداوی دەربەندیخان زەوی زاری ئەم گوندە کەوتوەتە ژێراوی بەنداوەکەوە.

شەشەم: کانی کەوە:سەبارەت بەناوی ئەم گوندەش لەبنەڕەتدا لەناوی(کانی+کە)ەوە هاتوە، پێش ئەوەی ئەم گوندە ئاوەدان بکرێتەوە بەم کانیە وتراوە(کانی کەو)واتە کانیەك کە کەو هاتوە ئاوی لێخواردوەتەوە،کاتێك گوندەکە لەسەر کانیەکە ئاوەدان کراوەتەوە بەو ناوەوە ناسراوە،هاوکات لەگەڵ ئەمەشدا بۆچونێکی دیکە هەیە کەباس لەوە دەکات کە گوایە کانیەکەی ئەم گوندە رەنگی (شین)ەولەکۆنیشدا بەڕنگی شین وتراوە(کەوە)و بۆیە بەو کانیە وتراوە (کانی کەوە)[٤٠]،

حەوتـەم:تولـەبی:سـەبارەت بـەناوی ئـەم گونـدەش لـەناوەی تـووڵی جـۆری درەختی (بی)ەوە هاتووە،بـەلاّم ڕوون نیـە کـەئایا هۆکـاری ئـەم نـاوە لەچیەوە سەرچاوەی گرتووە،بەلاّم بەبۆچونی نوسـەری کتێبـی (دەربەنـدیخان لەمێـژوودا) پێدەچێت تـەنها ئـەوە بوبێـت کەلەکۆنـدا ئـەم گونـدە لەدروسـتکردنی دەرمـانی کوردەواریـدا ناوبانگیـان هـەبوەو زۆرێـك لـەو دەرمانانـە کەبـەکاریان هێنـاوە بـۆ نەخۆشـیەکان گ١وگیـاو ڕوەك و درەختــەکان بـووە ،یـەکێك لـەو دەرمانانــەی کەلەکۆندا لەم گوندەدا بۆ کەم خـوێنی بـەکاریان هێنـاوە بریتـی بـووە لـە (پـەلی درەختی بی)کە دەورێکی بالاّی هەبووە بۆ ئـەو جـۆرە نەخۆشـیە،ڕەنگە لـەناوێك لەناوەکاندا ناوی درەختەکە ناوی گوندەکەشی دابڕیبێت[٤١]،

بەشـێوەیەکی گـشتی ئەمانـە واتـای نـاوی هەنـدێك لـەو گوندانـەی ناوچـەی شەمێران بوون کەلەسەرچـاوەکاندا هـاتووە ئـەکرێت ڕاسـت بێـت و وەئەشـکرێت تەمومـژاوی بێـت و دوربێـت لـەناوەی تـەواوی گوندەکـە بـەلاّم ئەمـەش ەکرێـت پێوستی بەگەران و توێژینەوەی دیکە هەبێت بۆ سەلماندنی ڕاستی ناوی تـەواوی گوندەکان،

بەشێوەیەکی گـشتی خـەڵکی گونـدەکانی شـەمێران لـەکاتی خۆیـدا ژیـانێکی سـادە و سـاکاریان هەئبووە،سەرچـاوەی بـژێوی دانیـشتوانی گونـدەکان بریتـی بووەلە(ئاژەڵداری ،داروخەڵوزفرۆشتن،ڕاوەماسی،کشتوکالّ)کشتوکاڵیش بـەزۆری لەگوندەکانی (کانی کەوە،بەشـی ئـەحمـەد بەگ،تولـەبی)دەکرێت،شـەمێرانیەکان پێـشتر بەدرووسـتکردنی ڕەشمـالّ و هـۆڕ و بـەڕەو مـەوج و پیـشەسازی دەسـتی تــرەوە بــەناوبانگ بوون،بــەلاّم ئــەم پیــشەسازیانە ئێــستا بەلایانــەوە بوەتــە یادەوەری و نەماون.

وەفۆلکلۆری بیستراوی ناوچەکەشیان بریتی بووە لەشیعرو گۆرانی و ئەمەش لەژێرکاریگەری شیعر و گۆرانی هەورامەی هۆرەی جافدابووە،وە گوندەکانی شەمێران ژمارەیەك گۆرانی بێژو شمشاڵژەنی ناسراویان هەبووە کە ئاهەنگ و ڕەشبەڵەکی ناوچەکەیان گەرمکردووە لەوانەش وەك:(حەمەی حەمەئەمین،ساڵحی قادر،حەمەئەمەین حەمەشەریف،محەمەد عەلی خانە،عەلی ئەولمحەمەد)هاوکات لەگەڵ ئەوانەشدا چەند کەسێکی دانیشتوانی گوندەکان دەستی بالآیان لە بواری(پزیشکی و دەرمانگەری میللی)دا هەبووە وەك:(حاجی ئەحمەد میرزابەگ،حەمەی حەمەسەعید،حاجی زایەری حەمەی سان ئەحمەد،پورە خورشیدە ساڵح،حاجی ئەحمەد)ئەمانە چارەسەری جۆرەها نەخۆشیان کردووە و خەلکیش لەدەرەوەی شەمێرانەوە بۆچارەسەر ڕوویان کردووەتەلای ئەمانە(٤٢)،هاوکات لەگەڵ ئەوانەشدا دیسان شەمێرانیەکان گرنگیان بەبواری شانۆ داوە تەنانەت لەساڵی ١٩٧٣کاتێك شانۆی (دوانزە سوارەی مەریوان)لەکەمپی خوارووی دەربەندیخان نمایشکرا کەسایەتیەکی شەمێرانی بەناوی(مەلا غەریب شەمیرانی)بەشداری کردبوو(٤٣).

سەبارەت بەئاین و مەزهەبی دانیشتوانی گوندەکانی شەمێران،ئەکرێت سەرەتا وەك هەموو دانیشتوانی تری کوردستان لەسەر ئاینێکی دیکە بووبن، یەکێك لەو ئاینانەش کەبەشێکی هەرە زۆری کورد لەقۆناغەکانی مێژوودا هەڵگری ئەو ئاینە بووبن وەك ئاینی زەردەشتی،تەنانەت لەنێو سەرچاوەکانیشدا خودی پەیامبەری ئاینەکەیان بەکورد لەقەڵەم داوە دەڵێن زەردەشت پەیامبەرێکی کورد بووە،بەلأم لەقۆناغەکانی دواتردا بەهۆی بلأوبونەوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە و گەشتنی بەناوچە کوردیەکان کوردەکانیش ئەو ئاینەیان هەڵبژارد و کردیان بەئاینی ڕەسمی خۆیان،لەنێو ئەوانەشدا جافەکان بەگشتی و

شەمێرانیەکان بەتایبەتی ڕۆشتنە سەر ئاینی پیرۆزی ئیسلام و ئەمڕۆ هەموو شەمێرانیەکان وەك ئاین موسوڵمانن و وەك مەزهەب سونی مەزهەبن و هەڵگری ئاینی پیرۆزی ئیسلامن.

## تیرەی یەزدان* بەخشی و خێڵەکانی

لەمێژووی عەشرەتایەتی و هۆزگەریدا عەشیرەت لەچەندین تیرە و خێڵ پێك دێت جائەمانە پێکەوە لەیەك ناوچەدا یان بەجیا لەناوچەیەکی بەرفراواندا دەژین و خەریك ئیش و کاری ژیانی خۆیانن وەك کشتوکاڵ و مەڕومالآت بەخوێوکردن و ڕاوەماسی و خەڵوزکردن.

یەزدان بەخشیەکان: بەزۆری ئەمانە بەدیهاتەکانی ڕۆخی سیروانددا دابەش بوون و سەرگەرمی کشتوکاڵکردنن،یەکێکی ترن لە(تیرە گەورەکانی جاف*) دەبن بەسێ لقی وەك:(کۆمەڵی خاڵە ، کۆمەڵی بەگزادە ،کۆمەڵی مامەشەیی) کەچی عەزاوی لقەکانی ئەم تیرەیەلە(یەزدان بەخشی،بەگزادە،سوڵتان ئەحمەدی،مامەشیی)کۆکردوەتەوە لەسنوری شەمێران و قەزای هەڵەبجەبەنزیکەی(١٠٠٠)هەزار خێزانێك خەملآندونی لەگەڵ بەشێك لەو دیهاتانەی تێیدا نیشتەجێن[٤٤]، بەشی خاڵە ناو دەبرێن بە(یەزدان بەخشی*) و هەموو ئەم سێ کۆمەڵەیە نزیکەی (٧٠٠)ماڵێك ئەبن و سەرەتا گەڕوك بوون و ئێستا هەموویان نیشتەجێن و خەریك فەلاحەتن لەشەمێران کەموڵکی حەسەن بەگی عەلی بەگی مەحمودپاشایە،گەورەی هەموویان بریتین لە(محمدی سان ئەحمەد،ئەحمەدی حسەین، تۆفیقی فەرەج، ئەحمەدی سان ئەحمەد،مەحمودی حەمەی چراغە)[٤٥]،دەوترێت سەرەتا (خەسرەو بەگی یەزدان بەخشی)سەرۆکیان بووە و پاشان (محەمەدی سان ئەحمەد*) بووە بەسەرۆکیان[٤٦]، هەر دەربارەی

نـاوی سـەرۆکەکانی عەشـیرەتی یـەزدان بەخـشی بـەڕێز کـاك حەمەسـەعید دەڵێـت:سـەرۆکەکان بـریتین لـە(وەسمـانی خاڵـە*)،میرئەحمـەد،(سـان ئەحمەد*)،مەحمودی حەمەی سـان ئەحمەد،حەمەسـەعیدی مـەحمودی حەمـەی سان ئەحمەد)[٤٧]،ئەوەی شایەنی باسـە تائێستاش بـەڕێز کـاك(حەمـە سـەعیدی مەحمودی حەمەی سان ئەحمەدسەرۆك عەشیرەتی شەمێرانە.

بەشـێوەیەکی گـشتی تـیرە و خێڵـەکانی یـەزدان بەخـشی بـریتین لەمانـەی خوارەوە:

یەکەم: خێڵی خاڵـە:ئـەم خێڵە نزیکـەی (٦٠)ماڵێـك ئـەبێت و لـەم گوندانـەدا نیشتەجێن،(کانی کەوە ، وڵـوەر) سـەرۆکی ئەمانـە ( حەمەسـەعیدی مـەحمودی حەمەی سان ئەحمـەد)ە لەهـەمان کاتیـشدا بەسـەرۆکی هـەموو یـەزدان بەخـشی دادەنرێت،بەڵام سەرۆکایەتی یەزدان بەخشی لەپێشدا بەدەست ( سلێمان بەگ و مەحمود بەگی گەورە) بووە.

دووەم: خێڵی بەگە: ئەم خێڵە نزیکـەی (٧٠) ماڵێـك دەبـن و نێـشتەجێی ئـەم گوندانـەن:(شـەمێران–بەشـی ئەحمەدبـەگ،کێوەرێ،وەرمن) نزیکـەی(٢٠) ماڵێکیشیان لەبەشی(پـیرگ و عارەبـان) نیـشتەجێن، جـێ ڕاوێـژ و ڕیـش سـپیان (ئەسعەدی مەحمودی ئەورەحمانی یونس بەگ)ە.

سێیەم: خێڵی( مەحمود بەگی گەورە)ئەم خێڵەش نزیکەی (٢٠) ماڵێك دەبن و لـە گوندی (دلف) نیشتەجێن، ڕیش سپیان (محەمەدی حەمەسەعیدی مەحمود بەگ)ە.

چوارەم: خێڵـی ( ووسـێ خـان–وسـەین خـان– حسەین خـان) ئـەم خێڵـەش نزیکەی (٥٠) ماڵێـك دەبـن و لـەم گوندانـەدا نیـشتەجێن (زمنـاکۆ، وڵـوەر، کـانی کەوە،لاوران) ڕیش سپیان ( حاجی مـەلا عەبـدوڵا و شاوەیـسی مـەحمودی وسـێ خانە) لەناو تیرەی یەزدان بەخشیدا ئەم چوار بنەماڵەیە بەرەگەزپوخت دادەنرێن

و لەنەوەی یەزدان بەخشی کوڕی سەی سالاری پیر خدرن،بەلام چەند بنەماڵەیەکی تریش هەیە کە هەر بەیەزدان بەخشی لەقەڵم دەدرێن و بەوناوە ناسراون وس دەناسرێن وەك:

١- مامەشەیی: دانیشتوانی ئەم گوندەش نزیکەی (٢٠)ماڵێك دەبن و لەگوندی (مامەشەی هاجك) نیشتە جێن و ڕیش سپیان (قادری هاجك)ە،هەروەها نوسەر عباس العزاوی لەکتێبەکەیدا نوسیویەتی: سەرۆکی ئەم گوندە (عەبدالکریم محمد یاریس)ە و ژمارەی دانیشتوانی گوندەکەش نزیکەی (٦٠٠*)ماڵیك دەبێت[٤٨].

٢- خودای و مچە کۆڵی و هەلانی: ئەمانەش لەگوندی (تولەبی) و چەند گوندێکی تر نیشتەجێن، ڕیش سپیان (مەلا غەریبی حەمەی ئێلی و وەیس و حاجی جەلیلە)

٣- هەواسی: ئەمانەش نزیکەی (٢٠)ماڵێك ئەبن و نیشتەجێی گوندی (وڵوەر)ن ،ئەمانە لەگوندی (کوێرەکەوە)هاتوون ، ڕیش سپیان ( عەبدولای عەبدولقادری هەواس)ە

٤- بنەماڵەی شێخ عەبدولا کەنزیکەی(٢٠) ماڵێك دەبن و لەڕەگەزدا تاوگۆزین

پێنجەم: کۆکۆیی: دانیشتوانی ئەم گوندەش نزیکەی(٦٠) ماڵێك دەبن و نیشتەجێی گوندی (کۆکۆیی)ن و ڕیش سپیان (حاجی محەمەدی ڕۆستەمە)

شەشەم: خێڵی قالەلالۆ: ئەمانەش نزیکەی (١٥) ماڵێك دەبن و لە گوندی (دەنگەوەرە) نیشتەجێن،[٤٩] ئەم گوندانەی کەنشینگەی تیرەی یەزدان بەخشین لە دوو ناوچەدان:

١- ناوچەی شەمێران : کەبریتین لەم گوندانە: (زمناکۆ ، وڵوەر ،کانی کەوە ،دەنگەوەرە ،کۆکۆیی ،وەرمن ،دڵف ،کێوەرێ ،تولەبی ،بەشی هاجە ، چەمەڕەش ،دۆڵی ناوحەد).

٢- ناوچەی شەك مەیدان : بریتین لەم گوندانە:(بەشی پیرگ ،مامەشەیی ، عارەبان) هەموو ئەم بنەماڵانەی سەر بەیەزدان بەخشی كارو پیشەیان بریتیە لە(كشتوكاڵ و ئاژەڵداری) ئەمانەش هەموویان سەر بەقەزای(دەربەندیخان،سلێمانی)ن[٥٠]، هەروەها بەكرحەمەسدیق عارف لەلاپەڕە(٢٣) كتێبەكەی لەبرگەی چوارەم لەباسی ناحیەو لادێ و هاوینە هەوارەكانی شاری هەڵەبجەدا دەڵێت: لەسەرەتای بە (قەزابوونی هەڵەبجە* ) تاساڵی١٩٥٨ئەم ناحیەو گوندانە سەر بەقەزای هەڵەبجەن لەوانە لادێكانی ناوچەی شەمێران وەك:(بەشی پیرگ(سەروو و خواروو)،بەشی ئەحمەد بەگ،تۆڵەبی،كانی كەوە،شەمێران،دەنگەوەرە،زمناكۆ)[٥١]، هەردەبارەی بنەماڵەكانی شەمێران ئەیوب ڕۆستەم دەڵێت: یەزدان بەخشی بەواتای(شەمێرانی)دەبن بەچەند تیرە و بنەماڵەیەكەوە لەوانە بنەماڵەكانی(نادری بارام،هەواسی،بارامی حەمەی شاوەیس،یونس بەگی،سان ئەحمەد،شێخەكان،حەمەمینی عەزیز،وەسمان،هەلانی،مچەكۆڵێ،خواداد،محمودی هەواس،میران،چراخ،هاجك،عەبدولای ڕەسوڵ،مستەفای مەحمودبەگ)ئەم هۆزە لەباشوری كوردستان دەژین[٥٢]،ئەوەی شایەنی باسە ئەوەیە ئەمڕۆ تیرەیەك لەتیرەكانی (ئێلی جافی مورادی)كەپێیان دەوترێت (یەزدان بەخشی ) هەڵگری نازناوی شەمێرانیەكانن،كەئەم تیرەیە دابەش بوون بەسەر زۆربەی ناوچەكانی شەمێران[٥٣]،بەشێوەیەكی گشتی ئەمانە ناوی هەندێك لەتیرەكانی عەشیرەتی شەمیرانین.

**هەڵوێستی شەمێرانیەکان لەگەڵ شێخ مەحمودی نەمر بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئینگلیز**

دوابــەدوای تێکــشکانی دەســەڵاتی عوسمانیــەکان لەجــەنگی یەکــەمی جیهانی،هێـدی هێـدی بەریتانیـەکان دەسـەڵاتی خۆیـان لەناوچـەکانی دەوڵـەتی عوسمانی ڕووخاو دەسەپاند،هەر لەو بۆشاییە سیاسیەداو لەناوچەکانی سلێمانی دەسەڵاتی شێخ مەحمود ڕووی لەزیادبوون کرد و هەیمەنەی خۆی پەیداکرد،بەڵام ئینگلیزەکان چاویان لەسـەر ئـەم دەسـەڵاتەی شـێخ بوو،هـەرجارەو بەبیانویـەك دەسـەڵات و سـنوری دەسـەڵاتیان کـەم دەکردەوە،هەنـدێك جـاریش بۆئـەوەی ڕووبەڕووی کێشەی بکەنەوە دەسەڵاتیان فراوان دەکرد.

ئەوەبوو ئینگلیزەکان دەسەڵاتی شێخ مەحمودیان فـراوان کـرد بـۆ دەرەوەی سنوری سـلێمانی،کەئەمەش بـوو بـەهۆی سـەرهەڵدانی تـەنگ و چـەڵەمەو شـێخ مەحمودی تووشی گێروگرفتـی ڕووبەڕووبونـەوە کـرد لەگـەڵ سـەرۆك خێڵـەکانی تری کورددا،دژایەتی کردنی هەندێك لەو سەرۆك خێڵانە بـۆ دەسـەڵاتداریەتیەکەی شێخ زۆر تونـدو تیـژ بـوو کەیـەکێك لـەو حاڵەتانـە دژایـەتی جافـەکانی هەڵەبجـە بوو[٥٤]،دەبێت بۆ مێژوو ئـەوە بڵـێین هـەموو جافـەکانی هەڵەبجـەو دەورووبـەری دژی شــێخ مــەحمود نــەبوون و تــەنها لــەناو هەڵەبجــەدا خــانمی وەسمــان پاشـا(عادیلـەخان*)و دوو کوڕەکـەی(عیـزەت بـەگ و ئەحمەدبـەگ) دژی بـوون ئەمــەش بــەفیتی ئینگلیزەکــان بوو،ئەمــە بۆناوچــەکانی دەوروبــەری شــار پێچەوانەبوو هەمیشە جافەکان جێی هیوای شێخ مەحمود بوون بەتایبەت خەڵکی هەڵەبجــە.هەربۆیــە شــێخ مــەحمودی حەفیـد لەگـەڵ دەسـت پێکردنــی بزافــی ڕزگاریخوای کورددا چاوی ئومێدی لەخەڵکی ناوچـەی هەڵەبجەبوو،کەئـەو هـەموو هێزو دەسەڵاتانە بۆ خزمەت شۆڕشە ڕەواکەی بکەوێتەگەر،لەبەر ئەوە دەکەوێتـە ناردنی وەفد و پەیامنێرەتایبەتیەکانی دەنێرێتە خورماڵ و سورێنی شـارەزوور و

دانیشتنی نهێنی لەگەڵ سەرۆك عەشیرەت و پیاوماقوڵانی شارەزووردا دەکات و چەندەها کەس بەیعەتی جیهادی دەدەنێ.

خەڵکی عەشایەروو جەماوەری هەڵەبجە بەدڵ لەگەڵ شێخ و شۆڕشەکەیدابوون،بەڵام لەترسی خانم کەس نەیدەوێرا ئەوە بدرکێنێ،چونکە خانم چاوساغی خۆی لەهەموو جێگەیەك بڵاوکردبووەوە و لەلایەکی ترەوە کاغەزو نوسراوی بۆ هەموو سەرۆك هۆزو عەشیرەتەکانی شارەزوور نارد کەپشتیوانی لەشێخ مەحمود نەکەن،بۆیە لەناو هەڵەبجەدا کەس نەیدەوێرا نەیاری ئاشکرای سیاسەتەکانی(خانم)بێت جگە لە سێ کەسایەتی کە(حامی بەگ و سەیدقادر و باوەموفتی)بوون،لەپاشاندا گیران و بەرەو سەربازگەی ئینگلیز لەنزیك گوندی باوەکۆچەکی هەڵەبجە ڕاپێچ کران[٥٥]،بەڵام لەدەور و بەری شاردا خەڵکانێك هەبوون بەئاشکرا نەیاری پەیوەندیەکانی خانم بوون لەگەڵ ئینگلیزەکاندا،لەوانەش (حەمەی سان ئەحمەدی شەمێران)بوو،ئەمە لەگەڵ لەگەڵ بەرپابوونی شۆڕشەکەی شێخدا،بەئاشکرا پشتیوانی خۆی بۆ شۆڕشەکە ڕاگەیاند و هەڵوێستی وەرگرت[٥٦].

تەنانەت کاتێ سوپاکەی شێخ لەشەڕە خوێناویەکەی دەربەندی بازیان شکست دێنێ ئیتر لەبەردەم ئینگلیزدا هیچ بەربەستێك نامێنێ ڕێ لەهاتنیان بگرێت بەرەو حەوزی شارەزوور،پاشان سوپای ئینگلیز بەیارمەتی هەندێك لەسەرانی جاف و عادیلەخان هاتنە هەڵەبجە و سەربازگەیان تێداهەڵدا،نامەوبڵاوکراوەی خۆیان نارد بەهەرچوارلای شاردابۆسەرۆك عەشیرەتەکان تاخۆیان تەسلیم بکەن و چەك دانێن یان بەر زەبری سوپای ئینگلیزدەکەون،ئەوەبوو لەگوندی کانی کەوەی سەربەناوچەی شەمێران حەمەی سان ئەحمەد لایەنگری شێخ بوو هەڕەشەی تۆڵەی لەسوپای ئینگلیز

دەکرد[٥٧]،ئەمانیش خاوەن هێزبوون،تەنانەت کاتێك لەساڵی ١٩١٩شۆڕش بەرپا دەبێت ناوچەی هەڵەبجەو شەمێران پەلاماری هێزەکانی حکومەت ئەدەن و لەناو هەڵەبجە دەریان دەکەن[٥٨]،تەنانەت هەندێك لەسەرچاوەکان باس لەوە دەکەن ساڵی ١٩٢٠ هێزی تیرەی شەمێرانی پێکهاتبوو لە(١٥٠)سوار و (٤٠٠)تفەنگچی پیادە[٥٩]،ئەمەش بۆ ئەو رۆژگارە شتێکی کەم نەبوو،ئەوەبوو شەمێرانیەکان بەرابەرایەتی حەمەی سان ئەحمەد هەمیشە هاوکاری شێخ بوون،تەنانەت دوای گیران و دورخستنەوەی شێخ ئەمانە لەو هاوکارییەی خۆیان پەشیمان نەبوون و دوای هاتنەوەی شێخ هەرهاوکاری شۆڕشەکەی شێخ مەحمود بوون،ئیدی پاش ئەوەی ئینگلیزەکان دڵنیابوون لە دەست بەسەراگرتنی تەواوی عێراق و رووخاندنی ئیمپراتۆری عوسمانی تورك نەژاد و هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی سیڤەر و کارکردن بەپەیمانی لۆزان کەبەرژەوەندی تەواوی ئینگلیزی تێدا جێگیر کرابوو،ئینگلیزەکان لەپەیمان و بەڵێنەکانی خۆیان بەرامبەر بەداخوازی گەلی کورد بەسەرۆکایەتی شێخ مەحمود لەباشوری کوردستان پەشیمان بوونەوە,لەژێریشەوە بەدەم خۆیان بەدۆست و رزگارکەری مرۆڤایەتی پیشان دەداو گەلی کوردیان هەڵدەخەڵەتاند و ناکۆکی دووبەرەکیان دەخستە نێو هۆزەکانی کوردەوە و دژی شێخ مەحمودو بزووتنەوەی نیشتیمانی کوردبوون لەباشوری کوردستان.

پاش ئەوەی بەفرۆکە ئینگلیزەکان بەیاننامەیان بەسەر شاری سلێمانیدا فرێدایە خوارەوە تێیدا هاتبوو،کە شێخ مەحمود شاری سلێمانی چۆڵ بکات،ئەوەبوو شێخ لەبەر ئەوەی خەڵکی شار تووشی زیان نەبن رۆژی ١٩٢٣/٣/٢شاری سلێمانی بەناچاری چۆڵکرد و لەناوچەی سورداش گیرسایەوە،پاشان بەرێکەوتنێ لەگەڵ حکومەتی عێراق و مەندوبی سامی

بەریتانی لەعێراق و حکومەتی شاهەنشاهی ئێران لەگوندی(پیران)ی ناوچەی مەریوان دانیشت[٦٠].

کاتێکیش لەساڵی ١٩٢٤شێخ دەستی کردەوە بەدژایەتی ئینگلیز لەناوچەکانی هەڵەبجەو پێنجوێن،هێزێکی نارد بۆ ئەوەی هەڵەبجە بگرێت،بەلام لەوەداشکستی هێناو ڕووی کردە سەرسنوری ئێران[٦١]، هەرلەهەمان ساڵیشدا حەمەی سان ئەحمەد لەناوچەی شەمێران پەلاماری هێزەکانی حکومەتی داو تا خانەقین و هەڵەبجەی بەئینگلیز چۆڵکرد[٦٢].

دوای ئەوەی شێخ مەحمود کۆتایی بەشۆڕش هێنا و لەگوندی پیرانی سەرسنوور دانیشت،ئیدی بەشی باشوری کوردستان بۆ چەند ساڵێك شۆڕشی ئەوتۆی بەخۆیەوە نەدی و شێخ مەحمودیش ئەودەمانەی کەهێشتا لە گوندی پیران بوو بەووردی چاودێری گۆڕانکارییەکانی دەکرد[٦٣]،ئەوکاتەی شێخ لەگوندی پیران بوو ئەو کارەساتەی بەردەکی سەرای سلێمانی نارەزاییەکی گەورەی لەنێو جەماوەری کوردستاندانایەوە،خەڵی ڕۆشنبیرو نیشتیمان پەروەران لەهەمولایەکەوە پەیوەندیان دەکرد بەشێخ مەحمودەوە،تەنانەت زۆربەی سەرۆك هۆزەکانی کوردستان ئامادەیی خۆیان دەربڕی بەگیان ماڵ هاوکاری شێخ مەحمودبن و ڕۆژانە چەندین بروسکەی پشتگیری دەگەشتە مەقامی شێخ مەحمود[٦٤].

لەئەنجامی ئەوەشدا شێخ گوێی بەو هەڕەشانە نەئەدا کەلەلایەن بەریتانیا و عێراقەوە ڕووبەڕووی دەکرانەوە،دووبارە سنوری بەزاند و گوندی پیرانی بەرەو شارباژێڕ بەجێ هێشت و کەوتە خۆپیشاندانی چەکداری و چالاکی سیاسی دەستی پێکردەوە[٦٥]،ئەوەبوو لەرێکەوتی ١٩٢٦/٤/٥ شێخ مەحمود دەگاتە (گوندی ئاوباریك*) و هێزەکانی دابەشکرد بۆسێ بەشەوە خۆی سەرۆکایەتی

هێزی دووەم دەکات[٦٦]،پاش شەڕێکی قارەمانانە و بەرگریەکی باش بەهۆی نابەرامبەری هێزەوە شێخ و هێزەکەی دووچاری شکست دێن.هەر لەدوای (شەڕی ئاوباریك*)ەوە شێخ بۆجارێکی دیکە لە٢١ی نیساندا پەنای بردەوە بەرئێران و شەوی بیست و دوو لەسەر بیست وسێ رۆشتەوە پیران و بەلاَم بەهۆی فشاری دەسەلاَتدارانی ئێران و عیراق وبەریتانی شێخ لەپێنجوێن خۆی دابەدەستەوە و سەرەتا گواستیانەوە بۆ بەغداد و ناچاریان کرد پەیماننامەیەك مۆربکات و تێیدا رای بگەیەنێت کەدەستی لەکاری سیاسی هەلگرتووە و پاشان دوور خرایەوە بۆ سەماوە و تاکاتی بەرپا بوونی بزووتنەوەی مایسی ١٩٤١،بەسەر یەکەوە دەساڵی تەواوی لەشارەکانی(سەماوە،ناسریە،عانە،بەغداد)بەسەربرد [٦٧]،دواجار لەکاتی بەرپابوونی شۆرشی رەشید عالی گەیلانی لەمایسی ١٩٤١لەبەغدادەوە هەڵهات و هاتەوە بەرەو سلێمانی لەبیستی ئەو مانگەدا گەشتەوە سلێمانی و پاش ئەو دابرانە دووروو درێژە دووبارە دەستی کرد بەوەی کەپیاوان و کەسانی دەورووبەری خۆی کۆبکاتەوە بۆ هێرش کردنە سەر شاری سلێمانی ئەمەلەکاتێکدابوو حکومەتەکەی رەشید عالی لەکۆتای رۆژانی دەسەلاَتەکەیدابوو،ئیدی شێخ واز لەو فیکرەیە دێنێت،هەربەم شێوەیە شێخ مەحمود لەکوردستان ئەمێنێتەوە و لەناوچەی بازیان و گوندی داری کەلی نیشتە جێ ئەبێت و تاساڵی ١٩٥٦بەنەخۆشی لەشاری بەغداد کۆچی دوای دەکات[٦٨].

لێرەوە بابێینەوە سەر رۆڵی شەمێرانیەکان و هەڵدانەوەی لاپەرەیەك لەو مێژووەیان(لەو سەردەمەدا شەمێرانیەکان بەرابەرایەتی (حەمەی سان ئەحمەد) ئەکەونە پشتوانی شێخ مەحمود،ئەوە بوو حەمەی سان ئەحمەد دوای شەڕی (ئاو باریك) بەڵێن وپەیمان ئەدا بەشێخ مەحمود کە بەوپەڕی دڵسۆزییەوە هاوکاری بکات و هەرچی شێخ پێی خۆشە ئەوەبکات، ئەو کاتە شێخ مەحمود

لەگوندی (داری کەلی) ناوچەی بازیان بوو*)،چونکە ئینگلیزەکان سلێمانیان پێ چۆڵکردبوو،ئالەوکاتەدا خەڵك لەهەموو لایەکەوە بەتایبەت ئەوانەی هەوادار و دڵسۆز بوون ئەچوونە خزمەت شێخ،تەنانەت زۆربەشیان بەشێوەی نامە پەیوەندیان پێوە دەکرد، لەو سەروبەندەدا حەمەی سان ئەحمەد ڕایگەیاند کەئەیەوێ نامەیەك بۆ شێخ بنوسێ و بەڵێنی هاوکاری پێبدات،ئەوەبوو نامەکەی بۆنارد و پاشماوەیەك شێخ داوای لێکرد کە خودی حەمەی سان ئەحمەد بچێت بۆلای ئەمیش بۆی نەکرا سەردانی بکات[٦٩] بەلاّم لەسەر فەرمان و داوای شێخ،محەمەدی سان ئەحەمەد، کوڕەکەی و کەسایەتیەکی تری بەناوەکانی((مەحمودی کوڕی*)) و مەحمودی ئەحمەدی وەسمان)ی ناردە داری کەلی و بۆماوەی ساڵێك لەوێدا لەخزمەتی شێخدا مانەوە، لەماوەی ئەو ساڵەدا ئەم دوو کەسایەتیە چەندجارێك(نامەیان*) لەنێوان شێخ مەحمود و حەمەی سان ئەحمەددا ئاڵوگۆر کردووە[٧٠] ئەکرێت بڵێین،ئاڵوگۆڕی ئەم نامانە هێندەی تر پەیوەندی شێخ مەحمود و حەمەی سان ئەحمەدیان بەهێزتر کرد.

ئەمەش بویە هۆی ئەوەی کەوا شێخ داوا دەکات خودی حەمەی سان ئەحمەد ببینێت،ئەویش بەوە ڕازی دەبێت و لەگەڵ برزاکەیدا بەناوی(محەمەدی قادر) ڕێگەی داری کەلی دەگرێتەبەروو لەوێدا بەدیداری شێخ مەحمود شاد ئەبێت و دەست لەناو دەستی دەنێت و پەیمانی لەگەڵدا تازە دەکاتەوە، دوابەدوای ئەم پەیمانە شەمێرانیەکان بەهەموو شێوەیەك (سەرجەم پەیوەندیەکانیان لەگەڵ میری و دەسەلاّتی ئینگلیزدا*) بچڕاند و پشتیان لەداگیر کەران کرد[٧١] ئەوەی گرنگە بۆ مێژوو بوترێت ئەوەیە کەشەمێرانیەکان وەك چیاکانی ناوچەکەیان سەرکەش بوون و بۆماوەی چوارساڵ لەدەسەلاّتی ئینگلیزەکان یاخی بوون و باجیان پێ نەئەدان[٧٢]، سەرئەنجام زۆرجار لەئیدارەی میری لەهەڵەبجەوە

دەکرایە سەریان کە(باج و زەویانە و جوتانە)بدەن،بەڵام ئەوان گوێیان بەوە نەئەدا و سووربوون لەسەر ئەو پەیمانەی کەبە شێخ مەحمودیان دابوو هاندەرەکەشی لایەنە(ئاینیەکە)ی بەو ئەمەشیان هێنایە دی، ئەوەبوو حکومەت ناردیە سەریان و بەفەرمانی کاپتن(لین) هێزێك پێك هێنرا لە مدیرناحیەی (فەقی جنە *)، (حسن بەگی جاف) لەوارماوا کرابوو بەمدیری ناحیەی حکومەت و لەگەڵ (٣٠) پۆلیسدا کەئامر مەفرەزەکەیان (عەبە بەران)بوو کابرایەکی زۆر دڵڕەق بوو،ئەو مەفرەزەیە بەرەو سنوری گوندەکانی شەمێران کەوتەڕێ[٧٣]،هەرکە ئەوانە ڕۆشتنە گوندی کانی کەوەی شەمێران داوایان کرد کوێخا(موختار)ەکانی هەر (چواردە *) گوندەکەی شەمێران کۆببنەوە و هەریەکەیان (٤٠) لیرەی زەویان و جوتانەی ئەو چوارساڵەی سەرپێچیە بدەن کە پێشتر نەیانداوە.

ئەو کۆێخایانەی کەداوایان لێکرابوو ئامادەبن بریتی بوون لە کۆێخای گوندەکان وەك:*(ئەحمەدی حسین–تولەبی)،(عەبدولای ڕەسوڵ–چەمەڕەش)، (حەمەی ڕۆستم–کۆکۆیی)،( بارامی حەمەی شاوەیش–وەرمن)، (حەمەشەریفی قادر–دەنگەوەرە)، (نادری بارام–زمناکۆ)، (ئەحمەدی سان ئەحمەد–وڵوەر)، (حەمەی ئەورەحمانی یونس بەگ–بەشی ئەحمەد بەگ)، (تۆفیقی فەرەج– دلف)، (حەمەی مەحمودی هەواس–بەشی هاجە)، (حەمەتۆفیقی هیران–بەشی پیرك)، (قادری هاجك–مامەشەوی)، (مەحمودی محەمەدی چراغ–شەك مەیدان)، کاربەدەست و پۆلیسەکان کەوتنە هەڕەشە و کوێخاکانیان هەڵپێچا بۆ ئەو چل لیرەی زەویانە،ئەوانیش بەمەرازی نەبوون،لەسەرەتادا دوو کوێخایان بەناوی( عەولای ڕەسول و ئەحمەدی حسەین)یان بەپاڵ برد[٧٤] ئالەوکاتەدا حەمەی سان ئەحمەد ئەمەی بینی دەست بەجێ لەدیوەخانەکەی هاتە دەرەوە و دەمانچەکەی دەرهێنا و هاواری کرد:(ئادەی خەڵکینە بیانگرن،دەست بەستیان

کەن،ئەمانـەهاتوون شـەرەفمان بـشکێنن)بـەوبانگ و هـاوارە خەڵکەکـە هـەمووی پەلاماریانـدان و ڕاویاننان،بـەم شـێوەیە بـارووددۆخ وەك خـۆی مایـەوە تامـاوەی دوومانکێك[٧٥].

بەڵام لەدوای تێپەر بوونی ئـەم دوومانگـە بەسـەر ئـەو ڕووداوەدا،فڕۆکەیـەك بەیاننامەیـەکی بەسـەر گونـدی کـانی کـەوەی شـەمێراندا بلاّوکـردەوە و داوای لێکـردن یـان ئـەواتا مـل بـدەن یـان ناوچـەکەیان بۆمبـاران دەکرێـت، ئـەوەبوو حەمـەی سـان ئەحمـەد فـەرمانی مـل نـەدان و چـۆڵکردنی گونـدەکانی کـرد و بەخەڵکەکەش دەڵێت: ڕووبکەنە ئەشکەوت و پـەنا بـەردەکان[٧٦] هـەر ئەوکاتـە پێی ڕاگەیاندن ئەگەر سوپای ئینگلیز هێرشیان هێنایە سەرمان ئـەوا هەرکـەس لەبەرەنگاربوونەوەیانـدا بکوژرێـت ئـەوە شـەهیدە[٧٧]،لەڕاسـتیدا خـودی کەسایەتی حەمـەی سان ئەحمـەد وتـارخوێنێکی ئـاینی یـان زانایـەکی شـەرع زانێکـی ئـاینی ئـەو سـەردەردەمە نـەبووە بـەلاّم دەرکردنـی ئـەم فتوایـە خـۆی لەخۆیـدا کاریگـەری هـەبووە و سـەرە ڕای ئـەوەش شـەمێرانیەکان لەشـەڕدا چاونەترس و قارەمان بوون.

دوای چەند ڕۆژێك دووژمن هیچ هەواڵێکی پێناگات (چەند فڕۆکەیەکی*) نارد و گوندی کانی کەوەی بۆردومـان کرد،لـەو کاتـەدا حەمـەی سـان ئەحمـەد کـەخۆی لەنزیك گوندەکەیان و لەپەنای تاشەبەردێکدا مابوویـەوە ،تفـەنگێکی برنـەوخۆری پێبوو ئەوکاتە(تەیارەشکێن) یان پێدەوت کەوتـە تەقـەکردن لێیـان و یـەکێکیانی خستە خوارەوە،ئەو سێ ئەفسەری کەلەناو فڕۆکەکەدابوون بە پەڕەشوت خۆیـان هەڵدایە خوارەوە و لەناو بێشە و قامیشەلاّنەکانی گوندی (چەمەڕەش)دا کەوتن و بەبەیداخێکی سپی ئیشارەتیان بۆ یەکێك لەفڕۆکەکان کرد کەبچێت بەهانایانـەوە فڕۆکەکەش خێرا نیشتەوە و هەڵی گرتن[٧٨].

لەهەمان شەودا نامەیەك لەكاپتن(لیز*) وە گەشتە دەست حەمەی سان ئەحمەد كەتێیدا داواكرابوو ئەگەر تەیارەكە نەسوتێنن ئەوا( ئێمە لێتان خۆش دەبین و هیچ لەنێوانماندا نامێنێت*)، لەوەلامیدا حەمەی سان ئەحمەد وتبووی لەبەر ئەوەی ئینگلیزەكان خاوەنییەتی و بۆمبارانی كردووین دەبێت بسوتێنرێت[79]،پاشان خەڵكی ناوچەكە بەرەو فڕۆكەكە ڕادەكەن و بەدەم هەلگرتنەوەی پارچەكانییەوە ئەم بەیتەگۆرانیە دەڵێنەوە:

تەیارە شكاو سەربالّ قلّیشاو

ئاگردان كون كون هۆرێن تلیشاو

زۆرت هەلّگرتوە بەردی كوردستان

لەباتی بۆمبا بۆ بەردەباران[80]

بەلاّم شەمێرانیەكان ملیان نەداوە و لەپارچەكانی ئەو فڕۆكەیە( چەقۆ ، گاسن ، داس ، تەور)یان دروست كردو پاشان ئاگریان تێبەردا و سوتاندیان[81],دوابەدوای سوتاندی فڕۆكەكە و بەچەند ڕۆژێك دواتر جارێكی دیكە چوار فڕۆكە هاتنە سەر ناوچەكە و بەخەستی بۆمبارانیان كرد،پێشتر حەمەی سان ئەحمەد هەمیشە تفەنگچی دەناردە ڕیگاویان و ملەی(تەمورەژەنان*) بۆ چاودێری و وریایی لەهێزی دووژمن نەك لەناكاو بدەن بەسەر ناوچەكەیاندا، باروزۆخ وەك خۆی مایەوە لەپەیوەندی دژی نیوان شەمێرانیەكان و ئینگلیزەكان.

پاش سالّێك لەم ڕووداوانە ئینگلیزەكان دوایان لە حەمەی سان ئەحمەد كرد كەدەیانەوەێ پەیوەندی نێوانیان ئاسایی بكەنەوە و لەهەموو شتێك بیان بەخشن،وەئەگەر خۆی بڕواناكات با كوڕەكەیان بۆبنێرێت بۆ ئەم ڕاوێژ و

مەبەستە،ئەویش لەسەر داوا و پێشنیاری کۆێخای گوندەکان بەوە رازی بوو ئەوەبوو(مەحمودی کوڕی وئەحمەدی حوسەین)ی نارد بۆ هەڵەبجە.

بەڵام ئینگلیزەکان و کاربەدەستانی ئەوسەردەمە هەردوو نێردراوەکە دەگرن و بەندیان دەکەن لەبەندینخانەو وتیان:هەتا حەمەی سان ئەحمەد خۆی نەیەت و ڕووبەڕوو نەبێتەوە لەگەڵماندا ئەوا بەریان نادەین،دیارە ئەویش زانیویەتی مەسەلەکە پلانەو پەیوەندی بەخودی خۆیەوەیەتی[٨٢]، ئەویش یەکسەر نامەی نوسی بۆ ئەم سەرۆك هۆزانە(عەبدوڵای حەمەی خواکەرەمی نەوڕۆڵی،حەمەئاغای گەلاڵی،سەید ئەورحمانی تاوگۆزی)ئەمانیش هەموویان هاتن بەدەمیەوە،لەشکرێکی گەورەیان پێکهێناو ڕوویان کردە شاری هەڵەبجە و دایان بەسەر سەرادا و شەڕ دروست بوو،ئینگلیزەکان زۆریان بۆهات و ناچار بوون هەردوو گیراوەکە بەربدەن و ئەوانیش بەسەربەرزی گەڕانەوە شوێنی خۆیان[٨٣]،

ئەوەی شایەنی باسە هەر لەم ڕووداوەدا خەڵکی بناری هەڵەبجە بەتایبەت لایەنگرانی (شێخ رەشیدی عەبابەیلێ)هاوکاری شەمێرانیەکانیان کردووە[٨٤]،ئەوەی شایەنی باس بێت لەکاتی دەسەڵاتی ئینگلیزیشدا هەمیشە ئەوان بەفڕۆکە لەبۆردومان کردنی ناوچەی شەمێران نەوەستاون[٨٥].

دواتر شەمێرانیەکان لەناوچەکانی خۆیاندا دەستیان بەژیانی ئاسایی خۆیان کردەوە و خەریك ئاوەدان کردنەوەی گوندەکانیان و ژیانی کشتوکاڵی و ئاژەڵداری بوون، بارودۆخ بەم شێوەیەمایەوە هەتا ئەوکاتەی شێخ مەحمود بەرەو لاوازی و کزی ڕۆشت و حەمەی سان ئەحمەدیش ئەو گوڕوتین و توانای جارانی نەما[٨٦]، بەهەرشێوەیەك بێت ، دواتر ئینگلیزەکان توانیان حەمەی سان ئەحمەد دەستگیر بکەن و دووری بخەنەوە بۆ شاری خانەقین، بەڵام ئەمە تەنها ماوەی(٤٠) ڕۆژێکی خایاند و هەرخۆیان وتبوویان باشتر وایە ئەم کەسایەتیە

ئازاد بکرێت[٨٧]،بەلاّم دواتر ئینگلیزەکان بەتۆمەتی سەرپێچی کردن و نەدانی زەوییانە دادگایی کردن و وازیان لێهێناو ئازادیان کرد[٨٨]،بەم شێوە حەمەی سان ئەحمەد مایەوە تائەوکاتەی کۆچی دوای کرد و توانی لاپەڕەیەکی پرشنگدار بۆ مێژووی عەشیرەتی شەمێرانیەکان زیاد بکات و ببێت جێی ئومێد و متمانەی شێخ مەحمودی نەمر،تائیستاش شەمێرانییەکان شانازی بەو کەسایەتیەوە دەکەن.

ئەوەی گرنگە بۆ مێژوو بوترێت ئەوەیە عەشیرەتی شەمێران بەپێچەوانەی عەشیرەت و سەرۆک خێڵەکانی ترەوەبوون،چونکە شەمیرانیەکان هاوسۆز و وەفادار بوون بۆشێخ مەحمود هەمیشە لەگەڵی بوون هەرگیز پشتیان نەکردە شێخ و شۆرشەکەی چونکە پێشتر بەڵێنی وەفاداریان پێدابوو لەگەڵ ئەوەشدا فرۆفێڵ و هەڕەشەی ئینگلیز و هێرشەکانیان نەیترساندبوون و بەوەعدەکانیان هەڵنەخەڵەتابوون،لەم بارەیەوە ڕەمزی قەزازدەنوسێت: ئینگلیزەکان بەفرۆفێڵی خۆیان توانیان سەرۆك عەشایەرەکان ڕاکیشن بەلای خۆیاندا و بەپارە هەوویان لەشێخ دابڕی و ئەو سەرۆك عەشیرەتانەی دەستی شێخیان بڕی و سوێندیان بۆخوارد هەموویان شێخیان بەجێ هێشت و کشانەوە و شێخ مەحمود لەکوڕی شەڕدا بەتەنیا مایەوە و تەنانەت شێخ خۆی دانی ناوە بەوەدا و دەڵێت:لەشۆڕشدا نابێت پشت بەعەشایەر ببەسترێت،ئەوەبوو لەوەو پێش سەرۆك عەشیرەتەکان هەموو سوێندخۆری من بوون کەچی پاش دوو شەڕ هەموویان پاڵیاندا بەدوژمنەوە کەئینگلیزە و پشتی منیان بەردا[٨٩].

## رۆڵی شەمێرانیەکان لە شۆڕشی ئەیلول و شۆڕشی نوێی گەلەکەمان

ناوچەی شەمێران وەك بەشێك لەخاکی کوردستان و وەك ناوچەکانی تر هەمیشە لەژێرهەڕەشە و کاولکاریدابووە، خەلکەکەشی پێشمەرگەئاسا لەناو شۆڕەکانی کورددا بەشداربوون و ماڵەکانیان وەك بنکەیەك وابووە بۆ پێشمەرگەی ڕزگاری خوازی گەلەکەمان، لەو پێناوەشدا وەك ناوچەکانی تری شۆڕش چەندان قوربانی بۆنیشتیمان و چەندین سەرکەوتنی بۆ گەلەکەمان تۆمارکردوە،بەماڵ و منداڵەوە لەخزمەت شۆڕشەکانی کوردستاندا بوون و ئەوەی پێیان کرابێت کردویانە و درێغیان نەکردووەلەو پێناوەشدا ناوچەی شەمێران دووچاری کاولکاری و وێرانی بووە.وێرانکاریش بابەتێکی نوێ نیە بەنیسبەت ناوچەی شەمێرانەوە،تەنانەت لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا شەمێرانیەکان گوندەکانیان وێران کراوە,ئەمەش زیاتر لەبەر ئەو هۆکارانە بووە کەنەیان ویستووە یارمەتیان بدەن و ئامادەش نەبوون کەباج و سەرانە بدەن[٩٠].

ئێستا با سەرێك لەلاپەڕەکانی مێژوو بدەین و چەردەیەك لەو خەبات و تێکۆشانەی ئەوان بنوسینەوە ،بەشێوەیەکی گشتی لە(شۆڕشی ئەیلول)دا زۆربەی شەمێرانیەکان پێشمەرگە بوون، وەناوچەکەشیان بەدرێژایی ساڵەکانی شۆڕش لەچوارچیوەی ناوچە ڕزگارکراوەکاندا بووە[٩١]،هەر لەو بارەیەوە سەرۆك عەشیرەتی شەمێران سەبارەت بەناوچەکەیان ئاماژەی بەوە کردووە:ئەوەبوو حکومەتی عێراقی هەتا نسکۆی ساڵی ١٩٧٥ نەیتوانی ناوچەی شەمێران بگرێت و هەربەدەست پێشمەرگەوەبوو[٩٢]،سەبارەت بەناوچەی شەمێران لەم شۆڕشەدا شەوکەتی حاجی مشیر دەنوسێت: لەسەردەمی شۆڕشی ئەیلولدا زۆربەی گوندەکان شوێن و ڕێگەوبانی شۆڕش بوون لەوانەش گوندەکانی ناوچەی شەمێران[٩٣].

بەهۆی ئەوەی گوندەکانی کوردستان مەڵبەند و لانکەی شۆڕشەکانی کورد و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلەکەمان بوون ڕژێمی بەعس هیچ چارەیەکی ئەوتۆی نەما و ناچار کەوتە بیری ئەوەی گوندەکان چۆل بکات و ڕایان گوازێت بۆناوشارەکان بۆئەوەی ئیدی نەبنەپشت وپەنای شۆڕش وپێشمەرگەو هاوکاریان نەکەن ئەوە بوو لەکۆتای حەفتاکانی سەدەی بیستەم واتەلەنێوان ساڵەکانی (١٩٧٨-١٩٧٩) کەوتە ڕاگواستنی گوندەکانی کوردستان لەوناوچانەش بەر ئەو شاڵاوە شومە کەوتن گوندەکانی ناوچەی شەمێران بوو کەبریتی بوون لەم گوندانـــەی:(بەشـــی پیرک،بەشـــی ئەحمـــەد بەگ،بەشـــی هاجە،بەشـــی ئەلی،تولەبی،چـــــەمەڕەش،دلف،دەنگەوەرە،کۆکۆیی شـــــەمێران،زمناکۆ، مامەشەوی،ولۆەر،وەرمن) [٩٤] بەشێوەیەکی گشتی دانیشتوانی ئەم گوندانە لەناو شاری هەڵەبجەو سیروان و زەمەقی و دەورو بەری نیشتەجێ کران،یەکێکی دیکە لەو کەسانەی ڕۆڵێکی دیار و بەرچاوی لەم شۆڕشانەدا هەبوو کەسایەتیەکی وەك(حەمەشەمێرانی)بوو لەو سەردەمانەدا ناوناوبانگێکی باشی پەیداکردبوو تەنانەت خودی ئەو کەسانەی ئێستا لەژیاندا ماون شایەتی ئەو ڕاستیەن کە ئەم کەسایەتیە چ ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە.

ئەمەو سەرە ڕای ئەوەش لەشۆڕشی نوێی گەلەکەماندا شەمێرانیەکان ڕۆڵێکی بەرچا و دیاریان هەبوو،هەروەك ئەوەی قەدەریان فرۆکە بەردانەوەی داگیرکەرانی کوردستان بێت، پێشمەرگەیەکیان بەناوی(مەمەد حەسەن محەمەد شوکر) ناسراو بە(حەمەشووتە) ساڵی ١٩٨١ لە (دوانزە ئیمام*) تەقەی لە هەلی کۆپتەرێکی ڕژێمی عێراقی کردووەو لەگوندی (ئیمامیزامن) کەوتوەتە خوارەوە، وەلەساڵی ١٩٨٢دا کاتێك فرۆکەکانی ڕژێم بۆمبارانی ناوچەی شەمێرانیان کردووە، ناوبراو بریندداربووە،لەگەڵ ئەوەشدا لەشوێنێك کەپێی دەوترێت (توون)بەتفەنگێکی

(ئاربیکە)تەقەی لەهەلی کۆپتەرێك کردووە و لەنزیك بەنداوی دەربەندیخان کەوتووەتە خوارەوە،دواتر بەبەریندارى براوە بۆ ئێران.

ناوچەی شەمێران لەپێناو پاراستنی ناوچەکەیان وەك بەشێك لەخاکی کوردستان چەندین قوربانیان داوە،نمونەیەکی کەمیش بۆ ئەمە ئەوەتا شەمێرانیەکان لە هەردوو شۆڕشی ناوبراوی گەلەکەماندا ژمارەیەك شەهیدی قارەمانیان بەکاروانی سەرفرازی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلەکەمان بەخشی لەوانەش:(فایەق مەحمود محەمەد سان ئەحمەد ، سالّح حاجی ڕەشید ، کەریمی عەبەی خاسە ، ئیبراهیم مارف،حەمەمین محەمەد ناسراو بەمینەی پەزە،حەمەسەعیدی محەمەدی حمەی ڕۆیتەن)[95] و(عەلی عەبولغەفور عەبدولحەمید،عوسمان عەلی نادر،حسێن عەلی یەعقوب،عەلی محمود محەمەد شکور،محەمەد براخاس قادر،سالّح ئەمین ڕەحمان عەباس، محەمەد عەبدولرەحمان عەبدولآ،فایەق مەحمود کاکەوەیس،ئیبراهیم ئەحمەد محەمەد،سلێمان سالّح براخاس قادر،عەزیز محەمەد عەبدولرەحمان،سالّح محەمەد عەبدولّرەحمان،سابر حەمەلاو شاوەیس[96]).

لەم بارەیەوە شەوکەتی حاجی مشیر دەنوسێت:لەشۆڕشی ڕزگاریخوازی گەلی کورددا دانیشتوانی گوندەکان قوربانی زۆریان داوە هەروەك تێکرای ناوچەکانی تری کوردستان لەوانەش عەشیرەتی شەمێران[97]،وەچەندین کەسایەتی دیکەی وەك(سلێمان شەمێرانی و ئەحمەدی حسین شەمێرانی)[98]لەشۆڕشی نوێی گەلەکەمان ڕۆڵی دیار وبەرچاویان هەبووە.تەنانەت وەك لەسەرچاوەکاندا هاتوە شەمێرانیەکان لەهەموو سەردەمەکاندا پشتیوانیان لەشۆڕشەکانی کورد کردوەو هەمیشە پشت و پەنابوون[99].

## کاریگەری مین لەسەر ناوچاکانی شەمێران

ناوچەی شەمێران لەجەنگی هەشت ساڵەی نێوان(عێراق – ئێران)دا شوێنی شەڕو شۆڕو لەشکر کێشیەکی گەورە بوو،هەر ئەمەش زەرەر و زیانێکی زۆری بەناوچەکە گەیاندووە،هەتا ئێستاش زۆربەی شوێنەکانی ناوچەی شەمێران مین ڕێژن و چەندان هاولاتی بوونەتە قوربانی مین،ژمارەی ئەو خێزانانەی گەڕاونەتەوە ناوچەی شەمێران و گوندەکانیان ئاوەدان کردووەتەوە نزیکەی (٢٥٠*) خێزانێك دەبن و خەو بەوەوە دەبینن ناوچەکەیان بەرگی ژیان و گوزەرانێکی نوێی بەبەردا بکرێت،ئەوەی شایەنی باس بێت بەشێکی زۆری ئەو شەمێرانیانەی کەنەگەڕاونەتەوە ناوچەکەی خۆیان لەهەردوو شاری(هەڵەبجەی تازە و هەڵەبجە شەهید) نیشتەجێن[١٠٠].

لەمەوە دەگەینە ئەوەی شەمێرانیەکان نەك تەنهاوەك پێشمەرگە قوربانیان داوە بەڵکو وەك خاکیش ڕووبەرووی کاولکاری و وێرانکاری بوونەتەوە بەشێکی زۆری ناوچەکانی مین ڕێژ کران لەلایەن دەسەلاتی ئەوکاتەی عێراقەوە هەتا ئێستا وەك جوندیەکی خوێن ڕێژ لەناوچەی شەمێراندا خەڵکی ئەوناوچەیە دەکەن بەقوربانی،بەهۆی مینەوە بەشێکی زۆری زەویەکانی سنوری شەمێران زیانێکی زۆری پێگەشتەوە و ناتوانرێت وەك زەویکی کشتوکاڵی بەکار بهێنرێت یان وەك لەوەڕگەیەکی باش بۆ ئاژەڵەکانیان بەکاربهێنرێت،ئەمە و جگەلەوەی ئەم مینانە مەترسیەکی گەورەی لای دانیشتوانی نواچەکانی شەمیران دروست کردووە و هەمیشە بەترسەوە دەڕواننە ناوچەکانی خۆیان و هەمیشە لەئەگەری ئەودان کەوا بەهۆی ئەو مینە چینراوانەوە دوچاری لەناوچوون یاخود کەم ئەندامبوون ببنەوە چونکە هێشتا زۆر ناوچەهەیە لەمین پاك نەکراوەتەوە.

بەڵام دەکرێت ئەوە بڵێین لەم ساڵانەی دوایدا هەندێك لەناوچەکان لەلایەن ڕێکخراوی (ئای ئیم جی)یەوە پاك کراونەتەوە بەدەیان هەزار مینی جۆراو جۆریان لەناوچەکە هەڵگرتوەتەوە لەناویان بردوون و لەئیستاشدا خەڵکی گوندەکانی ناوچەکە دەتوانن بەشێك لەو زەویانە بۆدەغڵ و دان و کشتوکاڵ و لەوەرگا بەکار بهێنن.

سەرە ڕای ئەوەش لەکارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجەدا چەندین کەسایەتی شەمێرانی بوون بەقوربانی ئەو کارەساتە،وە لەکتێبی هەڵەبجە کارەساتی کیمیابارانی ١٩٨٨دا ناوی چەندین کەسایەتی شەمێرانی هێناوە کە بوون بەقوربانی وەك(ئامینە ژنی عەزیز،بارام حەمە ئەمین قادر،مەحەمەد مەحمود عیسا[١٠١]).

## ئەنجام

بەشێوەیەکی گشتی لەسەر ئەنجامی ئەم توێژینەوەیە گەشتینە ئەوەی،شەمێرانیەکان لەسەرەتادا بە(یەزدان بەخشی) ناویان دەرکردووە و ناویان کەوتوەتەنێو لاپەڕەکانی مێژوو،ئەمانیش یەکێکن لەتیرەکانی عەشیرەتی جافی مورادی(عێراقی) و لەقۆناغێك لەقۆناغەکانی مێژوودا هاتونەتە ناوچەی شەمێران و دەستیان کردووە بەئاوەدان کردنەوەی ناوچەکە و چەندین گوندیان لەو سنورەدا ئاوەدانکردوەتەوە.

ئەم عەشیرەتە سەرەتا کۆچەر بوون بەڵام دواتر وازیان لەوە هێناو بەدووەم هۆزی جاف دادەنرێن وازیان لەکۆچەری هێناوەو لەناوچەی شەمێراندا نیشتەجێ بوون،دواترناوچەکەیان بەشەمێران و خۆشیانی بەشەمێرانی ناسران،شەمێرانیەکان وەك هەموو عەشیرەتەکانی تر لەناوچەکانی خۆیاندا

بەکاری کشتوکاڵ و ئاژەڵداری و مەڕومالآت بەخێوکردن و ڕاوکردن وڕاوەماسی وچەندین ئیشی دیکە خەریك بوون لەپێناو بژێوی ژیاندا کەوتونەتە ململانێی سروشت بۆ دەست کەوتنی ژیانێکی سادە و خۆشگوزەران و ئاوەدانکردنەوەی ناوچەکەیان، ئەم عەشیرەتە لەمێژووی خۆیاندا خاوەن چەندین کەسایەتی ناودار و لێهاتوو بوون توانیویانە لەمێژووی کورد لاپەڕەکەی گەش بۆخۆیان تۆمار بکەن و بیکەنە سەروەری بۆخۆیان و عەشیرەتی شەمێران و لاپەڕەیەکی گەش بۆ مێژووی کورد و کوردستان.

لەپاش دروستکردنی بەنداوی دەربەندیخان کەلەناوەڕاستی ساڵەکانی سەدەی بیستەمدا دروستکرا،بەشێکی خاکی ئەم ناوچەیەو چەند گوندێکی کەوتنە ژێرئاوەوە،بەهەمان شێوە خاکی ئەم ناوچەیە لەهەشتاکانی هەمان سەدەدا لەشەڕی عێراق و ئێراندا دوچاری کاولکاری هات و بەشێکی زۆری خاکەکەی مین ڕێژکرا،لەمێژووی ئەم عەشیرەتەدا چەندان کەسی بەتوانا و ناودار و لێهاتوو دەرکەوتوون و هاوخەباتی شۆڕشگێڕان و ڕزگاریخوازانی کورد،پێشمەرگانە و قارەمانانە ڕووبەڕووی داگیرکەران بوونەتەوە و هاوکاری بەهێزی شۆڕشی شێخی نەمربوون، تەنانەت لەشۆڕشی ئەیلول و شۆڕشی ڕزگاریخوازی گەلەکەماندا کوردپەروەرانە و نیشتیمانپەروەرانە لەسەنگەردا بوون و لەپێناوپاراستنی خاك و نیشتیمان خەباتیان کردووە و لەو پێناوەشدا چەندان شەهیدیان بەم خاکە بەخشیوە،ئەمانە نەك تەنها خۆیان بەڵکو گوندەکانیان وەك مەڵبەند و وەك سەنگەرێکی بەهێز کردوەتەماڵی پێشمەرگەو لەئاست ئەمەدا هیچ کات خۆیان بەخاوەن ماڵ نەزانیوە و لەخزمەتیاندا بوون و هاوکاریان بوون،ئەم عەشیرەتە بەهەمان شێوەی عەشیرەتەکانی تر لەژیان و خەباتی کورد و کوردستان تائێستاش بەردەوامن.شەمێرنیەکان بەپێچەوانەی هەندێك لەعەشیرەتەکانی

ترەوە لەسەر بەڵێن و وەفای خۆیان سووربوون بۆ شێخ مەحمود و پشتیان بەرنەداو بەهەڕەشەوترساندن و تەماحی ئینگلیزەکان نەخەڵەتان و هەمیشە هاوسۆزی شێخ و شۆڕشەکەی بوون، تەنانەت حەمەی سان ئەحمەدی شەمێرانی کوڕەکەی خۆی نارده خزمەت شێخ و دووساڵ لەخزمەتی شێخ دابوو،بەمەش شەمێرانیەکان توانیان بەو هەڵوێستە جوانەیان لاپەرەیەکی پرشنگدار وپڕشانازی بۆخۆیان تۆماربکەن و ئەمەش لاپەڕەیەکی گرنگە لەنێو مێژووی کورد و عەشیرەتەکانی تردا.

## وێنەکان

مەحمودی حەمەی سان ئەحمەد
ئەو کەسایەتیەی باوکی ناردی ساڵێك لەخزمەت شێخدابوو

قوتابخانەی کانی کەودی شەمیران 1975-1974

حەمەشووتە: ئەو کەسایەتیەی دوو فڕۆکەی خستە خوارەوە

## سەرچاوەکان

### یەکەم: سەرچاوە کوردیەکان


١. ئەیوب رۆستەم:هەگبەوەهەوارگە،چاپی یەکەم،٢٠٠٢

٢. ئەحمەد خواجە:چیم دی،بەرگی یەکەم،چاپخانەی شەفیق،بەغداد،١٩٦٨

٣. ئەحمەد حسێن محەمەد:ژیان و یادەوریەکان،چاپخانەی چوارچرا،چاپی یەکەم،سلێمانی،٢٠١١

٤. ئەحمەد محەمەدناسراو باوەڕ:دۆزی کورد لەپەیوەندەکانی عێراق-ئێراندا(١٩٣٧-١٩٤٧)،سلێمانی٢٠١٠

٥. بەکر حەمەسدیق عارف:لاپەڕەیەك لەمێژووی هەڵەبجە(١٧٠٠-١٩٥٨)،چاپی یەکەم،١٩٩٧

٦. جەمال بابان:گەشتێ بەناخی تەمەندا،چاپ و پەخشی سەردەم،چاپی یەکەم،سلێمانی،٢٠٠٧

٧. د.حەسەن جاف:تەئریخی جاف،چاپی یەکەم،بەغداد،١٩٩٥

٨. ڕەمزی قەزاز:بزووتنەوەی سیاسی و ڕۆشنبیری کورد،چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری-هەولێر،چاپی یەکەم،٢٠٠٨

٩. حەکیم مەلاسالح:هەڵەبجە لەئامێزی مێژوودا،بەرگی یەکەم،چاپخانەی منارە،چاپی یەکەم،٢٠٠٤

١٠. خوسرەوجاف:مێژووی هۆزی جاف:چاپخانەی هێڤی:چاپی یەکەم،٢٠١٢

١١. سەلاح هەلاج:چەردەیەکی مێژوویی دەڤەری گەرمیان،چاپخانەی گەنج،چاپی یەکەم،٢٠١١

١٢. سمکۆ محەمەد : ناسیۆنالیزم و دژەکانی،چاپخانەی ئاراس،چاپی یەکەم، هەولێر،٢٠٠٩

١٣. شەوکەت حاجی مشیر:کارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجە بەهاری١٩٨٨،چاپی یەکەم،سلێمانی،١٩٩٨

١٤. صالح هاروونی:هاروونی لەمێژوودا،چاپخانەی چوارچرا،چاپی یەکەم،سلێمانی،٢٠١١

١٥. عادل صدیق:هەڵەبجە(١٨٨٩-١٩٣٠)چاپ و پەخشی سەردەم،چاپی یەکەم،٢٠٠٨

١٦. عادل صیق عەلی:عادیلەخانم کەسایەتی و ئەردەڵانی بوون و ساحێبقرانی بوونی،بلاوکراوەی مەڵبەندی کوردۆلۆجی،چاپی یەکەم،٢٠١٠

١٧. عەبدولا غەفور:گوندەکانی کوردستان،بەرگی دووەم،چاپخانەی ئاراس،چاپی یەکەم،٢٠٠٥

١٨. عومەرحاجی عینایەت:هەڵەبجەشاروشارستانیەت،چاپخانەی پیرەمێرد،چاپی یەکەم،٢٠٠٨

١٩. کۆچەر کەریم حەمە عەلی:دەربەندیخان لەمێژوودا،چاپەمەنی گەنج،چاپی یەکەم،٢٠١٢

٢٠. کۆمەڵێك مامۆستای زانکۆ:جوگرافیای هەرێمی کوردستانی عیراق،و:سەنتەری برایەتی،چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە،چاپی دووەم ١٩٩٩

٢١. محەمەد مەردۆخی کوردستانی:مێژووی کورد و کوردستان،و:عەبدول کەریم محەمەد سەعید،چاپەمەنی هێمن،چاپی دووەم،٢٠٠٧

٢٢. نادر ئینتیسار:ئێتنۆنەتەوایەتی کوردی،و:عەتاقەرەداغی،چاپخانەی تیشك،٢٠٠٤

٢٣. غەریب عەلی عەزیز:فەرهەنگی ڕەسەنایەتی زمانی کوردی بەدرێژایی کات و مێژوو،چاپخانەی تەفسیر،چاپی یەکەم،هەولێر،٢٠٠٨

٢٤. محەمەد ڕەسوڵ هاوار: شێخ مەحمودی قارەمان و دەوڵەتی خواروی کوردستان،بەرگی دووەم ،چاپخانەی بلاك ڕۆز–لەندەن،١٩٩١

٢٥. مێجەر ئی.بی.سۆن:چەند سەرنجێك دەربارەی کوردستانی خواروو،و:نەجاتی عەبدولا،چاپخانەی شڤان،چاپی یەکەم،سلێمانی،٢٠٠٧

٢٦. هەورامان عەلی تۆفیق:هەڵەبجە–کارەساتی کیمیابارانی ساڵی ١٩٨٨،چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە،چاپی یەکەم،هەولێر،٢٠٠٠

٢٧. یاسین ڕەسوڵ عوسمان:مێژووی دەربەندیخان لەبنیات نانەوە تا چرکەساتی ڕاپەڕین(١٩٥٤–١٩٩١)،چاپی یەکەم،٢٠٠٤

**دووەم: سەرچاوەی عەرەبی:**

١. عباس العزاوي المحامي:موسوعه عشائر العراق،المجلد الرابع،الدار العربيه للموسوعات,٢٠٠٥

**سێیەم: گۆڤارەکان:**

١. گۆڤاری کۆچ:ژمارە(٥)بەهاری ٢٠٠٥،ئەحمەد باوەڕ:کورتەیەك سەبارەت بەهۆزەکانی ناوچەی کەلار و دەوروبەری،ل٥٤

٢. گۆڤاری بەیان،ژمارە(١٥١)کانونی دووەم،١٩٨٩،ڕەوف عوسمان:لاپەڕەیەکی شکۆداری سەردەمی شێخ مەحمود.

٣. گۆڤاری هەورامان،ژمارە(١٦)–٢٠٠٩،ئەیوب ڕۆستەم،چەردەیەکە سەبارەت بەمێژووی ئێلی جاف.

٤. گۆڤاری کاروان،ژمارە(١٢)ساڵی١٩٩٤،ئەحمەدباوەڕ:شەڕی ئاوباریك و ستراتیجیەتی بەریتانیای گەورە لەکوردستان.

٥. گۆڤاری کۆچ،ژمارە(٦)حوزەیرانی ٢٠٠٧،سەرحەد خەلیفەیونس:دەوری جاف و خەلیفە یۆنس لەشۆڕشی شێخ مەحموددا

٦. گۆڤاری کەلەپوور،ژمارە(١٨)پایزی ٢٠٠٤،کەمال نوری مەعروف،تیشکێك بۆسەر مێژووی قەڵای شەمێران.

**چوارەم: ڕۆژنامە**

١. ڕۆژنامەی شارەزوور،ژمارە(١٢)ساڵی یەکەم،٢٠٠٦ /٨/١٤،دیداری:سەلاح سالار لەگەڵ بەڕێز :حەمەسەعید سەرۆك عەشیرەتی شەمێران،سەرگوزشتەی ئەو فرۆکەئینگلیزییەی لەگوندی (کانی کەوە) بەردرایەوە.

* – سەبارەت بەناوی(یەزدان)خوسرەوجاف دەپرسێت: بۆچی ناوی ئەم تیرەیە بە(یەزدان)دەست پێدەکات،ئەگەر بنەما و بنەڕەتێکی مێژووی نەبێت؟هەروەها دەڤەری شەمێران و ڕوان،لەسەردەمی دەسەڵاتی ئیمپراتۆری ساسانیدا بەدەڤەرێکی ئاینی و گڕی ئاگردانی هەمیشەیی بڵێسەداری ئایینی زەردەشتی ناسراوە، (یەزدان،ئێزەد،ئێزەدیان،ئاهورامەزدا،زەردەشت)ئەو وشەیە و واژانە ئەرکانی ئاینی زەردەشتن.خوسرەوجاف،ل١٩١

[1] – خوسرەوجاف:مێژووی هۆزی جاف:چاپخانەی هێڤی:چاپی یەکەم،٢٠١٢،ل١٩٣

[2] – ئەیوب رۆستەم: چەردەیەك سەبارەت بەمێژووی ئێلی جاف،گۆڤاری هەورامان،ژمارە(١٦)ساڵی ٢٠٠٩،ل٣٦

[3] – خوسرەوجاف:سەرچاوەی پێشوو,ل١٩٣

[4] – ڕۆژنامەی شارەزوور،ژمارە(١٢)ساڵی یەکەم،٢٠٠٦/٨/١٤،چاوپێکەوتنی سەلاح سالار لەگەڵ کاك حەمەسەعید سەرۆك عەشیرەتی شەمێران.

*– گوندی پشت قەڵا: یەکێکە لەگوندەکانی سەرسنووری ناوچەی تاوگۆزی–شەمێران کەنزیکەی بیست ماڵێکی تێدا دەژیا،قەڵاکە بەشوێنێکی بەرز و سەختەوە هەڵکەوتووە بەتەنیا ڕێگەیەك مرۆڤ دەتوانێت بچێتە ناوی ،ئێستاش پاشماوەی دیوارەکانی هەرماوە کەبەشێوەیەکی چوارگۆشەی لەبەرد و قسڵ دروستکراوە،ناو قەڵاکەش بەشی پێویستی خۆی ئاوی تێدایە ئەمەش لەچیای زەواڵیەوە ئاوی بۆ ڕاکێشراوە کەکانیاوێکی باشی تێدایە: حەکیم مەلا ساڵح:هەڵەبجە لەئامێزی مێژوودا،ل٧٦. ئەم گوندە لەناوچەیەکی سەختی پڕ لەشاخ و تەپۆڵکەدایە ،ناوی گوندەکەش لەبونی قەڵاکەوە ناونراوە کە کەوتوەتە بەشی باکوری گوندەکەوە بەدووری چەند مەترێك ،ئەم قەڵایە بەسەر بانێکەوەیە کە بەرزیەکەی دەگاتە زیاد لە(٢٥٠)م لەڕووی بەشی باشوریەوە،بەڵام بەرزی بانەکەی لەڕووی بەشی باکوریەوە بەرزترە و بەرزیەکەی دەگاتە نزیکەی (٧٥٠)م،ناوچەکە لەڕووی تۆبۆگرافیەوە شاخاوی و سەختە، کۆچەر کەریم حەمە عەلی:دەربەندیخان لەمێژوودا،ل٦٧.قەڵاکە دەکەوێتە سەرلوتکەی بەرز لەزنجیرە شاخی شەمێران،ئەم قەڵایە دەکەوێتە خۆرهەڵاتی گوندی شەمێران یان باکوری گوندی دڵفی حاجی مەجید یاخود باشووری گەندی پشت قەڵا،قەڵاکەش بۆ سەردەمی ئاشووریەکان دەگەڕێتەوە،جگەلەوەش ژمارەیەك پارچەگۆزە یان لەتەگۆزەی سورباو کەبەشێوەی نیوە بازنەیەك بۆ دواوە هاتوەتەوە و لەو دەمە گۆزانە بوون کەبۆ چاخی ساسانی دەگەڕێتەوە،نوسەری بابەتەکە دەگاتە ئەو ئەنجامەی کەدەڵێت:مێژووی دروستکردنی قەڵای شەمێران بۆچاخی دوای ساسانیەکان

دەگەڕێتەوە.کەمال نوری:تیشکێك بۆسەر مێژووی قەڵای شەمێران،گۆڤاری کەلەپوور،ژ(١٨)پایزی ٢٠٠٤،ل٤٠-٤٤

[٥] – خوسەرەوجاف:سەرچاوەی پێشوو،ل١٩١

[•] چونکە کاتی خۆی بەناوی سیروان سنوری عێراق و ئێران جودا کراوەتەوە بەئەوانیان وتوە بەشی ئێران.(رۆژنامەی شارەزوور،ژمارە(١٢)ساڵی یەکەم،٢٠٠٩/٨/١٤

[٦] – ئەیوب رۆستەم : گۆڤاری هەورامان،سەرچاوەی پێشوو،ل٣٦ و هەگبەوهەوارگە: هەمان نووسەر،ل١٠٨

[*] – ناوی (شەمێران)یش لە(سۆمۆرامات)ی یۆنانیەوە هاتووە،کەبە(سەمیرامیس) ناسراوە و یەکێکە لە ژنە پادشاکانی ئاشوور،کەچەند ساڵێك لەسەر تەختی ئاشوور فەرمانڕەوایەتی کردووە.کەمال نوری مەعروف:سەرچاوەی پێشوو،ل٤٠

[٧] – غەریب عەلی عەزیز:فەرهەنگی ڕەسەنایەتی زمانی کوردی بەدرێژایی کات و مێژوو،چاپخانەی تەفسیر،چاپی یەکەم،هەولێر،٢٠٠٨،ل١٠٩-١١٠

[٨] – رۆژنامەی شارەزوور،ژمارە(١٢)ساڵی یەکەم،٢٠٠٦/٨/١٤چاوپێکەوتنی سەلاح سالار لەگەڵ کاك حەمەسەعید سەرۆك عەشیرەتی شەمێران. کۆچەر کەریم حەمەعەلی:دەربەندیخان لەمێژوودا،چاپی یەکەم،٢٠١٢،ل٣٠٨

[*] – یەزدان بەخشی: ناوێکی مورەکەبە لە دوو وشە پێك هاتووە"یەزدان-بەخش"مانی هەردوو وشەکە بەمەفهومی ئەمڕۆ دەکاتە خوابەخشیو یان خوداداد:خوسرەوجاف،ل١٩١،یەزدان بەخشی بەواتای (بەخششی خودا) و بەعەرەبی(عطیة الله) و بەتورکی(الله ویردی) و بەفارسی(الله کرم)دێت،جەمال بابان:گەشتێ بەناخی تەمەندا،چاپی یەکەم،٢٠٠٧،ل١٢٠

[٩] – ئەیوب رۆستەم:گۆڤاری هەورامان،ژمارە(١٦)-٢٠٠٩،ل٣٦

[١٠] – کۆچەر کەریم حەمە عەلی: دەربەندیخان لەمێژوودا،چاپی یەکەم،چاپەمەنی گەنج،٢٠١٢،ل٣٠٨

[•] –پاو کوری شاپوری کوڕی کیوس و برای کیسرا ئەنەوشیروانی ساسانیە،کیسرا یەزگوردی سێیەم بۆ ئەوەی خەڵك بهێنێتەوە سەر ئاینی زەردەشتی ناردویەتیە ناوچەکەوە:ئەیوب رۆستەم:هەگبەو هەوارگە،ل١٠٨

[١١] – ئەیوب رۆستەم : هەگبەوهەوارگە،ل١٠٨-١٠٩

[١٢] – کۆچەر کەریم حەمە عەلی:سەرچاوەی پێشوو،ل١١٨

* – لەراستیدا زۆر گەرام بۆ ئەم شەرە لەنێو سەرچاوەکاندا بەڵام هیچی ئەوتۆم دەست نەکەوت بۆ ناساندنی ئەم شەرە وساڵی ڕوودانی ئەم شەرە

[13] – ئەیوب ڕۆستەم:هەگبەو هەوارگە،ل١٠٩

[14] – ڕۆژنامەی شارەزوور،ژمارە(١٢)ساڵی یەکەم،٢٠٠٦/٨/١٤

[15] – ئەیوب ڕۆستەم: هەگبەو هەوارگە،ل١٠٩

[16] – کۆچەر کەریم حەمەعەلی:سەرچاوەی پێشوو،ل ٢٣١

[17] – مەحمودعەزیز حەسەن:مێژووی هۆزی جاف و ژیانی تیرەکانی،چاپخانەی خاک،چاپی یەکەم،٢٠٠٤،ل٤١

[18] – مەحمود عەزیز حەسەن: هەمان سەرچاوە،ل٣٦

* – کۆمەڵێك گوندی رازاوە دەوروبەری ئەم بەربەست و دەریاچەیان داوە و بەدیمەنی جوانی ئەم بەربەستە ئاشنابوون و ژیانیان لەگەڵیدا ئاوێتەیە،گوندەکانیش بریتین لە:(گوندەکانی ناوچەی شەمێران و زمناکۆ)لەبەشی ڕۆژهەلاتیەوە وگوندەکانی (ناوچەی شارەزوور)لەباکوری خۆرهەلات و گوندەکانی ژاڵەناو–کوێرەك)لەباشورەوە و شاری دەربەندیخان و کۆنە گوندی(سەلیم پیرك)لەرۆژئاواوە. یاسین رەسوڵ عوسمان:مێژووی دەربەندیخان،چاپی یەکەم،٢٠٠٤،ل٢٩

[19] – صالح هاروونی:هاروونی لەمێژوودا،چاپخانەی چوارچرا،چاپی یەکەم،سلێمانی،٢٠١١،ل١٤٥

* – نوسەری ئەم دەقە ئاماژە بەوەدەکات سنوری جوگرافی شەمێران لەنێوان شەمێران و هەڵەبجەدایە، لەراستیدا سنوری جوگرافی ئەم ناوچەیە چەندان کیلۆمەتر لەهەڵەبجەوە دوورەو چەندین عەشیرەتیش دەکەونە نێوان شەمێران و هەڵەبجەوە ئەمەش بەواتای ئەوەی سنوری شەمێران ناکەوێتە نێوان شەمێران و هەڵەبجەوە بەڵکۆ رووباری سیروان و چەند عەشیرەتیکی دیکە ئەم سنورە لێك جیادەکاتەوە و زۆربەی گوندەکانی شەمێرانیش دەکەوێتە سنوری شەمێران واتە ئەوبەری رووباری سیروان لەگەڵ ئەوەشدا وا ئەکادیمی تر بوو نوسەری ئەو دەقە بینوسیایە شەمێران دەکەوێتە نێوان دوو ناوچە نەك بەکارهێنانی وشەی هەن.نوسەر

[20] – سمکۆ محەمەد : ناسیۆنالیزم و دژەکانی،چاپخانەی ئاراس،چاپی یەکەم، هەولێر،٢٠٠٩،ل١٢٩

[21] – ئەیوب ڕۆستەم: هەگبەوهەوارگە،چاپی یەکەم،٢٠٠٣،ل١٠٨

[22] –ئەیوب ڕۆستەم: هەگبە و هەوارگە،ل،١١٠

[23] – غەریب عەلی عەزیز: فەرهەنگی رەسەنایەتی زمانی کوردی بەدرێژایی کات و مێژوو،ل١٠٩

[24] – کۆمەڵێك مامۆستای زانکۆ:جوگرافیای هەرێمی کوردستانی عێراق،و:سەنتەری برایەتی،چاپی دووەم ١٩٩٩،ل١٣٨

* بەربەستی دەربەندیخان: ئەم بەربەستە یەکێکە لەپرۆژە ئاودێرییە جوانەکانی کوردستان، بەربەستەکە دەکەوێتە باشوری رۆژهەلاتی شاری سلێمانی و رۆژهەلاتی شاری دەربەندیخان و نزیکەی پێنج کیلۆمەتر لەم شارەوە دووره،لەنێوان دوو چیای سەرکەشدایە،ئەوانیش شاخی زمناکو لەبەشی باشوری رۆژهەلات و شاخی قاشتی لەباکوری رۆژئاوایەوە و هەردوو چیاکەش دەکەونە زنجیرە شاخی بەرانان،ئەم بەر بەستە لەسەرەتای پەنجاکانەوە نەخشەی بۆ دارێژراوە،لەساڵی ١٩٥٤دەستکرا بەدروستکردنی تونێلی ژێرەوە بۆ گواستنەوەی ئاوی سیروان،وە لەساڵی ١٩٥٦ بەرەسمی دەستکرا بەدروستکردنی و پلان و نەخشەکێشانی لەلایەن کۆمپانیای راوێژکاری(هارزا)ی ئەمریکی کەلەلایەن عێراقەوە بەراوێژکاری پرۆژەکە ناسراوە،لەرۆژی ٢٣\١١\١٩٦١ لەئاهەنگێکی گەورەدا بەئامادەبوونی (عبدالكريم قاسم)کرایەوە،(یاسین رەسوڵ عوسمان:مێژووی دەربەندیخان،ل٢٠-٢١

* – وەرمن:گوندێکە لەناوچەی شەمێران، لەئاڤێستادا بەشێوەی (واریمەن) هاتووە بەواتای (پەناگا) حەکیم مەلاسالح:سەرچاوەی پێشوو،ل٧١

* – عارەوان:گوندێکی سەربەناوچەی شەمێرانە ،لەکاتی دروستکردنی بەربەستەکەی دەربەندیخان کەوتە ژێر ئاوی بەنداوەکە، ئەم گوندە لەئاڤێستادا بەشێوەی (ئاثرەپان) ناوی هاتوە، ئاپر ،ئاگر،ئار،ئاهیر،ئاور هەموو ئەمانەیەك ریشەن،کەواتە (عارەوان)کورتکراوەی ناوە ئاڤێستاکەیەو بووە بە(ئارەوان) بەواتای پارێزگاری ئاگر،(پان)ی ئاڤێستای لە پەهلەویدا بووە بە(بان): حەکیم مەلاسالح:ل٧١،

* – گوندەکانی ((چەمەرەش ، مامەشەوێ ، عارەوان)) ئەم سێ گەندە لەپاش دروستکردنی (بەنداوی دەربەندیخان) بوون بەژێر ئاوەوە خەڵکانی گوندی چەمەرەش هەرلە زەوی زاری خۆیاندا گوندێکی تریان بەهەمان ناوەوە درووستکردەوە، خەڵکی گوندی (مامەشەوێ) رۆشتوونەتە هەڵەبجەو لەوێدا نیشتەجێبوون، خەڵکی گوندی (عارەبان) یش رۆشتوونەتە (ئیمامیزامن)و لەوێ خانووبەرەیان دروستکردەوە،(ئەیوب رۆستەم:هەگبەوهەوارگە،ل١٠٩-١١٠

[25] – رۆژنامەی شارەزوو، ژمارە (١٢) ساڵی یەکەم ،٢٠٠٦/٨/١٤دیداری سەلاح سالار لەگەڵ بەرێز کاك حەمەسەعید

[26] – ئەیوب رۆستەم : چەردەیەك سەبارەت بەمێژووی ئێلی جاف،گۆڤاری هەورامان،(ژمارە)(١٦)٢٠٠٩

[27] – د.عەبدولاغەفور:گوندەکانی کوردستان،بەرگی دووەم،چاپخانەی ئاراس،چاپی یەکەم،هەولێر،٢٠٠٥،ل١٥٠-١٥٢

[28] –حەکیم مەلا سالح:هەڵەبجە لەئامێزی مێژوودا،بەرگی یەکەم،چاپخانەی منارە،چاپی یەکەم،٢٠٠٤ل١٤٣

[29] –شەوکەتی حاجی مشیر:کارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجە بەهاری ١٩٨٨،چاپی یەکەم،سلێمانی،١٩٩٨ل٥٤

* – جافی مورالردی: بەشێوەیەکی گشتی ئەم بەشەی جافی مورادی لە(٣٢) تیرە پێك دێت کەبریتین لە:( ڕوغزایی ،گەلاڵی،تەرخانی،شاتری،هاروونی،کەماڵەیی،عەمەلەیی،بەداخی، سەدانی سەیانی،میکائیلی، سمایل عوزێری،شێخ سمایلی، سۆفی وەندی،نەورۆڵی،شوان،شێخ بزەینی،تەلانی(جافەڕەشکە)،غەوارە،بێسەری،قەویلەی،پەرخی، چوچانی،هۆزحەسەنی،ڕەشە و بۆری،باشکی، مرادی،یوسوجانی،یەزدان بەخشی،پشت ماڵەیی،یارەویسی،عیسایی،شەرەف بەیانی)(محەمەد مەردۆخی کوردستانی:مێژووی کورد و کوردستان،و:عەبدول کەریم محەمەد سەعید،چاپی دووەم،چاپەمەنی هێمن،٢٠٠٧،ل١١٤–١١٥، ناوهێنانیان بەمورادی لەبەر ئەوەبوو لەساڵی(١٦٣٨–١٦٣٩)هاوکاری سوڵتان موردیان کرد لە ڕزگارکردنی شاری بەغداد و ئازایەتی لێهاتوویان نیشان داوەو سوڵتانیش لەقەبی(موورادیی) پێ بەخشیون(د.حەسەن جاف:تەئریخی جاف،چاپی یەکەم،١٩٩٥،ل٢٦

[30] – مەحمود عەزیز حەسەن:مێژووی هۆزی جاف و ژیانی تیرەکانی:چاپی یەکەم،٢٠٠٤،ل١٣٥

* – نوسەر ناوی وزمانی بەگوند هێناوە بەلام ڕاستیەکەی وزمان کانیە نەك گوند و دەکەوێتە سەروو گوندی کۆکۆیی ناوی ئەوکانیە دێتەوە بۆ کۆکۆیی(نوسەر)

* – لەڕاستیدا ئەمە یەکەم جارە ئەم ناوەم بەو شێویە بەرچاو دەکەوێت لەناوی گوندەکانی شەمێراندا بەڕای من پێم وایە مەبەسی نوسەری کتێبەکە ناوی گوندی (کۆکۆیی)بێت،نوسەر.

[31] – عباس العزاوي المحامي:موسوعه عشائر العراق،المجلد الرابع، الدار العربيه للموسوعات،٢٠٠٥،ص٧٥

[32] – عباس العزاوي المحامي: هەمان سەرچاوە،ص٧٤

[33] – ئەحمەد حسێن محەمەد:ژیان و یادەوریەکان،چاپخانەی چوارچرا،چاپی یەکەم،سلێمانی،٢٠١١،ل٩–١٠

[34] – کۆچەر کەریم حەمە عەلی:سەرچاوەی پێشوو،ل٢٣٥

[35] – کۆچەر کەریم حەمەعەلی:هەمان سەرچاوە،ل٢٤٣

[36] –کۆچەر کەریم حەمەعەلی:هەمان سەرچاوە،ل٢٣٨

[37] – کۆچەر کەریم حەمەعەلی:هەمان سەرچاوە:ل241–242

[38] – زەواڵی: وشەی زەواڵی کەلەڕاستیدا (زەواریێ)یە کە بەواتای (کاروانی)دێت، حەکیم مەلا ساڵح:سەرچاوەی پێشوو،ل77

[39] –کۆچەر کەریم حەمەعەلی:هەمانسەرچاوە:ل247

[40] – کۆچەر کەریم حەمەعەلی:هەمان سەرچاوەی پێشوو،ل239

[41] – کۆچەر کەریم حەمەعەلی:هەمان سەرچاوە،ل237–238

[42] –ئەیوب رۆستەم:هەگبە و هەوارگە،ل110–111

[43] – کۆچەر کەریم حەمە عەلی:سەرچاوەی پێشوو،ل318

* – سەبارەت بەناوی تیرەی یەزدان بەخشی بەڕێز خوسرەوجاف دەنوسێت:زۆرنیە ئەم تیرەیە بەناوی شەمێرانەوە ناو دەبرێن و هەمووی ناگاتە حەفتا ساڵێك،دەڵێت کەریم بەگی فەتاح بەگ کەبۆخی سەرۆکی فەرمی سەرتاسەری هۆزی جاف بووە ناوێك لەم تیرەیە بەو ناوەوە ناهێنێت ،بەڵکو بەناوی یەزدان بەخشی ناویان هێناوە و شەمێران دەڤەرە و بەناچەیەکی شاخاوی باسی دەکات،خوسرەوجاف،ل191

* – تیرەی یەزدان بەخشی یەکێکن لەتیرە دیار و ناسراوەکانی هۆزی جاف،لەزۆربەی ڕووداوەکاندا دەوریان هەبووە،ئەم تیرەیە بەئازایەتی و لێهاتووی ناسراون،ڕەنگە بەشێك لەهۆی ئازایەتی ئەم تیرەیە بگەڕێتەوە بۆ بۆ جێگەکەیان،کەشوێنەکەیان و جێگەی تەواجودیان یەکێکە لەسەختترین و دژوارترین دەڤەری جاف و کوردەواری،وەنەبێت رۆحی مل نەدان و تەسلیم نەبوونی ئەم تیرەیە لەمڕۆ و دوێنێ بۆیان مابێتەوە بەڵکو دانیشتوانی ئەو دەڤەرە خو و خەسڵەتی ململانێیان لەسەردەمی ساسانیەکانەوە بۆماوەتەوە،خوسرەوجاف:ل190

[44] – گۆڤاری کۆچ:ژمارە(5)بەهاری 2005،ئەحمەد باوەڕ:کورتەیەك سەبارەت بەهۆزەکانی ناوچەی کەلار و دەوروبەری،ل54

* – مێجەر ئی.بی.سۆن دەڵێت: سەرۆکی یەزدان بەخشیەکان (حەمەی سان ئەحمەد)ە و ژمارەیان نزیکەی(900) ماڵێك دەبن و خاوەنی (100)ئەسپ و (400)پیادەن،(مێجەر ئی.بی.سۆن:چەندسەرنجێك دەربارەی هۆزکانی کوردستانی خواروو،و:نەجاتی عەبدوڵا،چاپخانەی شڤان،چاپی یەکەم،2007،ل64

[45] – د. حەسەن جاف:تەئریخی جاف،چاپی یەکەم،1995،ل139–140

* – خوسرەوجاف لەلاپەرە 192ی کتێبەکەیدا دەربارەی حەمەی سان ئەحمەد دەنوسێت:دوای مردنی باوکی(سان ئەحمەد) سەرۆکایەتی تیرەکەی دەگرێتە دەست و زۆر ناخایەنێت لێهاتووی خۆی

لەڕووداوەکاندا دەردەخات و لەشەر و ململانێی (شێخ مەحمود و ئینگلیزدا)حەمەی سان ئەحمەد قارەمانێك بووە بۆخۆی،مەخابن ناو هەر بۆ چەند کەسێك ماوەتەوە و قارەمانە ڕاستەقینەکان بەئەنقەست فەرامۆش کراون،ئەگینا دەوری حەمەی سان ئەحمەد زۆر لەوانە گرنگتربووە کەلەچەند لاوە ناویان هاتووە،ئەم قارەمانە یەکێك لەفڕۆکە جەنگیەکانی دەوڵەتی ئینگلیزی خستەوەتە خوارەوە،هەتاوەکو شایەر و شاعیران لەو ڕووەوە شیعریان پێدا وتووە:

حەمەی سان ئەحمەد سمێڵ چەخماخی

تەیارە شکێن لەحکومەت یاخی

[46] –صالح هاروونی:هاروونی لەمێژوودا،ل١٤٦

* –سەبارەت بەوەسمانی خاڵە خوسرەوجاف دەنوسێت:وەسمانی خاڵە سەرخێڵی یەزدان بەخشی بووە و لەسەردەمی حەمەپاشای جافدا ژیاوە و لەناو تیرەکەی خۆیدا خۆشەویست بووەو لەناو تیرەکانی دیکەی جافدا بەڕێزەوە ناوبراوە.خوسرەوجاف،ل١٩٢

* – سان ئەحمەد:یەکێکی دیکەی ناودارانی تیرەی یەزدان بەخشیە لەقۆناغی خۆیدا لەزۆر بواردا پرسی پێکراوە.خوسرەوجاف،ل١٩٣

[47] –ڕۆژنامەی شارەزوور:ژمارە(١٢)ساڵی دووەم،٢٠٠٦/٨/١٤

* ئەوەی ڕاستی بێت هەندێك نوسەر لەژمارەی ماڵەکانی گوندەکان کەوتونەتە زیادەڕەوی کردن،چونکە جێگەی بڕوا نیە هەریەك لەو گوندانە ئەو ژمارە ماڵەی تێدا نیشتەجێ بوبێ کەئەوان باسی دەکەن،ئەکرێت لەوە کەمتریان تێدا بوبێ نەك بەو هێندەی ئەوان دەیڵێن(نوسەر)–

[48] – عباس العزاوی المحامی: موسوعه عشائر العراق،الجلد الرابع،الدار العربیه للموسوعات،٢٠٠٥،ل٧٥

[49] – مەحمود عوزیز حەسەن:مێژووی هۆزی جاف و ژیانی تیرەکانی،ل١١٥–١١٦

[50] – مەحمود عەزیز حەسەن:هەمان سەرچاوە،ل ١١٦

*–شاری هەڵەبجە بۆیەکەم جارلەساڵی ١٨٨٩دا کرا بەقەزا لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی.

[51] – بەکر حەمەسدیق عارف: لاپەڕەیەك لەمێژووی هەڵەبجە(١٧٠٠–١٩٥٨ن)چاپی یەکەم،١٩٩٧،ل٢٣

[52] – ئەیوب ڕۆستەم:هەگبەو هەوارگە،ل١١٠.ئەیوب ڕۆستەم:گۆڤاری هەورامان،ژ(١٦)–٢٠٠٩،ل٣٦–٣٧

[53] – کۆچەر کەریم حەمە عەلی:سەرچاوەی پێشوو،ل٣٠٩

[54] – نادر ئینتسار:ئێتنۆنەتەوایەتی کورد،و:عەتاقەرەداغی،چاپخانەی تیشك،چاپی یەکەم،سلێمانی،٢٠٠٤،ل١١٢

[*] – عادیلەخان:کچی عەبدولقادربەگی کوڕی حەمید بەگی کوڕمەحمودبەگی کوڕی ئەحمەد بەگی ساحێبقرانە،لەساڵی ١٨٥٩ لەشاری سنەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان و پایتەختی میرنشنی ئەردەڵانیەکان لەدایك بووە،لەوێشەوە هاتووە بۆ شاری هەڵەبجە پاش ئەوەی کەشووی بە وەسمان پاشای کوڕی محمد پاشی جاف کرد،عادل صدیق عەلی:عادیلەخانم،بڵاوکراوەی مەڵبەندی کوردۆلۆجی،چاپی یەکەم،٢٠١٠،ل١٦

[٥٥] – بەکر حەمەسدیق عارف:لاپەرەیەك لەمێژووی هەڵەبجە(١٧٠٠–١٩٥٨)چاپی یەکەم،١٩٩٧،ل٦٤–٦٥

[٥٦] – عادل صدیق عەلی:عادیلەخانم:بڵاوکراوەی مەڵبەندی کوردۆلۆجی؛چاپی یەکەم،ل١١٤

[٥٧] – بەکرحەمەسدیق عارف:لاپەرەیەك لەمێژووی هەڵەبجە،ل٦٦–٦٧

[٥٨] – گۆڤاری کۆچ،ژمارە(٦)حوزەیرانی ٢٠٠٧،سەرحەد خەلیفەیونس:دەوری جاف و خەلیفە یونس لەشۆڕشی شێخ مەحموددا،ل٢٩٨

[٥٩] – ئەیوب ڕۆستەم: هەگبەو هەوارگە،ل١١٠

[٦٠] – سەلاح هەلاج: چەردەیەك لەمێژووی دەڤەری گەرمیان،چاپخانەی گەنج،چاپی یەکەم،٢٠١١،ل١٩٤–١٩٥

[٦١] – محەمەد ڕەسوڵ هاوار:شێخ مەحمودی قارەمان و دەوڵەتی خوارووی کوردستان،بەرگی دووەم،بلاك ڕۆز–لەندەن،١٩٩١، ل٥٦٦

[٦٢] – ئەحمەد خواجە:چیم دیی،بەرگی یەکەم،چاپخانەی شەفیق،بەغداد،١٩٦٨،ل٨٢

[٦٣] – ئەحمەد محەمەدباوەڕ:دۆزی کورد لەپەیوەندییەکانی عێراق–ئێراندا(١٩٣٧–١٩٤٧)،سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی،سلێمانی ٢٠١٠،ل٥٨

[٦٤] – سەلاح هەلاج:چەردەیەك لەمێژووی دەڤەری گەرمیان،چاپخانەی گەنج،چاپی یەکەم،٢٠١١،ل١٩٨

[٦٥] – ئەحمەد محەمەد باوەر:دۆزی کورد،سەرچاوەی پێشوو،ل٥٩

[*] – ئەم گوندە دەکەوێتە باکوری ڕۆژهەلاتی دووزخورماتوو وە بەبیست میل لەسنوری گەرمیان،ئەحمەدباوەر:دۆزی کورد،ل٦٢

[٦٦] – سەلاح هەلاج:سەرچاوەی پێشوو،ل٢٠٧–٢٠٨

[*] – ئەم شەڕە لەگوندی ئاوباریك لەڕێکەوتی ١٩٣١/٤/٥ڕوویدا ماوەی سێ شەو و سێ ڕۆژی خایاند،هەرچەندە عەشائیرە کوردەکان بەسەرۆکایەتی شێخ شکستیان هێنا بەڵام کوردەکان توانیان بەویەری تواناکانیانەوە لەشەرێکی نابەرامبەردا ڕۆڵێکی باش بگێڕن و مێژوو بۆخۆی تۆماری کات،

[٦٧] –ئەحمەد محەمەدباوەر:دۆزی کورد،ل٦٣–٦٤

[٦٨] – گۆڤاری کاروان:ژمارە(١٢)خولی راپەرین،ساڵی ١٩٩٤،ئەحمەدباوەر:شەڕی ئاوباریك و ستراتیجیەتی بەریتانیای گەورە لەکوردستان،ل١٧

* پێویستە لێرەدا ئەوە روون بکەمەوە ئەم دەقە لەسەرچاوەکەدا لای من کەمێك روون نیە چونکە نوسەر لەم دەقەدا ئامارەی بەساڵ نەکردوە کە بزانرێت مەبەستی ئەم دەقەلەپەیوەندی شەمێرانیەکان و شێخ دوای ساڵی ١٩١٩یە یان دوای ساڵی ١٩٣١،چونکە بەپێ دەقەکانی دواتر و رووداوەکانی ئەو سەردەم ئەم مەبەستەکانیان دەکەونە ساڵی ١٩١٩ و ساڵی ١٩٢٢ و ساڵانی دواترئەمەش ئەکرێت بەهۆی هەڵەی ساڵەکەوە بوبێت یانە هەڵەی رووداوەکە،وەلەهەمان کاتدا سەرچاوەیەکی ئەوتۆش نیە یارمەتی شەمێرانیەکانی بۆ شێخ مەحمود بەجوانی تۆمارکردبێت و ئەوەی هەیە بەشێوەی دەماودەمی هەیە،بەڵام گرنگ ئەوەیە شەمێرانیەکان وەك هۆزێکی جاف بەسەرکردایەتی حەمەی سان ئەحمەد هاوکاری شێخ بوون و ئینکاری لەوە ناکرێت(نوسەر)–

[٦٩] – حەکیم مەلاساڵح،هەڵەبجە لەئامێزی مێژوودا،ل٢٦٤

*– مەحمودی حەمەی سان ئەحمەد لەرێکەوتی ١٩٧٤/٣/٢٠کۆچی دوای کردووە.لەربارەی ئەم کەسایەتیەوە بەرێز خوسرەوجاف لەکتێبەکەیدا لاپەرە١٩٢ بەم شێوەیە باسی دەکات و دەنوسێت:من ئەو پیاوەم چەندین جار دیوە زۆرتر لەدیوەخانی داودبەگی جافدا لەشاری کرماشان،پیاوێکی زانا و لێزان و بەئەزموون و دنیادیدە و بەویقار و قسەحەق و قسەخۆش بووە،برێك قسەی بەلای (داود بەگی جاف)ەوە دەکرد کەسی دیکە نەیدەکرد و داودبەگیش رێزی لەبۆچوونەکانی دەگرت.

* – ئەوەی گرنگە بۆ مێژوو بوترێت ئەم نامانە هەموویان فەوتاون و شتێکی ئەوتۆ دەست نەکەوتووە لەو نامانە کەبزانرێت ئەو پەیامانە چی بوون لەنێوا ئەو دوو کەسایەتیەدا ئاڵوگۆڕکراوە

[٧٠] – گۆڤاری بەیان ژمارە(١٥١)کانونی دووەم،١٩٨٩،رەوف عوسمان:لاپەرەیەکی شکۆداری سەردەمی شێخ مەحمود،ل٢٠

*- لەراستیدا پێم وایە ئەمە هەڵەیە چونکە پێشتر حەمەی سان ئەحمەد و شەمیرانیەکانیش هیچ پەیوەندییەکیان لەگەل ئینگلیزەکاندا نەبوە کە شایەنی باسکردن بێت و تەنانەت خودی خانمی وەسمان پاشا دژایەتی ئەوانەشی کردوە کەدژی ئینگلیزەکانن، لەمەشەوە ئەکرێت پەیوەندی نێوان حەمەی سان ئەحمەد و خانمی وەسمان پاشا باش نەبوبێت چونکە حەمەی سان ئەحمەد بەهەموو شێوەیە دژی دەسەڵاتی ئینگلیزیەکان بووە و شەڕی لەگەڵ کردوون(نوسەر)

[71] – حەکیم مەلاساڵح:سەرچاوەی پێشوو،ل٢٦٥

[72] – ئەیوب رۆستەم: هەگبە و هەوارگە،ل١١١

* – فەقێ جنە ،ئەو سەردەمانە ناوەندی ناحیەی وارماوا بوو

[73] – محەمەد رەسوڵ هاوار:شێخ مەحمودی قارەمان و دەوڵەتی خوارووی کوردستان،بەرگی دووەم،چاپخانەی بلاك رۆز–لەندەن،١٩٩١،ل٥٧١–٥٧٢

* – نوسەری بابەتەکە دەڵێت کوێخای هەرچواردە ئاواییەکە ئامادەبوون بەڵام ئەو تەنها ناوی سیازدە کوێخای هێناوە یەکیان دیارنیە،

[74] – گۆڤاری بەیان،ژمارە(١٥١)کانونی دووەم،١٩٨٩،ل٢٠–٢١

[75] – حەکیم مەلاساڵح:سەرچاوەی پێشوو،ل٢٦٦

[76] – گۆڤاری بەیان ،ژ(١٥١) کانونی دووەم،١٩٨٩،ل٢١

[77] – ئەیوب رۆستەم: هەگبە و هەوارگە،ل ١١١

* – هەنێك لەسەرچاوەکان ژمارەی فڕۆکەکان بە(٢فڕۆکە)و هەندێ دیکەبە(٤فڕۆکە) و هەندێکی دیکەش بە(٥فڕۆکە) ژمارەیان دەکەن،بەڵام بەڕای مەن پێم وایە تەنها دوو فڕۆکە بوون، شەڕێکی لەو جۆرە پێوست بەوەناکات چوار فڕۆکە یان زیاتری بۆ بەکارهێنرابێت،

[78] – حەکیم مەلاساڵح:سەرچاوەی پێشوو،ل١٦٧

* – کاپتن لیز: ئەم کەسایەتیە لەئازاری ١٩١٩تاوەکو کانونی دووەمی ١٩٢١حاکمی سیاسی هەڵەبجە بووە

* – لەلاپەڕە سەدویازدەی کتێبی هەگبەوهەوارگەدا هاتووە( ئینگلیزەکان دەڵێن: ئەگەر فڕۆکەکەمان تەسلیم بکەنەوە لەبەرامبەر ئەوەدا لەو باجانەی لەسەرتانە دەتان بەخشین)

[79] – گۆڤاری بەیان،ژمارە(١٥١)،کانونی دووەم،١٩٨٩ل٢١

[80] بەکر حەمەسدیق عارف:سەرچاوەی پێشوو،ل٦٩

[81] – ئەیوب رۆستەم: هەگبە و هەوارگە،ل١١١

*– تەمورەژەنان: بریتیە لەبەرزایی ملەی دارێ کە نێوان بەشی پیرك و ئەورۆڵیدایە

[82] – گۆڤاری بەیان ،ژمارە(١٥١)،کانونی دووەم،١٩٨٩ل٢١

[83] – حەکیم مەلاساڵح:سەرچاوەی پێشوو،ل٢٦٨

[84] –ئەیوب رۆستەم،هەگبەوهەوارگە ،ل١١٢

[85] – کۆچەر کەریم حەمەعەلی:سەرچاوەی پێشوو،ل٣٠٩

[86] -گۆڤاری بەیان:ژمارە(151)کانونی دووەم،1989،ل21

[87] - رۆژنامەی شارەزوور،ژمارە(12) 14/8/2006

[88] - گۆڤاری بەیان:ژمارە(151)کانونی دووەم،1989،ل21

[89] - رەمزی قەزاز:بزووتنەوەی سیاسی و رۆشنبیری کورد،چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری-هەولێر،چاپی یەکەم،2008،ل225-226

[90] - کۆچەر کەریم حەمە عەلی:سەرچاوەی پێشوو،ل309

[91] - ئەیوب رۆستەم : هەگبە و هەوارگە،ل112

[92] - رۆژنامەی شارەزوور، ژمارە(12) ساڵی یەکەم،14/8/2006

[93] - شەوکەت حاجی مشیر: کارەساتی کیمیابارانی هەلەبجەبەهاری 1988،چاپی یەکەم،سلێمانی،1998،ل72

[94] - حەکیم مەلاساڵح: سەرچاوەی پێشوو،ل323-325

* - حەکیمی مەلاساڵح دەڵێت: دانزەئیمام ناوی دوو گوندە دەکەوێتە خۆرئاوایی شارۆچکەی سیروان،ل62

[95] - ئەیوب رۆستەم : هەگبەو هەوارگە،ل112

[96] - ئەم ناوانە لەلایەن بەرێز(سابیرئەحمەد عەبدولقادر)ەوە وەرگیراوە

[97] - شەوکەتی حاجی مشیر: سەرچاەی پێشوو،ل74

[98] - عومەرحاجی عینایەت:هەڵەبجەشاروشارستانیەت،چاپخانەی پیرەمێرد،چاپی یەکەم،2008،ل24

[99] - کۆچەر کەریم حەمە عەلی:سەرچاوەی پێشوو،ل309

* - ئەو ژمارەیەی بەرێز ئەیوب رۆستەم نوسیو یەتی ئەوە زانیاریەکە لەساڵی 2003دا تۆمارکراون بەرای من پێم وایە ئێستا سەرجەم گوندەکانی ناوچەی شەمێران لەوە کەمتر ماڵی تێدایە بەشێکی زۆریان هاتوونەتە شارەکان و لەوێدا نیشتە جێبوون و وازیان لەکاروباری گوندنشینی هێناوەو لەشاردا خەریك ژیانی خۆیانن(نوسەر)

[100] - ئەیوب رۆستەم:هەگبە و هەوارگە،ل112-113

[101] - هەورامان عەلی تۆفیق:هەڵەبجە-کارەساتی کیمیابارانی ساڵی 1988،چاپخانەی وەزاەتی پەروەردە،چاپی یەکەم،هەولێر،2000،ل76-77

# سەلاحەدینی ئەیوبی و جەنگی حتین

ئامادەکردنی: مسعود مستەفا بابارسول

## پێشەکی

بێگومان لە هەر کۆمەڵگایەکدا وە لە هەر سەردەمێکدا کەسانێك دەردەکەون کە توانای ئاراستەکردنی کۆمەڵگایان هەیەو دەتوانن سەرکردایەتی کۆمەڵگا بکەن، وە دەتوانن بە هەوڵ و هێزی ئەم کۆمەڵگایە ئامانجێك بەدی بهێنێت، جا ئەم ئامانجە ئایینی بێت یان ماددی بێت یاخود هەر ئامانجێکی تر.

بارودۆخی دەوڵەتی عەباسی لەم قۆناغەیدا بەرەو لاوازبونی ڕۆیشتبوو، وە لەگەڵ ئەمەشدا خاچیەکان دەستیان کردبوو بە هەڵمەتەکانیان بەرەو ڕۆژهەلات(جیهانی ئیسلامی بە گشتی) ئەمەش بە مەبەستی دەست بەسەراگرتنی ناوچەکانی تری سنوری دەوڵەتی ئیسلامی، هەروەها خاچیەکان لە ناوچەکانی ژێردەسەلاتیان سوکایەتیان بە موسڵمانەکان و حاجیەکانی بەتایبەتی دەکرد.

لەم کاتەدا هەبوونی سەرکردەیەکی موسڵمان بۆ بەرگریکردن لەم ئاینەو بەرگریکردن لە خاکی موسڵمانان زۆر پێویست بوو. دەرکەوتنی سەلاحەدین لە کاتێکی زۆر گونجاو بوو ئەویش بۆ بەرگریکردن و ڕزگارکردنی ناوچەکانی ڕۆژهەلات لەژێر دەستی خاچیەکان هەر ئەمەش وایکرد پاش چەندین هەوڵ و کۆشش کردن دژی خاچیەکان سەرئەنجام توانی لە شەڕی (حطین) لێهاتوویی و زیرەکی خۆی بەدەربخات و سەرکەوتن بەسەر خاچیەکاندا بەدەست بهێنێت، گۆڕانکارییەکی گرنگ بوو لە مێژووی ئیسلام و ناوچەکە، هەر ئەمەش وایکرد بۆ جاری دووەم (بيت المقدس) لە لایەن موسڵمانەکانەوە ئازادبکرێت، کە ئەم جارە

لەسەر دەستی سەرکردەیەکی کوردی موسڵمان بوو، هەر ئەمەش وایکرد سەرجەم ناوچەکانی ژێردەستی خاچپەرستەکان ئازاد بکات و دووبارە حوکمێکی ئیسلامی لەم ناوچە ئازادکراوانەدا پەیڕەوبکرێت.

سەرەڕای ئەم ئامانجانەی کە لە سەرەوە باسمان کرد بە خاڵێکی زۆر گرنگ بەدەردەکەوێت ئەویش شکاندنی هەیبەت و شکۆی خاچیەکان و شکاندنی بیرو باوەڕیشیان بوو، چونکە تاوەکو ئەو شەڕەش خاچیەکان (خاچی پیرۆز)یان دەبرد بۆ شەڕکردن بەو ئومێدەی کە دەبێتە هۆی سەرخستنیان لە شەڕەکاندا، بەڵام سەلاحەدین و سوپاکەی توانیان سەرەڕای ئازادکردنی شارو ناوچەکانی ژێردەستی خاچیەکان، لەگەڵ ئەوەشدا توانیان ژمارەیەکی لە میرو سەرکردەکانی خاچ دروشمەکان بەدیل بگرێت و دەست بەسەر (خاچی پیرۆز)یش دابگرێت، بەم سەرکەوتنەشی سەلاحەدین توانی گیانێکی نوێ بەبەر هێزی ئیسلامی و دەسەڵات و دەوڵەتی ئیسلامی بکاتەوەو داخێکی وەها لە دڵی خاچیەکان بکات کە تاوەکو ئێستاش ڕۆژئاواییەکان لەبیریانە، وە هەرچیەکیش بکەن بۆ تۆڵەکردنەوە لە موسڵمانەکان دەیکەن.

ئامانجمان لەم بابەتە ناساندنی کورتەیەکی ژیان و کەسایەتی سەلاحەدینی ئەیوبیە، هەروەها نیشاندانی ئەو هەوڵانەی (شەڕی حطین)بوو کە توانی دووبارە دەوڵەتی ئیسلامی بە شێوەیەکی زۆر باش زیندوو بکاتەوەو گەشەی پێبدات.

بابەتەکەشمان خۆی دەبینێتەوە لە دوو تەوەر، تەوەری یەکەمیان تایبەتە بە ژیان و ڕەچەڵەکی بنەماڵەی سەلاحەدینە، تەوەری دووومەمان پێکدێت لە هۆکارەکانی (شەڕی حطین)و دەرئەنجامەکانی.

وە ئەم کارەی کە هەستاوم بێ کەم و کوڕی نیە، هیوادارم لە سەرجەم ئەو هەڵانەی کە بەدی دەکرێت ببورن.

## تەوەرەی یەکەم

## ژیان و ڕەچەڵەکی سەلاحەدینی ئەیوبی

### باسی یەکەم/ ڕەچەڵەکی بنەماڵەی سەلاحەدینی ئەیوبی:

ئەیوبییەکان بنەماڵەیەکی کوردن لە خێڵی ڕەوادی، سەر بە هۆزی هەزبانییەکانن، شادی باپیرە گەورەی سەلاحەدین لایەنگری بنەماڵەی شەدادییەکان بوە لە هەرێمی(ئەرمینیا)، إبن خلدون لە پاش گەڕان بە دوای شوێنی نیشتەجێ بوونی شادی بۆی دەرکەوتووە کە لە گوندێك بون بە ناوی (ئەجدانقان)، بنەماڵەی شادی بەهۆی ئەو بارودۆخە خراپەی کە توشی هەرێمی (ئەرمینیا) بویەوە، بەتایبەتی لە لایەنی ئابوری و سیاسیەوە، کە ئەمەش بوە هۆی کە (شادی) باپیرەی ورەی سەلاحەدین بڕیاریدا ناوچەکە بەجێ بهێڵێت و ڕوویکاتە ناوچەکانی عێراق، لەم ماوەشدا (شادی) دۆستێکی هەبوو لە شاری بەغدا بە ناوی (مجاهدالدین بەهرۆز) کە پۆستی سەرۆکایەتی پۆلیسی شاری بەغدای بەدەستەوە لە سەردەمی دەسەڵاتداریەتی سەلجوقیەکان لە عێراق، بۆیە لە لایەن (بەهرۆز)ەوە پێشوازی لە شادی و بنەماڵەکەی کرا، وە پۆستی قەڵای(تکریت)ی دا بە شادی[1]. لە پاش مردنی شادی (مجاهدالدین بەهرۆز) پۆستی قەڵاکەی ڕادەستی کوڕانی شادی کرد بە ناوی (نجمدین ئەیوب، ئەسەدەدین شێرکۆ)، قەڵاکەیان بەڕێوەبرد، لەم ماوەیەدا بەهۆی ڕوودانی چەند ڕووداوێکەوە هەڵوێستی مجاهدالدین بەهرۆز بەرامبەر بە کوڕانی شادی گۆڕا، بەتایبەت لە کاتی ڕوودانی شەڕی نێوان (عیمادالدین زەنگی)و (خەلیفە مسترشید) ڕوویدا، وە لە شەڕەکەدا عیمادالدین زەنگی توشی شکست بوویەوەو پاشەکشەی کرد بەرەو ناوچەی تکریت، لەم کاتەشدا شێرکۆ کوڕی شادی یارمەتی (عیمادالدین زەنگی)دا تا لە ڕووباری دیجلە بپەڕێتەوەو کەشتی بۆ

ئامادەکرد تا ئەوەی ڕزگاری کرد، ئەم کارەی شێرکۆ بوە هۆی توڕەکردنی (مجاهدالدین بەهرۆز)، چونکە عیمادالدین زەنگی دوژمنی خەلیفەو سەلجوقیەکان بوو[2]. هەروەها دوای چەن ساڵێك شێرکۆ یەکێك لە پیاوانی دارو دەستەی بەهرۆز دەکوژێت، ئەمەش بەهۆی ئەوەی کە دەست درێژی کردە سەر ئافرەتێك، لەو کاتەشدا شێرکۆ بەویدا دەڕوات و ئافرەتەکە هاوار بۆ شێرکۆ دەبات، شێرکۆش ئەم سوکایەتیەی پێ قبوڵ ناکرێت و پیاوەکە دەکوژێت، ئەم کارەی شێرکۆ جارێکی تر بوە هۆی توڕەبونی بەهرۆز، لە هەمان کاتدا کوڕانی شادی لەم ماوەیەدا کە پۆستی قەڵای (تکریت)یان بە دەستەوە بوو، تاڕادەیەك کارەکانیان بە سەربەخۆیی جێبەجێ دەکرد، هەموو ئەم کارانە بوە هۆی ئەوەی کە مجاهدالدین بەهرۆز دژی کوڕانی شادی بوەستێتەوە، بەڵام بەهۆی ئەو دۆستایەتیەی کە لەگەڵ (شادی) هەیبوو، لێیان خۆشبوو، بەڵام پێی ڕاگەیاندن دەبێت قەڵای تکریت بەجێ بهێڵن، بۆیە هەر ئەو شەوەی کە (تکریت)یان بەجێ هێشت سەلاحەدینی ئەیوبی لەدایك بوو[3].

## باسی دووەم/ لەدایك بوون و ژیانی سەلاحەدینی ئەیوبی:

سەلاحەدینی ئەیوبی لە بنەماڵەیەکی کوردی لەدایك بووە، ناوی تەواوی (یوسف سەلاحەدین کوڕی نجمدین ئەیوب کوڕی شادی)یە، لە ساڵی(٥٣٢ك/١١٣٧ز) لە شاری تکریت لەدایك بووە، سەلاحەدین هەر لەو شەوەدا لەدایك بووە کە بنەماڵەکەیان شاری تکریتیان بەجێ هێشتوو ڕوویان کردە شاری موسڵ، پەیوەندیان بە (عیمادالدین زەنگی)یەوە کرد، ئەویش پێشوازی لێکردن و دڵدەی دان، چونکە عیمادالدین زەنگی چاکەو پیاوەتی کوڕانی (شادی) لە یادنەکردبوو، کاتێك لە تکریت یارمەتیان دابوو، بۆیە عیماالدین زەنگی پۆستی

بەڕێوەبردنی شاری (بەعلەبەگی) پێدان، ئەم شێوەیە درێژەیان بە دەسەڵاتی خۆیاندا لە شاری (بەعلەبەگ) تاکو مردنی عیمادالدین زەنگی لە ساڵی (٥٤١ك)[٤]. لە دوای مردنی عیمادالدین زەنگی ئەتابەگی دیمشق هێرشی کردە سەر شاری (بەعلەبەگ)، بۆیە نجمدین ئەیوب باکوکی سەلاحەدین کە زانی توانای ڕووبەڕووبونەوەی نیە لەگەڵ (ئەتابەکی) دیمشق بۆیە داوای ڕێکەوتنی کرد لەگەڵیدا، هەردوولا ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی کە نجمدین ئەیوب شاری (بەعلەبەك) ڕادەستی (ئەتابەك) دەکات، لە بەرامبەردا ئەتابەك (١٠)گوندی دەوروبەری دیمەشق بدات بە نجمەدین ئەیوب، بەم شێوەیە ڕێکەوتن و بنەماڵەی ئەیوبیەکان درێژەیان بە فەرمانڕەوای کردنی خۆیان دا لە دەوروبەری دیمەشقدا، لەم ماوەیەشدا سەلاحەدین کوڕی نجمدین ئەیوب، بەهۆی دەسەڵاتدارییەتی باوکیەوە بۆی هەبوو وەکو کوڕێکی والی یان فەرمانڕەوایەك سوود لە سەرجەم مامۆستا زیرەك و بەتواناکان وەربگرێت، وە سەلاحەدین هەر لە منداڵیەوە خراوەتە بەر خوێندنی زانستەکانی (قورئان و فەرموودەو خوێندنی کتێبە فقهی و شەرعیەکان)، لە هەمان کاتدا سەلاحەدین لە لایەن مامیەوە بەردەوام هەوڵی داوە کە فێری شمشێربازی و سوارچاکی و لایەنەکانی تری جەنگی فێربێت، بەم شێوەیە سەلاحەدین ئەیوبی توانی کەسێکی بە تواناو بیر تیژو گرنگی لێدەربچێت[٥]. وە هەر لەو کاتەی کە عیمادالدین زەنگی کۆچی دوایی کرد، دوو کوڕی هەبوو بە ناوی (سەیفەدین غازی)، (نورەدین محمود)، وە لەگەڵ هاتنە سەر دەسەڵاتی (نورەدین محمود) بنەماڵەی ئەیوبیەکان لایەنگرو دڵسۆزی خۆیان بۆ نیشانداوە، هەر ئەمەش وایکردووە کە نورەدین محمود (نجمدین ئەیوب و شێرکۆ)ی برای کرد بە دەسەڵاتدارو سەرکردەی سوپای خۆی، بەتایبەت شێرکۆی مامی سەلاحەدین یەکێك بوو لە سەرکردە سوپایەکانی نورەدین، هەر

ئەمەش هۆکار بوو کە سەلاحەدین هەر لە تەمەنێکی گەنجییەوە بچێتە ناو سوپاوە، وە یارمەتی مامی بدات لە دانانی پلان و تاکتیك بۆ جەنگ و هەروەها بەشداری کردنیشی لە جەنگدا، بەم شێوەیە سەلاحەدینی ئەیوبی لەگەڵ مامیدا بەشداری زۆربەی ئەو شەڕانەی کردووە کە مامی سەرکردەی سوپا بووە، بەتایبەت لە هەرسێ هەڵمەتی نورەدین محمود بۆ سەر مسر، سەلاحەدین بەشدار بووە، دواتریش وەکو بەڕێوەبەری شاری ئەسکەندەریە لە مسر ماوەتەوە، لە پاش ئەوەی کە شێرکۆی مامی پۆستی وەزارەتی فاتمی دەگرێتە دەست، سولحان زیاتر ڕۆڵی بەدیار دەکەوێت، وە لە دوای مردنی مامی سەلاحەدین پۆستی وەزارەتی فاتمی دەگرێتە دەست کە هێشتا لە تەمەنێکی گەنجیدا بوو، ئیتر لێرەوە سەلاحەدین هەوڵی چەسپاندنی دەسەڵاتی خۆی دەدات، وە هەوڵ دەدات بە لەناوبردنی سەرجەم ئەو پیلانانەی کە دژی دەسەڵاتی هەبون لە ناوخۆو دەرەوەدا، بۆیە سەلاحەدین لە دوای مردنی کۆتا خەلیفەی فاتمی کە ناوی (خەلیفە عاضد) لە ساڵی (٥٦٧ك)، سەلاحەدین بوو بە بەڕێوەبەرو دەسەڵاتداری یەکەم لە مسردا، ئیتر لێرەوە هەوڵدەدات بەرەو بنیادنانی دەوڵەتی ئەیوبی، بەم شێوەیە هەر لەو کاتەوەی کە سەلاحەدینی ئەیوبی دەسەڵاتی کردە دەست، خەونی ڕزگارکردنی قودس و ناوچەکانی موسڵمانان بوو لەژێر دەستی خاچپەرستەکان، بۆیە هەموو هەوڵێکی خستەگەڕ بۆ ڕووبەڕووبونەوەیان، تا ئەوەی توانی لە ساڵی (٥٨٣ك/١١٨٧ز)، لە شەڕی حطین توانی بەسەریاندا زاڵ بێت و شکستیان پێ بهێنێت، وە دووبارە دەسەڵات و هەیبەتی دەوڵەتی ئیسلام زیندووبکاتەوە[٦].

## تەوەرەی دووەم

## هۆکارەکانی شەڕی حگین و ئامادەکاریەکان بۆ شەڕ

### باسی یەکەم/ هۆکارەکانی ڕوودانی شەڕی حگین:

چەندین هۆکار هەبون بۆ ڕوودانی ئەم شەڕە لە نێوان سولّتان سەلاحەدین و خاچپەرستەکاندا کە خۆیدەبینێتەوە لە چەند خالّێکدا لەوانە:

١- هۆکاری سەرەکی ئەم شەڕە، شکاندنی بەندەکانی ئەو ڕێکەوتنامەی کە سەلاحەدین و یامۆند مۆریانکرد کە تیایدا پەیماننامەی ئاشتیان بەست بە چەند خالّێك، هەربۆیە لە ئەنجامی شکاندنی پەیماننامەکە لە لایەن (أرناط) ئەمیری (الکرك)، دەستی گرت بەسەر کاروانێکی بازرگانی سەر بە موسلّمانان لە سالّی (٥٨٢ك)[٧]. دەستی گرت بەسەر مالّ و سامانی بازرگانەکان و پیاو و ژنانی ناو ئەو کاروانەی بەدیل گرت هەرچەندە سولّتان سەلاحەدین پەیماننامەی بە بیری پاشای خاچپەرستان خستەوەو داوای لێکرد کە فەرمان بە (أرناط) بکات واز لە دەست درێژیەکانی بهێنێت، بەلاّم (أرناط) گوێی بە وتەکانی پاشا تەواو هەر بەردەوام بوو[٨]. سەرباری ئەوەش ئەرنات بەردەوام کاریدەکرد کە سود لە ڕێگای مصر و شام وەربگرێت، بۆ هێرشکردنە سەر کاروانی موسلّمانان، هەروەها دەیویست ڕێگای نێوان مصر و شام پەیوەندی نێوان ئەو دوو شارە ببرێت کە هێزی سەرەکی موسلّمانان بوو لەو کاتەدا[٩].

٢- هەروەها یەکێکی تر لە هۆکارەکانی ئەوەبوو کە (ئەرنات) جنێوی بە موسلّمانەکان و ئاینی ئیسلام دەدات وە سوکایەتی بە نێردراوی ئاینی ئیسلام دەکات، هەموو ئەمانە وایکرد کە سولّتان سەلاحەدین زۆر تورە بێت لەسەر کارەکانی ئەرنات و سوێندی خوارد کە بە ویستی خوا بیگرێت و بەدەستی خۆی بیکوژێت[١٠].

٣- یەکێکی تر لە هۆکارەکانی شەڕ ناکۆکی نێوان خاچپەرستەکان بوو، ئەم ناکۆکیەش دەرفەتی دایە دەست سوڵتان(سەلاحەدین) تاوەکو ئەوەی خواستەکانی خۆی بەدی بهێنێت وە ئەو ناوچانەی کە خاچپەرستەکان داگیریان کردووە لێیان وەرگرێتەوە(١١).

٤- هۆیەکی تری شەڕەکە ئەوەبوو کە خاچپەرستەکان جگە لە بیت مقدس، چەندین شاری تریان لە ژێردەستدابوو، هەربۆیە ئەم ناکۆکیە دەرفەتی دایە دەست سەلاحەدین بتوانێت بیان خاتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی(١٢).

## باسی دووەم/ ئامادەکاریەکان بۆ شەڕو دەست پێکردنی شەڕ:

### یەکەم/ ئامادەکارییەکانی هەردوو بۆ شەڕ:

#### أ- ئامادەکاری موسڵمانەکان:

سوڵتان سەلاحەدین کاتێك بینی کە لە لایەن خاچپەرستەکانەوە پەیمانی ئاشتی شکێنراوەو موسڵمانان ئازار دەدەن و گەمە بە ئاینی ئیسلام نەکەن، یەکسەر بڕیاری ڕووبەڕوو بوونەوەی دا بەرامبەریان، وە بڕیاری جیهادی دا، بۆ ئەم مەبەستەش پەیامی خۆی نارد بۆ سەرجەم ئەو میرانەی کە هەرێمەکانیان لە چوارچێوەی ئاینی ئیسلامدان، تاوەکو خۆیان و سوپایان شەڕی دژی خاچپەرستەکان بکەن، میرەکانیش هەموو بە یەك دەنگ بە دەم داواکەی سەلاحەدین هاتن بەرەو دیمەشق، کە مەڵبەندی سەرکردایەتی سوپای موسڵمانانی تیایدابوو، بۆ شەڕ دژی خاچپەرستان(١٣). لە دوای گەیشتنی سوپا سەلاحەدین لەگەڵ سەرکردەکانی سوپا کەوتە ڕاوێژکردن، هەندێك لە سەرکردەکان بە باشیان زانی شێوازی هێرشکردنیان بە شێوەی پەلاماردان بێت بە بەردەوامی، تاوەکو ئەوەی زیانیان پێ بگەیەنن، هەندێکی تریشیان ڕایان

وابوو کە شێوازی هێرشکردنیان ڕاستەوخۆ بێت بۆ لەناوبردن و چونە ناو خاکی خاچپەرستان بێت، سولتان سەلاحەدین بۆچونی دووەمی هەڵبژارد، هێرشی ڕاستەوخۆ بکەن بۆ سەر دوژمن، ئەمەش لەبەر زیرەکی سولتان بوو، چونکە دەیزانی کە ئەو سوپای کە لەبەر دەستیدایە لە هەرێمە دورو جیاوازەکانەوە هاتوون، سەربازەکان لەو سەردەم لەسەر شێوازی دەرەبەگایەتی دروست دەکرا، بۆیە سەربازەکان هەم کاری کشتوکاڵ و ئاژەڵداری خوێشیان دەکرد، بۆیە سولتان دەیزانی، ئەگەر شەڕەکە ماوەیەکی زۆر بخایەنێت، ئەوا سەربازەکان ناچار بۆ جێبەجێکردنی ئەرکی خۆیان ناچارن مۆڵەت وەربگرن، بۆیە بڕیاری هێرشی ڕاستەوخۆی دا[١٤]. وە سوپاکەی دابەشکرد بۆ سەر دووبەش، بەشێکی خۆی سەرکردایەتی دەکرد بۆ تەمێکردنی (ئەرنات) حاکمی (کەرك).

هەروەها پاراستنی ڕێگای کاروانی حاجیان و کاروانی بازرگانەکان کە لە مصرەوە هاتووە بۆ شام، دوای ئەوەی کە ڕێگای حاجیانی تەئمین کرد، فەرمانیدا کە هەرچی داری دەوروبەری کەرەك هەیە بیبڕن، وە ڕەوزو باخەکانیان بسوتێنێت بۆ ئەوەی دوژمن سودی لێ نەبینێت، پاشان ڕوویکردە کەرەك و هەمان کاریشی لەوێش ئەنجامدا، وە بەشی دووەمی سوپاکەی خۆی سەرکردەی بۆ هەڵبژارد، کە چەند سەرکردەیەك بوون، لەوانە (موزەفەرەدین کۆکبەریی) و(بەدرەدین دڵدارم کوڕی یاروقی میری دیمەشق) ئەم بەشەی سوپاکەی بەرەو (عەککا) نارد تا ڕێگەی لە ئەو سوپایە بگرن کە بۆ یارمەتی دانی میری کەرك دەڕۆن، هێرش بکەنە سەر موڵك و سەر بازگەکانیان و بێ هێزیان بکەن و نەخشەو پلانەکانیان ئاشکرا بکەن، ئەم هێزانە چوونە نزیك(سفورییە)[١٥].

### ب- ئامادەکارییەکانی خاچپەرستەکان:

خاچپەرستەکان هەرکەزانیان کە موسڵمانەکان سوپایەکی گەورەیان لەسەرجەم هەرێمە ئیسلامیەکان کۆکردوەتەوە مەترسیان لێ نیشت، ئەمە بوە هۆی ئەوەی کە خاچپەرستەکان بکەونە خۆیان و سەرجەم ناکۆکییەکانیان وەلاوە بنێن بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی موسڵمانەکان ببنەوە(١٦). بەم شێوەیە خاچپەرستەکان لە لایەن پاشای جای کە فەرمانی سەربازگیری دا بەسەر خەڵکدا، واتە هەموو ئەو کەسانەی توانای هەڵگرتنی چەکیان هەیە بیان هێنێتە ناو سوپاوە، بەم شێویە توانیان سوپایەکی گەورە کۆبکەنەوە، هەروەها بۆ کردنەوەی ورەی سەربازەکان (هنری پاشای) ئینگلترا بڕێك پارەی نارد بۆ پاشای جای تا دابەشی بکات بەسەر سەربازەکان و دڵ خۆشیان بکات، بەم شێوەیە هەردوولا خۆیان ئامادەکرد شەڕکردن لەگەڵ یەکتریدا(١٧). دوای نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە سوپای خاچپەرستەکان گەیشتنە ئەو بانەی کە یەکسەر دەڕوانێتە سەر (حطین) لەبەردەمیشیاندا گردێکی

### دووەم/ پلانی سەلاحەدین بەرامبەر خاچپەرستان لە شەڕی حتین:

سولتان سەلاحەدین بۆ ڕووبەڕوبونەوەی لەگەڵ خاچپەرستان هەوڵی دا سیاسەتێکی وا پەیڕەوبکات، کە بتوانێت سەربکەوێت بەسەر دوژمنەکانی، چونکە سولتان زۆر باش هەستی بە هێزی دوژمن دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا مەڵبەندنی خاچپەرستەکان لە شاری(سفورییە) بوو، کە ئەمانەش هەموو دەبونە هۆکاری گرنگ کەوا خاچپەرستەکان دەیانتوانی سەربازگەی باش بۆ ڕووبەڕووبونەوە دامەزرێنن، بۆیە سولتان ئەیزانی ئەگەر هێرش بکاتە سەر (سفوریە)، ئەوا خاچپەرستەکان ڕەنگە بتوانن زاڵ بن بەسەر موسڵمانەکان و

موسڵمانەکان بشکێنن[١٨]. بۆیە سوڵتان بیری کردەوە کەوا بیر لە کارێك بکاتەوە کە خاچپەرستەکان لە ناوچەی سفوریە بێنێتە دەرەوە، ئینجا شەڕیان لەگەڵدا بکات، ئەم مەبەستەی سوڵتان خۆیی دەبینیەوە لە دوو هۆکار، یەکیان تا ئەوەی سەربازەکانی خۆی لە ماندووبونی ڕێگای جەنگ و توانیویەتی ڕزگار بکات، دووەمیان تاوەکو ئەوەی خاچپەرستەکان لە ناوچەی سفوریە کە ناوچەیەکی گرنگ بوو بۆ شەڕکردن و بەرگریکردن بێنێتەدەرەوە، تا ئەوەی شەڕکردن لەگەڵیان ئاسانتر بێت[١٩]. بۆ ئەم مەبەستە سوڵتان سەلاحەدین بڕیاریدا هێرش بکاتە سەر (تەبەریە)، چونکە دەیزانی بەهۆی ئەو هێرشەیەوە، دەتوانێت ریمۆندی میری ترابلوس کە بەبێ ئارام ناسراوە، بورژێنێت، سەرباری ئەوەی سەلاحەدین دەیزانی بەهی هێرشکردنە سەر (تەبەرییە)، دەتوانێت دەست بەسەر هەموو ئەو ڕێگاو دەروازانەی تردا بگرێت، کە بە کەناری ڕۆژهەلاتیدا تەبەرییە تێدەپەڕێ و بە گەیشتنی بە ئاوەکە کۆتایی دێت، ئەمەش وا دەکات کە خاچپەرستان لە کاتی دەرچونیان بەرەو تەبرییە لە ناوچەی سەختدا جێگیردەبن کە ئاوی تێدانیە[٢٠].

سوڵتان سەلاحەدین لە ١٦ی ڕەبیعی دووەمی ساڵی (٥٨٣ك/١١٨٧ن)، لەشکرەکەی ئامادەکردو نوێژی هەینی کرد، موسڵمانەکان دوای نوێژ پاڕانەوە کە خوای گەورە سەریان بخات، وە لە ڕۆژی شەممەدا سەلاحەدین لە ڕووباری ئوردن پەڕییەوە، کە باشوری دەریای تەبەرییە دەکات، کردی بە سەربازگەی خۆی، دواتر سەلاحەدین هێرشی کردە سەر تەبەرییە و دەستی بەسەرداگرت، جگە لەو قەلایە نەبێ کە هاوسەری ریامۆندی وە کورەکانی تیادابوو[٢١]. دوای ئەوەی هەواڵی گرتنی (تەبەرییە) گەیشتە خاچپەرستان پاشای جای دوای کۆبونەوەی ئەنجومەنی جەنگی کرد، لە ئەنجومەندا هەندێکیان رایان وابوو کە ڕووبەڕووی

موسڵمانەکان ببنەوە، بەڵام ریمۆند فەرمانڕەوای (ترابلوس)، داوای لە پاشا کرد کە شوێنی خۆی جێ نەهێڵێت لە سفوریە بمێنێتەوە، هەروەها پێی وت کە تبریە شاری ئەم و خێزانەکەی تیادایە، وە ڕازیم بەوەیی خێزانەکەم و قەڵاکەش بگرێت، وە دووبارە باسی مەترسی ئەو سوپا گەورەیەی موسڵمانەکانی باسکردووە، بەڵام پاشاو هەندێ لە ئەندامانی ئەنجومەن دژی بڕیارەکەی ریامۆند وەستان، ئەمەش بەهۆی کاریگەری (ئەرنات و جیرار) کە پاشایان والێکرد سوپاکەی بباتە دەرەوەی سفورییەو ڕووبەڕووی موسڵمانەکان ببێتەوە[٢٢].

بەم شێوەیە خاچپەرستەکان سوپاکەیان ئامادەکردو (ریامۆند)یان کرد بە سەرکردەی سوپاکە بەرەو تەبەرییە کەوتنەڕێ، بە شێوەیەك کە هەم ڕیامۆند و هەم ژمارەیەکی زۆر لە سەربازەکان بە نابەدڵی دەڕۆیشتن بەرەو تەبەرییە، چونکە لە لایەك بەهۆی سەختی و دوری ڕێگاکەو هەبونی ئاو، چونکە سەربازانی سەلاحەدین بە بەرد بیرە ئاوەکانی سەر ڕێگای (تبرییە) پڕکردبویەوە لە لایەکی تر بەهۆی ئەو بۆسەو پەلامارانەی کە لە لایەن سوپایی موسڵمانانەوە بە تیرو کەوان دەکرایە سەر سوپاکەیان لە لایەنی مەعنەویان دابەزی بوو، ئەو هۆکارانەی کە باسمانکرد بونە هۆی ئەوەی کە پاشای جای ناچاربێت، کە بەر لە گەیشتنی بە تەبەرییە خێوەتی سەربازگەکەیان هەڵبدەن، بەم شێوەیە بەهۆی دووری ڕێگاوە بەرزی پلەی گەرما سەربازەکان و ئەسپەکانیان توشی ماندوبون و توێنیەتی هاتن، ئەمەش بوە ناڕازی بونی دوایی نیوەڕۆیی ئەو ڕۆژە سوپای خاچپەرستان گەیشتنە ئەو بانەی کە یەکسەر دەڕوانێتە سەر حەتین، لە بەردەمیشیاندا گردێکی بەردەلان هەبوو کە بە دوو لوتکەوە، کە بەرزاییەکەی (١٠)پێ دەبوو، دەیڕوانیە تەبەرییە، ئەم جێگایەش ناسراوە بە قۆچەی حەتین خاچپەرستان ئەو شەوە لەم شوێنە مانەوە، سەرباری نەبونی ئاو بەرزی پلەی

گەرما، لە هەمان کاتیشدا موسڵمانەکان لە بەرامبەر خاچ پەرستان وەستابون، لایەنی مەعنەویان زۆر بەرز بوو، خاچپەرستەکان ئەو شەوەیان زۆر بە خراپی بەسەربرد، بەم شێوەیە سولتان سەلاحەدین توانی سیاسەتێکی وا بەرامبەر خاچپەرستان نیشاندا، کەوایی لێکرد لە ناوچەی خۆیان بێننەدەرەوە، وە توشی ئەو بارودۆخە خراپەی کرد، بەم شێوە بۆ ڕۆژی دواتر شەڕ لە نێوان موسڵمانان و خاچپەرستان ڕوویدا[٢٣].

## سێیەم/ دەست پێکردنی شەڕی حگین:

ئەم شەڕە لە نێوان موسڵمانەکان و خاچپەرستەکان لە (٢٤ ڕەبیعی دووەمی ساڵی ٥٨٣ك/١١٨٧ز)، لە گردی حطین ڕوویدا[٢٤]. کە تیایدا موسڵمانەکان دوو هێرشیان کردە سەر خاچپەرستەکان، بەلام خاچپەرستەکان ڕووبەڕوویان بوونەوەو شکستیان پێ هێنان بەلام موسڵمانەکان بەردەوام بوون لە هێرشکردن بۆ جاری سێیەم توانیان سەرکەوتن بەدەست بهێنن بەسەر خاچپەرستەکاندا وە پاشاو میری کەرك و چەند فەرمانڕەوای تر دەستگیرکران لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە سەربازدا[٢٥]. بەم شێوەیە شەڕی حطین کێشەی لە ڕۆژهەلات یەکلاکردەوە لە نێوان موسڵمانان و خاچپەرستەکان، بەجۆرێك زۆربەی هێزەکانی خاچپەرستان شکان و لەناوچوون و بەشی زۆری بە دیل گیران، تەنیا ژمارەیەکی کەمی سەربازەکانیان ڕزگاریان بوو، ئەم سەرکەوتنەش دەروازەیەك بوو بۆ سولتان سەلاحەدین و موسڵمانەکان کە دواتر بتوانێت دەست بەسەر شارەکانی تری وەك (عەککا ، یافا ، مدیدا ، بەیروت ، عەسقەلان) بگرێت تەنیا شاری (صور) لە دەست خاچپەرستان مایەوە، ئەمەش بەهۆی ستراتیجی و گرنگی شا شارەکە بوو لە چواردەوردرا بوو، هەروەها بەهۆی قایمی قەلاکانی گرتنی ئاسان نەبوو[٢٦].

## باسی سێیەم/ ڕزگارکردنی چەند شارو قەڵایەك و ڕزگارکردنی قودس:

### یەکەم/ ڕزگارکردنی چەند شارو قەڵایەك:

لە دوای ئەوەی موسڵمانەکان لە شەڕی حطین سەرکەوتوو بوون، سولڵتان لە دوای یەك ڕۆژ ڕووی کردە قەڵای تەبەرییە، کە خێزانی ریامۆند تیادا، خێزانەکەی ریامۆند قەڵاکەی ڕادەستی سەلاحەدین کرد، بە مەرجێك نەیکوژێت، سولڵتانیش ڕازی بوو، بەم شێوەیە تەواوی تەبەرییە کەوتە دەست موسڵمانەکان، هەروەها ئەم سەرکەوتنەی موسڵمانەکان دەروازەیەك بوو بۆ سەرکەوتنەکانی تر، چونکە دوای ئەمە سولڵتان سەلاحەدین بەردەوام بوو لەسەر ئازادکردنی شارو قەڵاکانی موسڵمانان کە خاچپەرستەکان داگیریان کردبوو[٢٧]. سەرەتای ئەم ئازادکردنانەش خۆی بینیەوە لە ئازادکردنی شاری (عەککا)، بۆیە لە جەمادی یەکەم (٥٨٣ك/تەموزی ١١٨٧ز) سولڵتان بەرەو عەککا کەوتەڕێ و ئابلۆقەی شاری (عەککا)یدا، بەڵام (جوسلین کورتینای) سەروەری عەککا بوو، زانی ناتوانێت ڕووبەڕووی سوپاکەی سەلاحەدین ببێتەوە، نوێنەری خۆی نارد بۆ لای سولڵتان، وە پێی ووت ئامادەیە شار بەدەستەوە بدات، بەڵام بە مەرجێك دانیشتوانی فەرەنگ ئازار نەدات و سامانیان پارێزراوبێت، بە ئازادی شار بەجێ بهێڵن، سولڵتانیش ڕازی بوو، وە خاچپەرستەکان بەخۆیان و سامانیان دەستکەوت بۆ سەربازەکان[٢٨]. بەم شێوەیە سولڵتان توانی دەست بەسەر شاری عەککا بگرێت و ئەو چوار هەزار موسڵمانەی کە لەو شارە دیلی دەست خاچپەرستەکان بوون ئازادکرد[٢٩].

ئەو ڕۆژەی سەلاحەدین(عەککا)ی ڕزگارکرد ڕۆژی جومعە بوو، بۆیە موسڵمانەکان لەوێ لە مزگەوتێکدا کە خاچپەرستەکان کردبویان بە کڵێسا، نوێژی جومعەیان کرد، تێکڕا دووعایانکرد بۆ سەرخستنی موسڵمانەکان، تاوەکو

ئەوەی بتوانن نیشتمانەکەیان لە خاچپەرستان پاك بکەنەوە، بەم شێوەیە سوڵتان بەردەوام بوو لە ئازادکردن، وە لەو ماوەیەی کە لە (عەککا) مایەوە سوڵتان توانی چەند شارو قەڵایەکی تر ئازاد بکات و دەست بگرێت بەسەریدا، لەوانە(ناصرە، قیسارییە ، صەیدا ، نابلوس ، معلیا شقیف)، هەروەها توانی شاری (بەیروت، جوبەیل) ئازاد بکات، وە لەم ماوەدا سوڵتان نامەی نارد بۆ (مەلیك عادی برای کە لە مصرەوە هێرش بکاتە سەر خاچپەرستەکان، لە دوای گەیشتنی نامەی سوڵتان، مەلیك عادل تەواوی سوپاکەی کۆکردەوەو دەستی کرد بە هێرشکردنە سەر خاچپەرستەکان، و توانی شاری (یافا) ڕزگار بکات لە دەستیان[٣٠]. پاشان سوڵتان سەلاحەدین ڕووەو شاری عەسقەلان ڕۆیشت و گەمارۆیدا، ئەم شارە گرنگی تایبەتی خۆی هەبوو لە ڕووی ستراتیجیەوە، چونکە کەوتوەتە سەر ڕێگای نێوان مصر و شام، سوڵتان لەم هێرشەیدا دوو دیلی خاچپەرستەکان لەگەڵ خۆیدا برد، ئەوانیش (گردی لوسینان) بوو مەلیکی عەسقەلان، وە (جیرار) سەرکردەی سوپا بوو، سوڵتان پێشتر ئەم دوو سەرکردەی شارەی دەستگیر کردبوو، بۆیە ویستی لەگەڵ خەڵکی عەسقەلان ڕێبکەوێت بەوەی، ئەوان خۆیان بەدەستەوە بدەن لە بەرامبەردا مەلیك و سەرکردەی سوپاکەیان ئازاد دەکات، لە پاڵ ئەمەشدا سوڵتان داوای لە مەلیکەکەیان کرد کە پێیان بڵێت خۆیان بەدەستەوە بدەن، بەڵام لە بەرامبەردا خەڵکەکە سوکایەتیان بە مەلیکەکەیان کردو جوێنی ناشرینیان پێدا، وە گوتیان ئەوان بەردەوام دەبن لە پارێزگاریکردنی شارەکە، بۆیە گەمارۆی سەر شارەکەی توندتر کرد، پاش دوو هەفتە توانای خۆڕاگرتنیان نەما، بۆیە سوڵتان توانی لە سەرەتای ڕەجەبی (٥٨٣ك/١١٨٧ز) شاری عەسقەلان ئازادکرد، بەم شێوەیەش عەسقەلان چوە ناو سنوری دەسەڵاتی سوڵتان سەلاحەدینەوە[٣١].

## دووەم/ ڕزگارکردنی قودس:

سولّتان سەلاحەدین دوای ئەوەی توانی زۆربەی شارەکان لەژێر دەستی خاچپەرستەکان ڕزگار بکات، بەلاّم سولّتان هەولّیدا بۆ بەدیهێنانی ئاواتەکەی ئەویش ڕزگارکردنی (بیت مقدس) بوو، چونکە ئەم شارە لە لایەن موسلّمانەکان و هەم لە لایەن جولەکەکانەوە پیرۆز بوو، بەوەی یەکەم ڕووگەی (قیبلە)ی موسلّمانەکان و سێیەمین شاری پیرۆزە لە دوای مەکەو مەدینە[٣٢]. بۆیە سولّتان سەرەتا هەولّیدا کە ئازادکردنی شارەکە بە شەڕ نەبێت، تاوەکو ئەوەی زیان بە شارەکە نەدات چونکە شوێنێکی پیرۆزە، بۆ ئەم مەبەستەش سولّتان دەستەیەك لە پیاو ماقولانی نارد بۆ شاری (قودس) تا داوای ئەوەیان لیّ بکەن کە خۆیان بەدەستەوە بدەن، بەلاّم خاچپەرستەکان ئەم پێشنیارەیان ڕەتکردەوەو ڕازی نەبون پێی، بۆیە سولّتان ناچاربوو کە هێرش بکاتە سەر شارەکەو ڕزگاری بکات، بۆیە سوپاکەی خۆی کۆکردەوەو ڕووەو قودس بەڕیّ کەوتن، کە گەشتنە شارەکە سولّتان سوپاکەی بە چواردەوری شارەکەدا دابەشکردو گەمارۆی دا، دواتر دەستی بە هێرشکردنە سەر شارەکە کرد بە (مەنجەنیق)، توشی زیانێکی زۆری کردن، بۆیە خاچپەرستەکان نەیان توانی بۆ ماوەیەکی زۆر خۆیان ڕابگرن[٣٣]. بۆیە لە (٢٧ ڕەجەبی ٥٨٣ك/١١٨٧ز) خاچپەرستەکان شاری (قودس)یان ڕادەستی سەلاحەدین کرد، بە مەرجێك بەدیلیان نەگرێت، بەم شێوەیە شاری(قودس) ئازادکراو ئاوەتەکەی سولّتان سەلاحەدین هاتەدی، بۆیە سولّتان پاش ئازادکردنی قودسیش هەر بەردەوام بوو لەسەر ئازادکردنی شارو قەلاکان و توانی قەلاّکانی (سەور، بەرزییە، شقیف) ئازاد بکات[٣٤]. لەم ماوەیەدا ئەوەی مابویەوە لە دەست خاچپەرستەکان تەنیا شاری (صور) بوو، ئەمەش پێشتر وتمان بەهۆی گرنگی و ستراتیژی شارەکەوە نەتوانرا ئازاد بکرێت چونکە

زۆربەی لاکانی شارەکە بە ئاو دەورە درابوو، لە هەمان کاتدا بەهۆی هاتنی کەسایەتیەکی دەوڵەمەند بۆ شارەکە کە ناوی (کۆرناد دیل) بوو، خاچپەرستەکان کردیان بە میری خۆیان، وە سامانەکەی بۆ خەڵکەکەو پاراستنی شارەکە سەرفکرد، بۆیە ئازادکردنی ئاسان نەبوو بۆ سوڵتان، لە لایەکی تریشەوە سوڵتان نەیویست لە شەڕەکانیدا کوژراوی زۆر بێت، بۆیە شارەکەی بەجێ هێشت، هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە خاچپەرستەکان لەم شارەوە دووبارە لە قۆناغەکانی داهاتوودا بەردەوامی بە هەڵمەتەکانی خۆیان بدەن بۆ سەر شارە ئیسلامیەکان[٣٥].

بەم شێوەیە پاش چەند ساڵێك سوڵتان سەلاحەدین توانی زۆربەی ئەو شارانەی کە پێشتر لەژێر دەستی خاچپەرستەکاندا بوو، بیان خاتەوە ژێر قەڵەمڕەوی ئیسلام، تەنیا چەند شارێکی کەم نەبێت کە لە ژێر دەستیان مابویەوە وەك (قودس، صور) لەگەڵ چەند قەڵایەکی بچووك، بەم شێوەیە خاچپەرستەکان لەم ماوەیەدا لە دوای لەدەستدانی شارەکانیان، ڕوویان دەکردە شاری (صور)، کە شارێکی گرنگ و ستراتیژی بوو، بۆیە نەتوانرا ئازادبکرێت[٣٦].

## باسی چوارەم/ ڕۆڵی کورد لە شەڕی حگین:

لێرەدا دەتوانین باسی ئەوە بکەین کە کوردەکان بەردەوام بەشداری شەڕی ناموسڵمانەکانیان کردووە، بەتایبەت خاچپەرستەکان، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ دڵسۆزی کوردەکان بەرامبەر بە ئاینی ئیسلام و سەرخستنی ئاینەکە[٣٧]. هەر لەو کاتەی کە سوڵتان سەلاحەدین بانگی جیهادی دا دژی خاچپەرستەکان، بۆیە نامەی نارد بۆ سەرجەم ناوچەو شارەکانی سنوری ئیسلامی، وە نامەی بۆ کوردەکانی دیجلەی سەرو نارد بۆ بەشداری کردنیان لە جیهاد، کوردەکانیش بەدەم

بانگەوازەکەیەوە چوون و بەشداریان کردووە، بەتایبەتی لە بنەماڵە کوردیەکانی (هەکاری ، مەهرانی ، هەزبانی ، زەرزاری، حەمیدی)[٣٨]. بەپێی بەڵگەنامەکان شاری (شارەزور) لە ساڵێ (١١٨٧ز)دا لەژێر دەسەلاتی سوڵتان سەلاحەدیندا بوو، بۆیە کوردەکانی شارەزوریش بەشداری(شەڕی حگین)یان کردووە[٣٩].

لێرەدا دەتوانین ناوی چەند کەسایەتیەك بخەینەڕوو کە لە سوپای سەلاحەدین بون و بەشداری شەڕەکانی سەلاحەدینیان کردووە، بەتایبەت شەڕی حگین ئەوانیش وەك (زەینەدین) حاکمی شاری هەولێر بووە، هەروەها (جمال الدین زرزاری) کە لە شەڕی حگین شەهید بووە، هەروەها (فەقێ عیسای هەکاری)، هەروەها (خوشترین هەکاری) برای مشتوبی یارمەتی براکەی داوە تاوەکو یارمەتی سەلاحەدین بدات لە شەڕەکەدا، هەروەها (میر حوسێن مەهرانی)، هەروەها کوردە هەزبانیەکان بەشداری شەڕی حگینیان کردووە بەتایبەتی ڕۆڵی (مى ئەبوهیجاء هزبانی)، کە دواتر بوەتە حاکمی شاری قودس[٤٠]. بەم شێوەیە دەردەکەوێت کە کوردەکان بەشداری شەڕی حگینیان کردووە وە هەمیشە خاوەن هەڵوێست بون بەرامبەر هەر هێرش و ڕووبەڕووبونەوەیەك کە کرابێتە سەر ناوچەکانی سنوری ئیسلام، وە بەردەوام هەوڵیان داوە کە لە خزمەتی ئاینی ئیسلام و پاراستنیدا بن.

## باسی پێنجەم/ هۆکاری سەرکەوتنی موسڵمانەکان لە شەڕی حگین:

هۆکاری سەرکەوتنی موسڵمانەکان بۆ چەند خاڵێك دەگەڕێتەوە لە شەڕەکەدا لەوانە:

١- دابەزینی ورەی سەربازەکان ئەمەش بەهۆی نەبوونی شارەزایی لە ڕێگاو بان و هەروەها نەبوونی ئاو لەو ناوچەیەی کە سەربازگەیان تیا دروست کرد.

٢- هەروەها بەهۆی بەستنی ئەو هاوپەیمانیانەی کە بەستی لەگەڵ خاچپەرستان توانی سودی لێ وەربگرێت و خۆی ئامادەبکات بۆ شەڕەکە.

٣- سوڵتان سەحەلادین توانی سود وەربگرێت لە ناکۆکی نێوان سەرکردەی خاچپەرستەکان کە هەیان بوو لەسەر دەسەڵات.

٤- سوڵتان سەلاحەدین توانی دەوڵەتی ئیسلامی لەو کاتەدا یەك بخات سەرجەم ناوچەکان لەژێر یەك ئاڵا کۆبکاتەوەو شەڕ بکەن بۆ یەك ئامانج ئەویش دەرکردنی خاچپەرستەکان بوو لە ناوچەکانیان.

٥- کاریگەری ئاوهەوا سروشتی جوگرافی ناوچەکە، چونکە ئەم شەڕە لە مانگی تەموزدا کرا، خاچپەرستەکان لەسەر ئەم جۆرە ئاوهەوا گەرمە ڕانەهاتبوون.

٦- هەروەها لێبوردەیی سوڵتان لە کارەکانیدا، لە هەمان کاتدا ئەنجامدانی کارەکانی بە شوراو ڕاوێژ دەکرد لەگەڵ ئەنجومەنە سەربازییەکاندا[41].

دەرئەنجامەکانی شەڕی حتین:

١- سوڵتان سەلاحەدین بەهۆی ئەم شەڕەوە کە سەرکەوتوو بووە توانی چەند ناوچەیەکی گرنگی ئازاد بکات، وەك (عەسقەلان ، بەیروت ، یافا، عەککا ، نابلوس ...هتد)، تەنیا شاری صور بە دەست خاچپەرستەکانەوە مایەوە، ئەمەش بەهۆی بوونی ئەم شارە لەسەر ئاوبوو، هەورەها بوونی خەندەق قایم و بەهێز نەوانرا ئازادبکرێت.

٢- سەرکەوتنی موسڵمانان لەم شەڕەو ئازادکردنی زۆربەی ناوچەکان لە دەست خاچپەرستان، دەسەڵاتی سوڵتانی بەهێزترکرد، تاوەکو ئەوەی بتوانێت ئامانجەکە بەدی بهێنێت ئەویش ڕزگارکردنی قودس بوو لە (٢٧)ی ڕەجەبی (٥٨٣ك) توانی ئەم شارە ئازاد بکات.

٣- هـەروەها بـەهۆی بـوونی ئـەو زوڵـم و زۆرەی کـە خاچپەرسـتەکان بەرامبـەر موسڵمانەکان ئەنجامیان دەداو سـوکایەتیان بـە ئـاینی ئیـسلام دەکـرد، ئەمـەش بوە هۆی توڕەبوونی سوڵتان تاوەکو ئەوەی بەگژیاندا بچێت و لەناویان بدات.

٤- بـەتوانای سـوڵتان سـەلاحەدین لـە نەخـشە و پلانـەکانی شـەڕو، هـەروەها هەڵسەنگاندنی باوردۆخەکان و وردبین لەسـەر هـەر لایـەنێك کـە کاریگـەری بوایـە لەسەر سوپاکەی تاوەکو ئەوەی بتوانێت سەرکەوتوبێت لەو شەڕەدا.

## پەراوێزەکان

١- د.زرار صدیق توفیق، کوردو کوردستان لە رۆژگاری خیلافەی ئیسلامدا، چاپی یەکەم، چاپخانەی رۆژهەلات، (هەولێر: ٢٠١٠ز)، ل٣١٨-٣١٩.

٢- د.موحسین محمد حوسێن، ژیاننامەی پیاوە هەرە درەوشاوەکە سەلاحەددین ئەیوبی،چاپی دووەم،چاپخانەی ئاراس، (هەولێر: ٢٠١٢ز)، ل١١-١٢.

٣- سەرچاوەی پێشوو، ل٣٢٢-٣٢٣.

٤- عبدالله ناصح علوان، سەلاحەدینی ئەیوبی قارەمانی حتین رزگارکەری قودس، وەرگێرانی: باوکی عبدالله، چاپی یەکەم، (هەولێر: ٢٠٠٠ز)، ل١٢-١٤.

٥- د.موحسین محمد حوسێن، سەلاحەدین بدوێنین یان خۆمان بە پرسیاری بهێنین، وەرگێرانی: ئاواز فاتح، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئاراس، (هەولێر: ٢٠١٢ز)، ل٣٧.

٦- شوکرولای بابان، مێژووی کوردو کوردستان، چاپی یەکەم، چاپخانەی شڤان، ٢٠٠٢، ل١١٢-١١٣؛ عبدالله ناصح علوان، ل١٩-٢٠؛ عەلی کەندی، ئینسکلۆپیدیای مێژوونامە، چاپی دووەم، چاپخانەی رۆشنبیری و لاوان، (هەولێر: ٢٠٠٩ز)، ب١، ل١٨٣؛ محمد سوهێل تەقوش، پوختەی مێژووی ئیسلام، وەرگێرانی: نیهاد جلال، چاپی یەکەم، چاپخانەی دار الفکر، (لبنان: ٢٠٠٩ز)، ل٣١٢؛ عبدالله ناصح علوان، ل٢٣-٢٨.

٧- عبدالله ناصح علوان، صلاح الدین ئەیوبی قارەمانی حتین رزگارکەری قودس، ل٤٨.

٨- د.جفری برۆن، پوختەی مێژووی ئەورووپا لە کۆنەوە تا ئەمرۆ، وەرگێرانی: نیهاد جلال حبیب، چاپی یەکەم، چاپخانەی ناوەندی رۆشنبیری، ل٢٤٩.

٩- ئەحمەد محمود ئەلخلیل، کورد لە شارستانیەتی ئیسلامیدا، وەرگێرانی: زرار علی، چاپی یەکەم، چاپخانەی پەیوەند، (سلێمانی: ٢٠١١ز)، ل٣٠٨.

١٠- میر شەرفخانی بەدلیسی، شەرەفنامە، وەرگێرانی: م.هەژار، چاپی شەشەم، چاپخانەی پانێز، (٢٠١٣ز)، ل٩٩.

١١- محمد رجب بیومی، سەلاحەدینی ئەیوبی تێکشکێنەری خاچپەرستانی دوژمنکار، وەرگێرانی: محمد حسێن سەرکەنێلی، چاپی یەکەم، لە بلاوکراوەکانی تەفسیر، (هەولێر: ٢٠٠٩ز)، ل١٧١.

١٢- ئەحمەد محمود ئەلخلیل، کورد لە شارستانی ئیسلامیدا، ل٣٠٨.

١٣- موحسین محمد حوسێن، ژیاننامەی پیاوە هەرە درەوشاوەکە، ل٧٥-٧٦.

١٤- محمد علی الصلابی، صەلاحەدینی ئەیوبی، وەرگێرانی: جمیل قادر، چاپی یەکەم، چاپخانەی دار الفکر، بیروت، (لبنان: ٢٠٠٨ز)، ل٥٧١.

١٥- موحسین محمد حوسێن، ژیاننامەی پیاوە هەرە درەوشاوەکە سەلاحەدینی ئەیوبی، ل٧٦.

١٦- عباس عمر محمد، کوردە ئەیوبییەکان، وەرگێڕانی: چاپی یەکەم، چاپخانەی چوارچرا، (سلێمانی: ٢٠١٠ن)،

١٧- محمد علی صلابی، صەلاحەدینی ئەیوبی، ل٥٧٠.

١٨- د.موحسین محمد حوسێن، ژیاننامەی پیاوە هەرە درەوشاوەکە، ل٧٨-٧٩.

١٩- د.سعید عبدالفتاح عاشور، الحرکة الصلیبیة، طبعة الأولى، ج٢، ص٨٠٤.

٢٠- محمد علی الصلابی، صەلاحەدینی ئەیوبی، ل٥٧٣.

٢١- عباس عمر محمد، کوردە ئەیوبییەکان، ل٧١.

٢٢- إبن الاثیر، کامل في تاریخ، مطبعة دار الفکر، بیروت-لبنان، ج١١، ص٥٣٣.

٢٣- موحسین محمد حوسێن، ژیاننامەی پیاوە هەرە درەوشاوەکە، ل٨٠-٨١.

٢٤- ئەحمەد حمەأمین رەنجبار، صەلاحەدینی ئەیوبی لە لای مێژوونوسانی کورد، ل٢٧.

٢٥- هەمان سەرچاوە، ل٢٨.

٢٦- محمود شاکر، پوختەی مێژووی شارستانیەتیەکان، وەرگێڕانی: موسى محمد عبدالرحمن، چاپی یەکەم، چاپخانەی گەنج، (سلێمانی: ٢٠١١ن)، بەرگی دووەم، ل٥٥٢.

٢٧- عباس عمر محمد، کوردە ئەیوبییەکان، ل٧٥.

٢٨- موحسین محمد حوسێن، ژیاننامەی پیاوە هەرە درەوشاوەکە سەلاحەدینی ئەیوبی، ل٨٧.

٢٩- ئەحمەد حمەأمین رەنجبار، صەلاحەدینی ئەیوبی لە لای مێژوونوسانی کورد، ل٢٨.

٣٠- کوردە ئەیوبییەکان، ل٧٥-٧٦؛ سەرهەنگ شێخ لەتیف، کوردو نیشتمانەکەی، وەرگێڕانی: سامان عەبدوڵلا، چاپی یەکەم، چاپخانەی دەوەن، (سلێمانی: ٢٠١١ن)، ل٨٦.

٣١- ژیاننامەی پیاوە هەرە درەوشاوەکە صەلاحەدینی ئەیوبی، ل٨٨.

٣٢- کوردو نیشتمانەکەی، ل٨٦.

٣٣- سەرچاوەی پێشوو.

٣٤- شەرەفخانی بەدلیسی، شەرەفنامە، ل١٠١-١٠٢.

٣٥- عبدالله ناصح علوان، صلاح الدین ئەیوبی قارەمانی حتین، ل٥٦-٥٧.

٣٦- سەرچاوەی پێشوو، ل٧٦.

٣٧- پ.د.موحسین محمد حوسێن، سەلاحەدین بدوێنین یان خۆمان بە پرسیاری بهێنین، وەرگێڕانی: ئاواز فاتح جاف، چاپی دووەم، چاپخانەی ئاراس، (هەولێر: ٢٠١٢ن)، ل٣٧.

٣٨- لازاریف، مێژووی کوردستان، وەرگێڕانی: وشیار عەبدوڵلا سەنگاوی، چاپی پێنجەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، (هەولێر: ٢٠١٢ز)، ل١٠٤.

٣٩- د.زرار صدیق توفیق، کوردو کوردستان لە ڕۆژئاوای خیلافەی ئیسلامدا، ل٣٢٥-٣٢٦؛ لازاریف، ل١٠٤.

٤٠- سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٢-١٠٥.

٤١- محمد علی صلابی، صەلاحەدینی ئەیوبی، ل٥٨٢-٥٨٣.

## لیستی سەرچاوەکان


١- إبن أثیر، کامل في تاریخ، مطبعة دار الفکر، بیروت-لبنان، ج١١.

٢- د.سعید عبدالفتاح عاشور، الحرکة الصلیبیة، طبعة الأولی، ج٢.

٣- د.جفری برۆن، پوختەی مێژووی ئەوروپا، وەرگێڕانی: نیهاد جلال حبیب، چاپی یەکەم، چاپخانەی ناوەندی ڕۆشنبیری، ٢٠٠٩.

٤- سەرهەنگ شێخ لەتیف، کوردو نیشتمانەکەی، وەرگێڕانی: سامان عەبدوڵلا، چاپی یەکەم.

٥- شەرەفخانی بەدلیسی، شەرەفنامە، وەرگێڕانی: م.هەژار، چاپی شەشەم، چاپخانەی پانیز، ٢٠١٣.

٦- محمد علی صلابی، سەلاحەدینی ئەیوبی، وەرگێڕانی: جمیل قادر، چاپی یەکەم، چاپخانەی دار الفکر، بیروت-لبنان، ٢٠٠٨.

٧- عبدالله ناصح علوان، سەلاحەدینی ئەیوبی قارەمانی حتین ڕزگارکەری قودس، وەرگێڕانی: باوکی عبدالله، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٠.

٨- د.زرار صدیق توفیق، کوردو کوردستان لە ڕۆژگاری خیلافەی ئیسلامیدا، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١٠.

٩- د.محسین محمد حوسین، ژیاننامەی پیاوە هەرە درەوشاوەکە سەلاحەدینی ئەیوبی، چاپی دووەم، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٢.

١٠- عباس عمر محمد، کوردە ئەیوبیەکان، چاپی یەکەم، چاپخانەی چوارچرا، سلێمانی، ٢٠١٠.

١١- محمود شاکر، پوختەی مێژووی شارستانیەکان، وەرگێڕانی: موسی محمد عبدالرحمن، چاپی یەکەم، چاپخانەی گەنج، سلێمانی، ٢٠١١.

١٢- د.موحسین محمد حوسین، سەلاحەدین بدوێنین یان خۆمان بە پرسیاری بهێنین، وەرگێڕانی: ئاواز فاتح جاف، چاپی دووەم، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٢.

١٣- ئەحمەد حمدامین ڕەنجبار، سەلاحەدینی ئەیوبی لە لای مێژوونوسانی کورد، چاپی یەکەم، لە بڵاوکراوەکانی نارین، ٢٠١١.

١٤- لازاریف، مێژووی کوردستان، وەرگێڕانی: وشیار عبدالله سەنگاوی، چاپی پێنجەم، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٢.

١٥- حمەکەریم عارف، کورد لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا، چاپی یەکەم، چاپخانەی سەردەم، سلێمانی، ٢٠١٠.

١٦- ئەحمەد محمود ئەلخلیل، کورد لە شارستانیەتی ئیسلامیدا، وەرگێڕانی: زرار علی، چاپی یەکەم، چاپخانەی پەیوەند، سلێمانی، ٢٠١١.

١٧- محمد رجب بیومی، سەلاحەدین ئەیوبی تێکشکێنەری خاچپەرستەکانی دوژمنکار، وەرگێڕانی: محمد حسێن سەرکەلێنی، چاپی یەکەم، لە بلاوکراوەکانی تفسیر، هەولێر، ٢٠٠٩.

١٨- محمد سوهیل تەقوش، پوختەی مێژووی ئیسلام، وەرگێڕانی: نیهاد جلال، چاپی یەکەم، چاپخانەی دار الفکر، لبنان، ٢٠٠٩.

١٩- عەلی کەندی، ئینسکلۆپیدیای مێژوونامە، چاپی دووەم، چاپخانەی ڕۆشنبیری لاوان، هەولێر، ٢٠٠٩.

٢٠- شوکروڵلای بابان، مێژووی کوردو کوردستان، چاپی یەکەم، چاپخانەی شڤان، ٢٠٠٢.

# قەلاّی باستیل

ئامادەکردنی: ئیسماعیل ئیبراهیم ئیسماعیل

## پێشەکی

شۆڕشی فەڕەنسا وەك زۆرێك لە شۆڕشەکان لە کاتی ئومێد و ئارەزووە گەورەکاندا دەستی پێکرد، وا دەکەوتە بەرچاو کە سەرەنجام ئامانجەکانی سەردەمی ڕۆشنگەری دێنە دی، کۆمەڵگایەکی خوازراو لەسەر بنەمای عەقل و عەدالەت، بەڕاستی شیاو دەکەوتە بەرچاو هزرمەندە ڕووناك بینەکان لە سەرتاسەری ئەوروپا و هەروەها ئەمەریکا، بە ئومێدەوە چاودێریان دەکرد. ئارەزویان دەکرد کە شۆڕش نا عەدالەتی کۆمەلاّیەتی نەهێلێ، شۆڕشی فەڕەنسی شێکی زیاتر لە خوێنرێژی بۆ فەڕەنسا بە دیاری هێنا، بەلاّم زۆربەی خەڵکی سەرەتا بیر لەو هەزاران کەسە دەکەنەوە کە وەك ئەم پیاوانە بە داشقە بردنیانن و بە گیوتین کوشتنیانن نەزانی و خورافە پەرستنی کۆتایی پێبێنێ و مرۆڤەکان لە ژێر تیشکی ئازادی یەکسانی و برایدا بژین. بەلاّم شۆڕش دابەزی بۆ ئاستی خەباتێکی قورس و بێنەمان لە نێوان باڵەکاندا، کە لەودا هەر بالێك هەوڵی دەدا هەڵنجانی خۆی لەو کۆمەلگا خوازراوە بەسەر خەڵکی فەڕەنسادا بسەپێنێ. یەکێکیش لەو باسانەی ناو شۆڕشی فەڕەنسی ڕووخانی قەلاّی باستێلە بۆیە وەك قوتابیەك ویستومە لەسەری ڕاوەستم و توێژینەوەیەکی تێرو تەسەلی لە بارەوە بنووسم دیارە ئەم قەلاّیە زۆر پێش شۆڕش دروستکراوە بۆ کاری جیاواز بەکارهێنراوە بۆیە لێکۆڵینەوە لەسەری پێویستی بە ووردبینیەکی باش هەیە،

بۆیە ئەم توێژینەوەیە لە پێنج باس پێکهاتووە کە باس لە قەلاّکەو هۆکار و مێژووی دروستکردنی و فەرەنسای پێش شۆڕش و ڕاپەڕینی شاری پاریس و گرتنی و ئەنجامەکانی کەوتنی قەلاّکە پێکهاتووە.

## باسی یەکەم

## قەلاّی باستێل و هۆکاری دروستکردنی

### قەلاّی باستێل:

ناوی قەلاّی باستێل نیە، بەڵکو(باستید La Bastide)ـە، لە زمانی فەرەنسیدا وشەی(باستید) مانای قەلاّ دەگەیەنێت، بەلاّم لە زمانی عەرەبیدا وشەی (باستید) کراوە بە باستیل. ئەم قەلاّیە لە نێوان سالاّنی(١٣٧٠-١٣٩٠) وەك شورایەك بۆ بەرگریکردن و پارێزگاریکردنی بەشی ڕۆژهەلاّتی پاریس لە هێرشی سوپای ئینگلیزەکان دروستکراوە[١]. کە بە مانای جەورو ستەم دێت و چەندین کەسایەتی دیاری تێدا بەند کراوە وەك (ڤۆڵتێر و مۆنتسکیۆ)ی فەیلەسوف...هتد[٢].

بۆ پارێزگاری کردن لە سنوری فەرەنسا بە تایبەتی هەردوو دەرگای پاریس(سانت دینس) و (سانت مارتان) لە هێرشی دەرەکی و نەگەیشتنی دەستی دەرەکی بە پاریس و هەروەها سزادان و بەندکردنی ئەو ڕۆشنبیر و پیاوە ئاین و خانەدانانەی کە دژایەتی پاشا و دەسەلاّتەکەیان دەکرد وەك(ڤۆڵتێر-مۆنتسکیۆ) کە لە قەلاّی باستێل بەندکراون لەبەر ئەوەی لەگەڵ دەسەلاّت و جەورو ستەمەکانی پاشای فەرەنسا نەبوون و دژی دەوەستانەوەو هەوڵی چاککردنی بارودۆخیان دەکرد[٣]. وە چەندین کەسایەتی تری بەناوبانگ و ناوداری تێدا زیندانی کراوە وەك:

١- بیرمەندی گەورە (لی ڕۆشفۆکۆ La Rochefoucauld).
٢- مارشاڵ (ریشلۆ Richelieu) کوڕی کاردیناڵ (ریشلۆ)ی بەناوبانگ.
٣- دیمۆریین Dumouriez کە دواتر دەبێتە پاڵەوانی جەنگی (ڤالمیَ Valmy).
٤- (دایمان) ئەو کەسەی هەوڵیدا (لویسی پازدەم) تیرۆر بکات[٤].

**باسی دووەم**

## مێژووی دروستکردنی باستیل و زیندانیەکانی

لە سەردەمی پاشا (شارلی پێنجەم)و ساڵی (١٣٧٠) بەردی بناغەی باستیل لە لایەن پارێزگاری پاریس دانراوە، بەلام لە ساڵی (١٣٧٨) دەستکراوە بە دروستکردنی. باستیل هەشت قوللەی هەبوو، بەرزی هەریەکێکیان (٢٤)مەترەو پانیەکەی لە قاعیدەکەیەوە (٣)مەترەو لە لوتکەکەیدا تەسك دەبێتەوە دەبێت بە (٨٠) سانتیمەتر. دروستکردنەکەی (١٢)ساڵی خایاندووە (١٣٧٨-١٣٩٠)، لەو ماوەیەدا (شارلی پێنجەم)یش ئەوەی دروستکردنی باستیڵ تەواو ببێت، لە ساڵی (١٣٨٠)کۆچی دوایی کرد. کەواتە سەرەتای بیرکردنەوە لە دروستکردنی باستیل بۆ ئەوە بووە وەك قەلایەك بەرگری لە بەشی ڕۆژهەلاتی پاریس بکات، هەروەها وەك گەنجینەیەکی گەورەی عەمبارکردنی باروت و تۆپ و چەکی سپی بەکارهێنراوە[٥]. باستیل لە سەردەمی (لویسی چواردەهەم)دا وەك کۆشکێکی پاشایەتی مامەڵەی لەگەڵ کراوە و بووە بە بەشێك بە موڵکی پاشا، ئەم پاشایە لە ساڵی (١٦٦٧)دا فەرمانێکی شاهانەی بۆ فەرماندەی باستیل دەرکردووە، لە فەرمانەکەدا هاتووە باستیل کۆشکێکە لە کۆشکەکانی پاشایەتی، کاتێك باستیل لە قەلایەکەوە دەبێت بە کۆشکێکی پاشایەتی، ئیتر ڕاستەوخۆ پەیوەست بووە بە پاشاوە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی لە ئەستۆی خودی پاشا بووە[٦].

پاشا لە پارەی تایبەتی خۆی خەرجیەکانی باستیلی دابینکردووە، هیچ چاودێرێکی یاسایی بۆی نەبووە لەو ڕووداوانە بکۆڵێتەوە کە لە ناو باستیلدا ڕوویانداوە، کەس مافی ئەوەی نەبوو کە بزانێت لە پشت دیوارە ئەستورەکانی ئەو قەلا سەختەوە چی دەگوزەرێت و چۆن و بە چ شێوەیەك مامەلە لەگەل زیندانیەکاندا دەکرێت.

(لویسی یازدەهەم) یەکەم پاشا بووە باستیلی وەکو زیندانیەکی دەولەت بۆ زیندانیکردنی نەیارە سیاسیەکانی بەکارهێناوە، ئەوانەیان کە هەولیانداوە لە ڕێگەی پیلان و موئامەرەوە لە ڕژێمی دەسەلاتدار هەلگەڕێننەوە، ئەم پاشای کۆمەلێ قەفەزی ئاسنینی بۆ باستیل زیادکرد، ئەو قەفەزانە بە شێوەیەك دروستکرابوون زیندانیەکە نەیدەتوانی لە ناویدا بە پێوە بوەستێت، یەکەم کەس کە ئەو قەفەزانەی داهێنا ئەسقوفێك بوو، دواتر خودی ئەسقوفەکە بۆ ماوەی (١٤)سال لەناو ئەو قەفەزانە زیندانی کراوە، چونکە پلانێکی لە دژی پاشا دانابوو پاش ئەو ماوەیە ئازاد کرا. لە سەردەمی (لویسی یازدەهەم)ەوە لە باستیلدا ژووری تایبەت بە ئەشکەنجەدان هەبووە، ژوورەکان بۆ ئەوە نەبووە دانپیانان لە زیندانیەکان وەربگرن، بەلکو بۆ ئەوەبووە بۆ مردنیان ئامادە بکەن(٧).

لەو کاتەوەی باستیل لە قەلاوە کرا بە زیندان و بووە زیندانێکی تایبەت بە پاشاکان و ڕاستەوخۆ پەیوەست بوو بە پاشاوە، پاشا لە پارە تایبەتیەکەی خۆی خەرجیەکانی باستیلی دابینکردووەو ئەوەی تێیدا ڕوویداوە دووربووە لە یاساو چاودێری سیاسی. لە باستیلدا کاری لە سێدارەدان ئەنجام نەدراوە، بەلکو باستیل وێستگەیەك بووە بۆ لێکۆلینەوەو دادگاییکردنی سیاسی، پاشان زیندانیەکان لە باستیلەوە دابەشدەکران بۆ زیندانیەکانی دیکەدا، لە هەندێ حالەت و بارودۆخدا زیندانییەکە بۆ هەتاهەتایە لە دێرێکدا کە پاشا خەرجیەکانی

دابین دەکرد، زیندانی دەکرا. ئەوەی پەیوەستە بە لە سێدارەدانەوە ئەوە لە پێش شارەوانی پاریسدا پرۆسەکە ئەنجام دەدرا.

لە سەرەتای ساڵێ (١٦٩٥)، هەر زیندانیەك فایلێکی بۆ کراوەتەوە لەو فایلانەوە دەزانین زیندانیەکانی نێوان ساڵانی (١٦٩٥ بۆ ١٤ی تەموزی ١٧٨٩) ژمارەیان (٥٢٧٩)کەس بووە، لەو ژمارەیە (٢٣٢٠)کەسیان (٢٠١٦نێر، ٢٢٦مێ) لە ڕۆژگاری (لویسی چواردەهەم)دا گیراون. ١٤٥٩ کەسیان(١٢٣٣نێر، ٢٢٦مێ) لە سەردەمی کاردینالْ (فلۆری)دا گیراون. ١١٩٤ کەسیان(١٠١٩نێر، ١٧٥مێ) لە سەردەمی (لویسی پازدەهەم) گیراون. ٣٠٦ کەسیان (٢٧٤نێر، ٢٣مێ) لە سەردەمی (لویسی شازدەهەم)دا گیراون(٨).

## باسی سێیەم

## فەڕەنسای پێش شۆڕش

شۆڕشی فەڕەنسی تەنها بۆ فەڕەنسا ڕووداوێکی گرینگ نەبوو، بەڵکو لە بواری شارستانیەتی لە هەردوو سەدەکانی دواییدا لە ڕووداوە هەرە دیارەکانی ئەورووپاو دونیا بو، چونکە هەر بە ڕاستی خاڵی وەرچەرخانی بنەڕەتی بوو لە سیستەمی کۆمەڵایەتی و سیاسی لە ئەورووپا، سنووری بۆ سیستەمی پادشایەتی کۆن دانا کە لەسەر چەوساندنەوە بنیاتنرابوو، لە دەسەڵاتدا پشتی بە مافی خوودایی بەستبوو دەرگای سیستەمی ئازادی و کۆماری لە ڕووی جەماوەردا خستە سەرپشت کە لەسەر بنەمای ئازادی گەلان و یەکسانی لە نێوان تاکەکانی دا سەرچاوەی گرتبوو، کە دەسەلات لە هاوڵاتیەوە بێ و لە ژێر چاودێری ئەویشەوەبێ(٩).

ئەوەی فەرەنساو هەموو ئەورووپا بەدەستیەوە دەینالاند، بریتی بوو لە بالادەستی خانەوادەی پاشایەتی و حوکمی رەهایان، چینی دەست رۆیشتو دەستی بەسەر هەموو خێرو بێرێکی ولاتەکە داگرتبوو، لە لایەکی تریشەوە کلێسەکان بە ناوی ئایینەوە خاوەنی هەموو ئیمتیازاتێك بوون. لە هەموو خێرو بێرەکان سەرپشك بوون، لە باج و هەموو ئەرکەکانی بەرامبەر بە ولات بوردرابوون، سەبارەت بە تواناو چارەنوسی خۆی گەل خاوەنی هیچ دەسەلات و راو بۆچونێك نەبوو. ئازادیە گشتیەکان تەنیا لە خەیالی ئازادیخوازان بوونیان هەبوو، گەل هیچ جۆرە دەسەلاتێکی بەسەر سامان و چارەنوسی خۆیەوە نەبوو بۆیە شۆرشی فەرەنسی بۆ چارەسەری ئەو دەردانە لەدایك بوو و هەولی دا چارەسەرێك بدۆزێتەوە کە بۆ فەرەنسا و ولاتانی دیکە گونجاو بێت رووداوەکانی سەدەی نۆزدەهەم ئەوەیان سەلماند کە چۆن شۆرش بۆ گەلانی ماف خوراوی ئەورووپا بۆتە خوێندنگاو پێشەنگ لە بواری ئازادیخوازدا، بۆ بەرپەرچدانەوەی گەندەلی و چاکساز لە مەیدانی سیاسەت و کۆمەلایەتی دا کاری کردبوە سەر هەموو تویژێك. فاکتەرە بنەرەتیەکانی هەلگیرسانی ئەو شۆرشە ئەوەندە زۆر و تێك هەلکێشراون کە لە ژماردن نایەن زۆربەی هۆکارەکان دەگەرێنەوە بۆ بەر لە شۆرش و تەنانەت هەندێکیان بۆ سەردەمی لویسی چواردەم ئەو کاتەی فەرەنسا لەوپەری بوژانەوەو گەشەدابوو(١٠).

## باسی چوارەم

## راپەرینی شاری پاریس

ئەم ئامادەباشی و لادانی وەزیر و دانانی یەکێکی نزیك لە بنەمالەی لە شوێن ئەوو بلاوبونەوەی پروپاگەندەی ئەوەی گوایە پادشا بە نیازە ئەنجومەنی

نیشتیمانی هەڵوەشێنێتەوە ئەمانە هەمووی دڵەڕاوکێیان خستە ناو گەلی فەڕەنساو دەنگە دەنگ دەستی پێکرد(١١). لە حوزەیرانی ١٧٨٩دا (چینی سێیەم) گەیشتبوو بە مەبەستەکە، ئێستا ئەنجومەنێکی میللی هەبوو بەڵام خەڵك هێشتا برسی بوون، نرخی نان هەروا بەرزدەبوەوە و هەزارەکان ڕۆژانە بۆ دۆزینەوەی کار لە ناوچە گوندنشینەکانەوە دەهاتنە پاریس. لە تەموزی (١٧٨٩)دا، تا ڕادەیەکی زۆر نیوەی کرێکارەکان لە پاریسدا بێکاربوون و نرخی نانێك نیوەی کرێی ڕۆژێکی هەندێك لە کرێکارەکان بوو.

لە ١٢ی تەمووزدا ئاڵۆزیەکان پەرەیان گرت زۆرێك لە وەزیرەکانی پاشا دەیانویست پاشا جاك نیکر وەزیری دارایی لەسەر کار لاببات، کە پاشای هاندا بوو بۆ تەسلیم بوون بە خواستەکانی (چینی سێیەم). لویس سەرەنجام(نیکر)ی لەسەر کار لادا، بەڵام کاتێك هەواڵەکە گەیشتە پاریس، خەڵك تووڕەبوون خەڵك وەك قارەمان و هاوپەیمان چاویان لە(نیکر) دەکرد و دەتریان کە بەبێ ئەو وڵات لەگەڵ ئیفلاس ڕووبەڕووبێتەوە و کاروانانیش کەمتر بنەوە(١٢).

کامی دیمۆلین لاوێکی ڕەنگ پەڕیوو بێ هێز بوو، یاسای خوێندبو زۆربەی ژیانی لە فەڕەنسادا و لە هەژاریدا تێپەڕدەکرد بە نوسینەوەی بەڵگە گەلێکی یاسایی و نوسینی نامیلکە گەلێکی توندڕەوانە داهاتێکی کەمی بەدەست دەهێنا، دیمۆلین چووە پاڵ یەکێك لە بنکە سیاسیە نوێیەکان کە لە سەرانسەری پاریسدا لە حاڵی گەشەو نەش و نوما بوو، دیمۆلین لەوێدا لەگەڵ (میرابوو) یەکتریان ناسی.

لە ١٢ی تەمووزدا کاتێك کە هەواڵەکانی پەیوەست بە لادانی(نیکر) گەیشتە پاریس دیمۆلین هەستی کرد، هەلێکی گونجاوی بۆ هاتۆتە پێش. بەخێرایی چوبۆ(پالە ڕوایال) کە لەوێدا کۆمەڵێکی زۆر کۆببونەوە، پەڕییە سەر کورسی کافەیەك و ڕوو بە خەڵك هاواری کرد: (هاوڵاتیان دەزانن کە میللەت خوازیاری

مانەوەی نیکر بوو. و ئێستا لەسەر کاریان لابردووە! دوای ئەمە لە هیچ شوێنێك ڕاناوەستن. هەر ئەم شەو خەریکی دارشتنی پلانن.. بۆ قاتل و عامی نیشتمانی پەروەرەکان)).

دیمۆلین بە تەواوی توانای خۆی بۆ وروژاندنی هەستی خەڵك هاواریکرد: (چەکداربن، چەکداربن). لە بەرامبەر ئەم قەیرانەدا وەفدی هەڵبژاردنی پاریس گروپێك کە نوێنەرەکانی پاریسی بۆ ئەنجومەنی گشتی چینایەتی هەڵی بژاردوون. لە دەستپێکی ڕۆژی ١٣ی تەموزدا لە هوتێلی دوویل کۆبونەوەیەکی گرت و بڕیاریدا، کە هێزێکی شێوە نیزامی پێکهاتوە لە هاوڵاتیە باوەڕپێکراوەکان پێکبێنن. ئەم هێزە بۆ بەرگریکردن لە بەرژەوەندیەکانی خاوەن موڵك و ماڵەکان پێکهاتبو لە بەرامبەر سەربازەکانی پاشاو شۆڕشگێرەکانیش. بۆیە بڕیاردرا کە ئەندامەکانی نیشانەیەك بە ڕەنگی پاریس، سور و شین، لە کڵاوەکانیان بدەن(١٣).

## باسی پێنجەم

## گرتنی بەندیخانەی باستێل

لە ڕۆژی ١٤ی تەموزی (١٧٨٩ن)، هاوڵاتیانی پاریس هەوڵیاندا چەك بەدەست بهێنن و تا بەرگری لە خۆیان بکەن و بە کارێکی بەرز و بڵند و دلێری و نیشتیمان پەروەری خۆیان نیشان بدەن[١٤]. شۆڕشگێڕان کە ژمارەیان نزیکەی (٣٠)هەزار کەس دەبوو[١٥]. بە مەبەستی پەیداکردنی چەك سەرەتا پەلاماری کۆشکی (ئەنفالید)یان داو دەستیانگرت بەسەر نزیکەی (٢٨) هەزار تفەنگ و (٢٠)تۆپ[١٦]. و کۆشکەکەشیان تاڵانکردو ڕووخاندیان لە ناکاو یەکێك هاواردەکات و دەڵێت بەرەو باستێل ئیدی بەو چەك و تەقەمەنییەوە هێرشیان کردە سەر باستێل و داگیریانکرد[١٧]. ئەگەرچی لەو کاتەی کە (لویسی شازدەهەم) هاتبوە

سەر تەخت ئەو بەندیخانەیە زیندانی سیاسی لە خۆنەگرتبوو. بەڵام بەردەوام بە هێمایەك دادەنرا بۆ چەوساندنەوەو زوڵم و وە بە هەڕەشەش دادەنرا بۆ ئازادی پاریس[18]. ئەمە جگە لەوەی خەڵکی بەوەیان زانیبوو بەشێك لە تۆپەکانی ئەم قەڵایە ئاراستەی شەقام و گەڕەکەکانی (سانت ئەنتوان) کراوە کە گەڕەکێك بوو هەست و سۆز و ورەی شۆڕشگێڕانە تێیدا لە جۆش و خرۆشدا بوو[19].

پارێزەرانی بەندیخانە منداڵ بوون و دەترسان وە چەك و پێداویستی جەنگیشیان کەمبوو، وە بەڕێوەبەری بەندینخانەکەش دوودڵ بوو، بەڵام لە ماوەی چەند سانێکی کەمدا هێرشبەران دەستیانگرت بەسەر بەندیخانەی باستێل داو پاسەوانەکانیشیان کوشت کە زۆربەیان لە بەکرێ گیراوە سویسرییەکان بوون(٢٠). بەڵام هەندێ سەرچاوەی مێژوویی دەڵێ کاتێ شۆڕشگێڕان پەلاماری بەندیخانەی باستێل دەدەن. بەندیخانەکە تەنها لە لایەن (٨٠)کەسی فەڕەنسی، لەوانەی لە جەنگەکاندا سەقەت و گێڕ ببوون، (٣٠)سویسری(٢١). پارێزگاریان لە بەندیخانە کردووە ئەوەی گرتنی بەندیخانەکەی کەمێك سەختکردبوو. بەرزی دیوارەکانی بوو کە نزیکەی (٣٠)مەتر بەرزبووە، هەروەها ئەو خەندەقە پڕ ئاوەش بووە کە پانیەکەی (٢٥)مەتر بووە بە دەوری بەندیخانەکەدا لێدرابوو پاسەوانە سویسرییەکان دەیانویست بەرگری لە باستیل بکەن و خۆیان نەدەن بەدەستەوە، بەڵام پاسەوانە فەڕەنسیەکان کە کوڕو کاڵی فەڕەنسا بوون و ئازاری جەنگیان چەشتبوو، ئامادەنەبون بەرگری لە بەندیخانە بکەن. بۆیە داوایان لە بەرپرسی بەندیخانە و پاسەوانەکان کرد خۆیان بدەن بە دەستەوە(٢٢).

لەم سەروبەندەدا لە کاتژمێر یەکی پاش نیوەڕۆ هەژدە کەس لە شۆڕشگێڕان چونە سەر دیواری خانویەکی تەنیشت بەندیخانەکەوە لەوێوە خۆیان هاویشتە

ناو حەوشەی پێشەوەی باستیل. دوو پردی بزۆزیان داگرت بە سەدان کەس بەسەر ئەو پردانەدا پەڕینەوە بۆ ناو حەوشەکە، ئیدی زۆر بەخێرایی حەوشەی بەندیخانەکە پڕبوو لە خەڵکی شۆڕشگێڕ کە تەواو لە خۆیان دڵنیابوون سەردەکەون، سەربازە بێگانەکان گوللەبارانی پەلاماردەرەکانیان کرد پەلاماردەرەکانیش وەلامیان دانەوەو جەنگ دەستی پێکرد، سەربازەکان وا خۆیان حەشاردابو کە هیچ زەبرێکیان بەرنەدەکەوت و لە سەرەوەی قەلاکە بوون و شۆڕشگێڕەکانیش لە خوارەوەبوون و بۆیە کوژراو و برینداریان زۆر لێکەوتەوە، بۆیە ئەم زیانانە زیاتر ورەی خەڵکە پەلاماردراوەکەی بەرزکردەوەو تا دەهات پەلامارەکەیان چڕتر دەکردەوەو لە هەموو کوچەو گەڕەك و کۆلانێکەوە یارمەتی و کۆمەکیان بۆ دەهات. ئەو ناوە ئەوەندە قەرەباڵغ ببوو جمەی دەهات خەڵك پەلەیان بوو بۆ بەشداریکردن لەم کردەوە نیشتمیانیەدا شەڕ بە تەواوی گەرم بوو(٢٣).

لەگەڵ ئەوەی حەشیمەتەکە پردی چوونە ناوی باستیلیان داگیرکرد (وەفدی هەڵبژاردنی پاریس) کە بۆ خستنە ژێر چاودێری قەیرانەکە، کۆمیتەیەکی هەمیشەیی دامەزراندبوو داوایان لە(لونا)کرد کە تۆپەکان لەسەر دیوارەکان لابیات، لەبەر ئەوەی هەڕەشە بوون بۆ خەڵك و ئەگەر هێرشیان کرد، بەرگری نەکەن (لونا) قبوڵی کرد کە تۆپەکان هەڵبگرێ بەلام پێداگری کرد لەسەر ئەوەی کە تا کاتی مردن بەرگری لە باستیل دەکات(٢٤).

تۆپەکانیان هێنان و بەرەو پردی جولاوی دووەم دایان نان پاسەوانەکانی باستیل دەستیان کرد بە تەقاندن بەرەو خەڵکەکە، لونا بە سەرنج دان بە هەلومەرجە نا ئومێدکەرەکەی یاداشتێکی نارد بۆ سوپای فەڕەنسا و ڕەزامەندی خۆی بۆ تەسلیم بوون، بەو مەرجەی کە لەگەڵیدا وەك دیلێکی شەڕ ڕەفتار

بکرێت، پێیان ڕاگەیاند پردی جولاوی دووەم هێنرایە خوارەوەو جەماوەرەکە چوونکە ناو قەڵاکەوە ئەوان چەند سەربازێکیان کوشتن کە هێشتا چەکداربوون و حەوت دیلی باستێلیشیان ئازادکردن، بە گشتی نزیکەی سەد هاوڵاتی ئاسایی لە ڕەوتی ئەم هێرشەدا کوژران، وە لوناش گیرا هێنایانە ناو مەیدانەکەوە تا لە نێو حەشیمەتەکەدا بیبەن بۆ لای ئوتێلی دو ویل، بەڵام پاسەوانەکان نەیان توانی لە بەرامبەر تووڕەیی خەڵکەکە پارێزگاری لێ بکەن و لرنایان کوشت و سەریان بڕی و بەسەر دارێکیانەوە کرد. جەماوەرەکە سەرەبڕاوەکەی لرنایان هاوڕێ لەگەڵ دارێکی دیکەدا کە سەری کەسێکی بەدبەختی تری پێوەی بوو برد بۆ پالە روایان(٢٥). بە پێی قسەی هەندێ لە مێژوونوسان ئەو کاتەی باستیل ڕزگار دەکرێت، تەنها حەوت بەندکراوی تێدا بووە سێیان شێت بوون و تەنها دانەیەکیان گیراوی سیاسی بووە(٢٦). بۆیە کەوتنی باستێل ڕاگەیاندنێکی سەرکەشانەبوو بۆ ئەوەی کە پاریس نایەوێت ئەو دەستوورە لە دەست خۆی بدات، بەڵکو ئەوەی پاریسیش گەرەکیەتی دەبێ فەڕەنساش پێی ڕازی بێت، بەڵام لویس کاتێ گوێی لەو هەواڵەبوو تەنیا گوتی ئەوە کێشە و بەڵایەکی گەورەیە بەڵام دۆق (دی لینکۆر) وەڵامی دایەوە: (نەخێر گەورەم) بەڵکو ئەوە شۆڕشێکی گەورەیە(٢٧).

ئێستا بە تەواوی پاشایەتی کەوتووە داوەوە لە توانای دانەمابوو کە بەرگری لە برادەرەکانی بکات یان دوژمنەکانی لە ناوببات، پاشا وای لێهاتبوو بە هەموو شتێك ڕازی ببێت، سەربازەکانی ناچارکرد پارێزگاری لێ بکەن و وەزیرەکانی لە کارخست، و داوای لە (نیکەر) کردەوەو ڕایگەیاند کە میللەت دەستیان بەسەر باستێلدا گرتوەو خەڵکی توانیان بچنە نێویەوە پاش ئازادکردنی سێگۆشە ڕەنگاوڕەنگە نوێیەکەی کە (لافایت)ی ئازادکەری ئەمریکاو سەرۆکی

هەڵبژێردراوی پاسەوانی نیشتیمانی دایهێناوە کردیە سومبلی شۆڕش(٢٨). کە لە سێ ڕەنگ پێکهاتبوو سوور و شین(دوو ڕەنگی تایبەت بە پاریس بوون) وە سپی(ڕەنگێکی تایبەتی ئاڵ بۆربۆنەکان بوو) ئەوە بوە ڕەنگی ئاڵای فەرەنسای نوێ(٢٩). ڕووخانی باستیل لە زۆر ڕووەوە ڕەنگی دایەوە یەکێك لەم ڕەنگدانەوانە پاریس کەوتە ژێر دەستی شۆڕشگێڕەکان و دەسەڵاتی شارەوانیش کەوتە دەست ئەندامە ڕەسەنەکانی ئەم شارە کە لە ڕێگای پاسەوانە خۆجێیەکانەوە دەیان پاراست و بەڕێوەیان دەبرد، ئەم پاسەوانانە وەکو بناغەی سوپای شۆڕش وابون، لە دەرەوەی پاریسیشدا خەڵك ئەم ڕووداوانەیان وەکو دەستپێکی قۆناغی ڕزگاری دەبینی، لە هەرێمەکان هەژارو جوتیارەکان هێرشیان بردە سەر کڵێساو کۆشك و تەلاری شکۆدارەکان و هەندێکیشیان گرتێبەردەدەن(٣٠).

هەموو ڕق و کینەیان دژی ئەو کەسانە بوون کە کاربەدەستی باج و خاوەن ئیمتیازە کۆنەکان بوون هێرشیان بردە سەر فەرمانگەی باجەکان و هەموو کارنامەو کۆنوسەکانیان سووتاند، هەرچی دیمکۆمێنتێك هەبوون کە ڕێگەی بە پیاوە ئاینی و شکۆدارەکان دەدا ببنە خاوەن ئیمتیازات هەموویان سوتاندو گڕیان لە هەرچی دیکۆمێنت هەیە بەردا، فەرمانبەرانی دەوڵەت وەکو تەماشاکەر بەدیار ئەم ڕاپەڕینە جەماوەریە وەستابون، لە ترسی ئەوەی نەبادا ئەوەی بەسەری پاسەوانانی بەندیخانەی باستیلیان هێنا بەسەر ئەوانیش بێت، لە بەرامبەر بێ دەسەڵاتی دەوڵەت خەڵك لاسایی دانیشتوانی پاریسیان دەکردەوە لە دامەزراندنی سوپای شۆڕش و گرتنە ئەستۆی بەڕێوەبردنی کاروباری شارەوانی لە ڕێگای خەڵکی ڕەسەنی ئەو شارەوە(٣١). ڕووخانی پاریس کارەساتێکی مێژوویی مەزن بوو لە مێژووی جیهاندا، چونکە شۆڕشێکی جەماوەرانەی لە هەموو لایەکی فەرەنسادا هەڵگیرساند ڕژێمی کۆنی فەوتاندو

شوێنەواری دەرەبەگایەتی، پادشایەتی و زەمانی جیاوازی تێکشکاند، وە هەموو پادشاو ئیمپراتۆرەکانی ئەورووپای هێنایە لەرزە، بەمە فەرەنسا پەیرەوێکی تازەی پیشانی ئەوروپادا دوای ئەوەی کە ئەوروپا بە پادشایانی مەزن بەناوبانگ بوو، گەلێ کەس لە گەورەیی ئەم کارەساتە ئەندامیان دەلەرزی و هەندێکیش پێی شاد بوو(٣٢).

وە هیوایەکی دەدا بە دەرونی وە تا ئێستاش هەموو ڕۆژی ١٤ی تەمووز جەژنی نیشتیمانی فەرەنسایە(٣٣). ئەمەش تەواو بەڵگەی ئەوەبوو گەلی فەرەنسی چەند داخ لە دڵ و پڕ قینە بەرامبەر بە سەردەمی کۆن و دەسەڵاتی پاشایەتی و دارو دەستەکەی کە بۆ چەندین سەدەبوو دەیان چەوساندنەوەو سەرکوتیان کردبوون. پاشان شۆڕش دروشمی (ئازادی و یەکسانی و برایەتی) بەرزکردەوە، لێرەوە دوای ژانێکی دوورو درێژی پڕ ئازاد و ئەشکەنجە و نەبوونی و داماوی فەرەنسایەکی نوێ لەدایك دەبێت(٣٤).

## ئەنجامەکانی کەوتنی باستیل

١- بووە هۆی گۆڕانی ئاڵای فەرەنسا بە ئاڵایەکی نوێ کە لە سێ ڕەنگ پێکهاتبوو کە (سوور و شین و سپی) بوو.

٢- وە سووتاندنی هەموو دیکۆمێنت و بەڵگەنامە و ئەو نوسراوانەی کە مافی خانەدانەکانی تێدا دیاری کرابوون.

٣- جڵەوی دەسەڵات کەوتە دەست خەڵك و دەسەڵاتدارە ستەمکارەکانیان لادا.

٤- دەسەڵاتی پاشایەتی لەناوچوو.

٥- ڕۆژی ١٤ی تەمووز کرایە ڕۆژی نیشتیمانی فەرەنساز

٦- گەڕانەوەی نیکەر بۆ وەزیری دارایی ..هتد.

**پەراوێزەکان:**

١- ئینتەرنێت، ئینسکلۆپیدیا.

٢- کۆمەڵێك نوسەر، وەرگێر: هەرووەمان وریا قانع، سەدەکانی ناوەڕاست و دادگای پشکنین و شۆرشی فەرەنسی ١٧٨٩، ل٣٩٦.

٣- هەمان سەرچاوە، ل٣٩٤.

٤- ئینتەرنێت، ئینسکلۆپیدیا.

٥- کۆمەڵێك نوسەر، وەرگێر: هەرووەمان وریا قانع، سەدەکانی ناوەڕاست و دادگای پشکنین و شۆرشی فەرەنسی ١٧٨٩، ل٣٩٤.

٦- هەمان سەرچاوە، ل٣٩٥.

٧- کۆمەڵێك نوسەر، وەرگێر: هەرووەمان وریا قانع، سەدەکانی ناوەڕاست و دادگای پشکنین و شۆرشی فەرەنسی ١٧٨٩، ل٣٩٦.

٨- سەرچاوەی پێشوو، ل٣٩٧-٣٩٨.

٩- ئینتەرنێت، ولکیپیدیا.

١٠- عبدالعزیز سلیمان نەوار، عبدالمجید نەعنەعی، مێژووی هاوچەرخ ئەوروپا لە شۆرشی فەرەنسیەوە تا جەنگی جیهانی دووەمی جیهانی، وەرگێر: خالید هەرکی، چاپی سێیەم، چاپخانەی رۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٢، ل١٧.

١١- سەرچاوەی پێشوو، ل٢٩.

١٢- پاتریشیاد د.نێترلی، شۆرشی فەرەنسی، چاپی یەکەم، وەرگێر: هەژار رەحیمی، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، ل٥٩-٦٠.

١٣- سەرچاوەی پێشوو، ل٦٠-٦٢.

*- (پالە روایان) دوك ئورلئانی کورە مام و دوژمنی سیاسی پاشا لە پاریس سازی کردبوو کە بازاڕێکی سەر داپۆشراوی لەخۆگری کافەکان، دووکانەکان، شانۆخانەکان و چێشتخانەکان...هتد پێکهاتبوو.

١٤- جفری برۆن، پوختەی مێژووی ئەوروپا، وەرگێر: نهاد جلال حبیب الله، چاپی یەکەم، ٢٠٠٩، ل٤٠٩.

١٥- هەندێك سەرچاوە ئەم ژمارەیە بە (٣٠ یان ٣٥) هەزار دادەنێن.

١٦- لە کتێبی (قصە الحچارە) ئەم دوو ژمارەیە (٢٢)هەزار تفەنگ و (١٢)تۆپ دانراوە.

١٧- كۆمەڵێك نوسەر، شۆڕشی فەڕەنسی (١٧٨٩) هۆیەكانی بەرپابونی و دەسكەوتەكانی، وەرگێـڕ: هەورامان وریا قانع، چاپی سێیەم، چاپخانەی ڕەنج، ٢٠١٠، ل٦٩-٧٠.

١٨- محمود شاكر، پوختەی مێژووی شارستانیەتەكان، وەرگێڕ: موسا محمد عبدالرحمن -نهاد جلال حبیب الله، چاپی یەكەم، چاپەمەنی ڕەنج، بەرگی دووەم، ٢٠١١، ل٧٣٠.

١٩- سەرچاوەی پێشوو، ل٧٠.

٢٠- محمود شاكر، پوختەی مێژووی شارستانیەتەكان، ب٢، ل٧٣٠.

٢١- لە كتێبی (قصە الحچارە) ئەم دوو ژمارەیە هاتوە (٨٣) فەڕەنسی و (٣٢)سویسری بوون.

٢٢- كۆمەڵێك نوسەر، شۆڕشی فەڕەنسی(١٧٨٩) هۆیەكانی بەرپابونی و دەسكەوتەكانی، ل٧٠.

٢٣- سەرچاوەی پێشوو، ل٧١.

٢٤- پاتریشیاد د.نێترلی، شۆڕشی فەڕەنسی، ل٦٤.

٢٥- سەرچاوەی پێشوو، ل٦٥-٦٦.

٢٦- كۆمەڵێك نوسەر، شۆڕشی فەڕەنسی(١٧٨٩) هۆیەكانی بەرپابونی و دەسكەوتەكانی، ل٧٤.

٢٧- فیشەر، مێژووی نوێی ئەوروپا، وەرگێڕ: شوكر سلێمان، سەروینئەرجان، چاپخانەی ڕۆژهەڵات- هەولێر، ٢٠٠٩: ل١٨.

٢٨- سەرچاوەی پێشوو، ل١٨-١٩.

٢٩- محمود شاكر. پوختەی مێژووی شارستانیەكان، ب٢، ل٧٣١.

٣٠- عبـدالعزیز سـلیمان نـەوار، عبدالمجیـد نەعنـەعی، مێـژووی هاوچـەرخی ئـەوروپا لـە شۆڕشـی فەڕەنسیەوە تا جەنگی جیهانی دووەمی جیهانی، ل٤٠.

٣١- سەرچاوەی پێشوو، ل٤٠.

٣٢- جـواهر لال نـەهرۆ، چاوپێداخـشاندنێك بـە مێـژووی جیهانـدا، وەرگێـڕ: ڕۆوف محمـد زەهـدی، چاپخانەی زانكۆی صلاح الدین، ل١٤٢.

٣٣- سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٣.

٣٤- كۆمەڵێك نوسەر، شۆڕشی فەڕەنسی ١٧٨٩ هۆیەكانی بەرپابونی و دەسكەوتەكانی، ل٧٦.

## لیستی سەرچاوەکان

١- جفری برۆن، پوختەی مێژووی ئەوروپا، وەرگێڕ: نهاد جلال حبیب الله، چاپی یەکەم، ٢٠٠٩.

٢- جواهر لال نەهرۆ، چاوپێداخشاندنێك بە مێژووی جیهاندا، وەرگێڕ: رؤوف محمد زهدی، چاپخانەی زانکۆی صلاح الدین.

٣- فیشەر، مێژووی نوێی ئەوروپا، وەرگێڕ: شوکر سلێمان، سەروینەرجان، چاپخانەی رۆژهەلات، هەولێر، ٢٠٠٩.

٤- عبدالعزیز سلیمان نەوار، عبدالمجید نەعنەعی، مێژووی هاوچەرخی ئەوروپا لە شۆڕشی فەرەنسیەوە تا جەنگی جیهانی دووەمی جیهانی، وەرگێڕ: خالید هەرکی، چاپی سێیەم، چاپخانەی رۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٢.

٥- پاتریشیاد د.نێترلی، شۆڕشی فەرەنسی، چاپی یەکەم، وەرگێڕ: هەژار رەحیمی، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری.

٦- کۆمەڵێك نوسەر، وەرگێڕ: هەورەمان وریا قانع، سەدەکانی ناوەڕاست و دادگای پشکنین و شۆڕشی فەرەنسی ١٧٨٩.

٧- کۆمەڵێك نوسەر، شۆڕشی فەرەنسی(١٧٨٩) هۆیەکانی بەرپابونی و دەسکەوتەکانی، وەرگێڕ: هەورامان وریا قانع، چاپی سێیەم، چاپخانەی رەنج، ٢٠١٠.

٨- محمود شاکر، پوختەی مێژووی شارستانیەتەکان، وەرگێڕ: موسا محمد عبدالرحمن-نهاد جلال حبیب الله، چاپی یەکەم، چاپەمەنی گەنج، بەرگی دووەم، ٢٠١١.

٩- ئینتەرنێت، ئینسکلۆپیدیا.

# توێژینەوەیەك لەبارەی
# ئێران لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەفغانییەكاندا
# ١٧٢٢-١٧٢٩ز

ئامادەكردنی: دلزار صالح

## دەروازە

زۆربەی مێژوو نووسان پێیان وایە، كە سەردەمی شا عباسی یەكەم-گەورە ١٥٨٨-١٦٢٩ز، بەزێرین دادەنرێت" لەمێژووی دەوڵەتی سەفەوی، كە توانی ئێران بگەیەنێتە ئەوپەری بەهێزی و شكۆمەندی، ڕاستەوخۆ لەدوای مردنی شاعەباسی گەورە[١]. ولاتی ئێران بەرەو لاوازی و دواتریش ڕووخان دەڕوات،هەرچەندە ئەو ڕووخانەش سەدەیەكی خاید[٢]. ئەمەش بەهۆی ئەوەی كە زۆربەی ئەو شایانەی لەدوای شاعباسی یەكەم، هاتن كەسانی ناشایستەو لاوازبون و توانای بەڕێوەبردنی ولاتی پان و بەرینی سەفەوییان نەبوو[٣]. ئەمەش ڕێگا خۆشكەربوو بۆ ئەوەی ولات بەرەو لاوازی و دارمان بڕوات، لێرەدا لەگەڵ لاوازبوونی پێگەو دەسەلاتی شا، چەند دەسەلاتێكی تر سەرهەڵدەدەن و دەست لەكاروباری ولات وەردەدەن و یاری بە چارەنووسی شا لاوازەكانی سەفەویی دەكەن، ئەو دەسەلاتانەش بریتی بوون لە دەسەلاتی، گەورە زاناو مەلاكانی مەزهەبی شیعە و ژنانی كۆشكی شای سەفەوی، ئەمە سەرەڕای دەسەلاتی گەورە كاربەدەستانی دەوڵەتی سەفەویش، كە هەریەك لەمانە هەوڵی دەدا

دەسەلأتی خۆی فراوانتر بکات لەسەر حسابی شا ی سەفەوی بۆ بەدەستخستنی هەرچی زیاتری مەرام و بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیان[٤]. ئەمەش ڕێگا خۆشکەربوو، بۆ بڵاوبونەوەی گەندەڵی لەناو زۆربەی دام و دەزگاکانی دەولەتی سەفەوی، فرۆشتی پلەوپایەکان بەپارەو چەوساندنەوەی خەڵك لەلایەن کاربەدەستان و فەرمانبەرانی هەرێم ناوچەکانی دەولەتی سەفەوی، لاوازی هێزەکانی سەفەوی قزلباشەکان[٥] کە بڕبڕەی پشتی دەوڵەتی سەفەوی بوون، لەسەردەمی شائیسماعیلی یەکەم و شاعەباسی گەورە، کە بەوپەری دڵسۆزییەوە پارێزگارییان لەولأتی ئێران دەکرد لەبەرامبەر دوژمنەکاندا، بەلأم لەدوای ڕێکەوتنامەی زەهاو ١٦٣٩ز[٦]، سوپای ئێران قزلباشەکان[٧]. توانای پاراستنی ئەمنیەت وئاسایشی ولأتیان نمابوو بەهۆی بڵاوبوونەوەی گەندەڵی لەناو ریزەکانی سوپاو،،پشتگوێ خستنی دابینکردنی چەك و پێداویستی نوێی سەربازی لەلایەن شاکانی سەفەوییەوە[٨].

لە ئاکامی ئەم باروو دۆخەدا ولأت دووچاری نائارامی و پشێوی ببۆوە، بە هۆی نەمانی ئەمنیەت و ئاسایش لەسەرتاسەری دەولەتی سەفەویدا، چەوساندنەوەی خەڵك و کەمایەتییە ئایینیەکانی وەکو، جولەکەو زەردەشتی و سوننە مەزهەبەکان" وهەروەها سەرهەڵدانی دزی و جەردەیی و ناسەقامگیری ڕێگاکانی بازرگانی و هێرشکردنە سەر کاروانە بازرگانییەکان[٩].

ئەم دیاردەیەش، لەسەردەمی دوا شای بنەماڵەی سەفەوییەکان شا سوڵتان حوسێن ١٦٩٤–١٧٢٢ز، زیاتر بەزەقی دەردەکەوێت و پەرەدەسەنێت، شا سوڵتان حوسێن بۆ ماوەی نزیکەی ٢٨ ساڵ فەرمانڕەوایی ولأتی ئێرانی کرد " کە بەلاوازترین،و بێ تواناترین و ڕسواترین شا ناسراوە، لەمێژووی فەرمانڕەوایی بنەماڵەی سەفەوییەکاندا لە ئێران[١٠].

شاسولّتان حوسێن، ١١٠٥-١١٣٥ك /١٦٩٤-١٧٢٢ز،کوڕی گەورەی شا سلێمان بوو، کە هەندێك لەسەرچاوەکان پێیان وایە کە شا سلێمان، لە کاتی سەرە مەرگدا وەسیەتی کردبوو، کە لە حوسێن میرزا، یان عەباس میرزا، یەکێکیان هەڵبژێرن بۆ ئەوەی ببێتە شای ئێران کە لەوەسیەتەکەیدا دەڵێت: ئەگەر دەتانەوێ بە ئاشتی و ئارامی و خۆشگوزەرانی بژین، ئەوا حوسێن میرزا بکەن بە شا،وە ئەگەر حەزتان بە شکۆمەندی و سەربڵندی وڵاتی ئێرانە ئەوا عەباس میرزا بکەن بە شا، چونکە عەباس میرزا، سەرکردەیەکی سەربازی و سیاسەتمەدارێکی بەتوانا بوو، ئەگەر ببوایە بە شا لەوانەیە دەوڵەتی سەفەوی دووچاری ڕووخان نەبوایەوە[11].

بەڵام کاربەدەستان و وەزیرە گەندەڵەکانی دەوڵەتی سەفەوی، ئەوانەی کەحەزیان لەئارامی و خۆشگوزەرانی بوو" و جگە لەپاراستنی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیان گوێیان بە سەربڵندی و شکۆمەندی وڵات نەدەدا" حوسێن میرزا یان کردە شای ئێران، لە ساڵی ١١٠٥ك / ١٦٩٤ز، لە ژێر نازناوی (شا سولّتان حوسێن) ناسرا، کە تاکو ساڵی ١٧٢٢ز فەرمانڕەوایی دەوڵەتی سەفەوی کرد لە ئێراندا[12].

لەگەڵ هاتنە سەرتەختی شا سولّتان حوسێن، دەوڵەتی سەفەوی لە لاوازی بەرەو ڕووخانی هەتا هەتایی ڕۆیشت، شا سولّتان حوسێن، کەسایەتییەکی لاوازوو بێ توانا بوو، وەهیچ شارەزاییەکی لەبواری سیاسی و دەوڵەتدارییەوە نەبوو بڕوای بە ئەفسانە و خورافات هەبوو، شا سولّتان حوسێن" زیاتر سیفەتێکی مەلایی هەبوو لەوەی سیاسەتمەدار بێت[13]. تەنانەت ئەوکاتەی بووە بە شاش، دەڵێن ئەسپ سواریشی نەزانیوە، جارێکیان لێی دەگێڕنەوە کە لە باخچەی کۆشکی خۆیدا بە تفەنگ مراوی یەك ڕاودەکات، پڕ بەدەنگی خۆی هاوار

دەكات (" قانلو ئۆلّدم")" واتە دەستم تێكەڵ بەخوێن بوو، هەرلەبەر ئەوەشە زۆر جار بە گاڵتە پێیان گوتووە مەلا حسێن.

لێرەدا دەبینین،كە ڕۆلی پیاوانی ئایینی، بەشێوازێكی بەرچاو زیاد دەكات و دەسەلاّتیان زۆر دەبێت، و دەست وەردەدەنە ناو كاروباری دەوڵەتی سەفەوی، یەكێك لە بەناوبانگترین ئەو گەورە مەلایانەش، مەلا محمد باقری مەجلیسی[١٤] بوو. كە دەسەلاّتێكی یەكجار زۆری هەبوو، وە لەدوای خۆشی كوڕەكەی جێگای دەگرێتەوە، هەرچی لە شا سولّتان حسین، داواكردبووایە یان پێشنیار كردبووایە،ئەوا شا ڕەتی نەدەكردەوەو جێ بەجێی دەكرد، ئەمە سەرەڕای ئەوەی كەلەگەڵ سوننە مەزەبەكانی دەوڵەتی سەفەوی زۆر تووند بوون، هەر ئەم توندڕەوییە مەزهەبیەی سەفەوییە شیعەكان، وایكرد كەوا ئەفغانییە سوننەكان، لە دژی دەوڵەتی سەفەوی شیعەی ١٢ ئیمامی ڕاپەڕن و دواتریش بیڕوخێنن[١٥].

هەرچەندە مەلا محمد باقری مجلیسی، هەوڵیدەدا كەوا شا سولّتان حوسێن، لە كاری خراپەو هەوەس بازی ڕابواردن دوور بخاتەوە، بەلاّم زۆری پێنەچوو ژمارەیەك لە ژنانی حەرەم و كاربەدەستانی ولاّت شا حسین یان ئالّودەی شەراب خواردنەوەو ڕابواردن لەگەڵ ژنان كرد، تاكو بەئاسنی بتوانن دەست لە كاروباری ولاّت وەربدەن، محمد هاشم اصف، لە كتێبی، رستم التواريخ، ص٤٧، ئاماژەی پێكردووە شا حسێن، نزیكەی پێنج هەزار، ژنی شۆخ و شەنگ و جوانی هەبووە، بەهۆی سەرقالّبوونی شای سەفەویی بە ڕابواردن،و بێ ئاگابوونی لە بەڕێوەبردنی كاروباری ولاّت، بووە هۆی بلاّوبوونەوەی گەندەلّی لەناو داموو دەزگاكانی دەولّەت،وە تێكچوونی باروودۆخی سیاسی،ئابووری و كۆمەلاّیەتی وسەربازی، نەمانی ئەمنیەت و ئاسایش لە ولاّت و سەرهەلّدانی شۆڕش و ڕاپەرین لە ناوچە جیاجیاكانی دەولّەتی سەفەوی، لەدژی زوولّم وستەمی كاربەدەستانی سەفەوی[١٦].

لەڕووی سیاسی وئایینی یەوە دەوڵەتی سەفەوی، لەسەر بنەمای مەزهەبی شیعەی ١٢ ئیمامی توندڕەو دامەزرابوو،هەر بۆیە سیاسەتێکی لەڕادەبەدەر توندو تیژیان، بەرامبەر بە کەمە نەتەوەکان و مەزهەبەکانی، تری ناو دەوڵەتی سەفەوی پەیڕەو دەکرد، لەوانەش: سوننە مەزهەبەکان و، جوولەکەو زەردەشتیەکان، ڕۆژانە دووچاری زوڵم و ستەم دەبوونەوە، تەنها مەسیحیەکان نەبێ لە ئارامی دەژیان، ئەم سیاسەتەش لەسەردەمی شاسوڵتان حوسێن، زیاترپەرەی سەند[١٧]. سەبارەت بەلایەنی ئابووری و کۆمەڵایەتیشەوە، بەهەمان شێوە بارووددۆخی دەوڵەتی سەفەوی شلەژاو بوو، بە هۆی تێکچوونی ژێرخانی ئابووری، و زیادکردنی ڕێژەی باج و سەرانەی قورس لەسەرشانی خەڵك و بڵاوبوونەوەی گەندەڵی کارگێڕی و ئەخلاقی، لەناو دام و دەزگاکان و کاربەدەستانی دەوڵەتی سەفەوی ئەمە لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە نەمان و تێکچوونی ئەمنیەت و ئاسایش وبڵاوبوونەوەی دزی وڕێگری و هێرشکردنە سەر کاروانە بازرگانییەکان و گەشتیارەکان، تەنانەت زۆر جار ئەوسوپایەی کە ئەرکی پاراستنی ڕێگاوبانە بازرگانییەکانیان پێ سپێردرابوو، هەرخۆیان هێرشیان دەکردەسەر کاروانە بازرگانییەکان دەیان ڕووتاندنەوە[١٨].

لەڕووی سەربازیشەوە، سوپای دەوڵەتی سەفەوی قزلباشەکان، ڕۆحی یەتی سەربازییان لەدەستدابوو، توانای پارێزگاریکردن و پاراستنی سنوورەکانی وڵاتییان نەمابوو، لەبەرامبەر هەڕەشەو مەترسی دەرەکی و ناوخۆیی دا، بەتایبەتی لە دوای مردنی شاعباسی یەکەم" و بەستنی پەیماننامەی زەهاو ١٦٣٩ز نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی، کەبۆماوەی ٩٠ساڵ، بوو هیچ شەڕێکیان نەکردبوو" ئەمەش وایکرد بێ توانابن، جگە لە پشتگوێخستنی سوپا لەلایەن شاکانی سەفەویی یەوەو،ودابین نەکردنی چەك وتفاق وپێداویستی

سـەربازی بۆیـان، ئەمـەش وایکـرد سـوپای دەوڵـەتی سـەفەوی توانـای پارێزگاریکردنی وڵاتی نەمێنێ لەکاتی هەڕەشەو مەترسیدا[19].

دەکرێـت بڵـێین لەئـەنجامی ئـەو بارودۆخـەی، دەوڵـەتی سـەفەوی پێـدا تێدەپەڕی لەکۆتایی سەدەی ١٧ز، و سەرەتای سەدەی ١٨ز، زنجیرەیەك شۆڕش و ڕاپەڕین و دەنگی نارەزایی، لەناوچەکانی ژێردەسەڵاتی سەفەوی، بەرپادەبێت، لەناوچـەکانی گورجـستان، و ئازربایجـان، و ئەرمەنـستان، و ئەفغانـستان...[20]. بەهۆی ئەو زوڵم وستەمەی کاربەدەستانی سەفەوی، لە خـەڵکی ئەوناوچـانەیان، دەکرد وە یەکێك لەو ناوچانەی لەدەوڵەتی سەفەوی هەڵگەڕانەوەو، سـەربەخۆیی خۆیان ڕاگەیاند، والی عومان و بەحرەین سوڵتان بـن سـەیف[21]، کـە سـەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند لەدەوڵەتی سەفەویی، هەرچەندە سەفەوییەکان چەند هەڵمـەتێکی سەربازییان ڕەوانەکرد بۆ گەڕاندنەوەی ئەو ناوچانە، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون[22].

بەلووجەکانیش[23] بەهۆی گرانی و وشکەساڵی وقاتوو قڕییەوە، لـە ناوچـەکانی خوراسان شۆڕش و ڕاپەرینیان بەرپاکردوو هێرشیانکردە سەرناوچەکانی کرمـان، لار، بەندەرعەباس، هێزەکانی سەفەوی بەسـەرکردایەتی گـورگین خـان، توانیـان ڕاپـەڕینی بەلووجـەکان سـەرکوت بکەنـەوە، بـەڵام لەناوچـەکانی تـری دەوڵـەتی سـەفەوی شـۆڕش وڕاپـەڕینی ترسـەریهەڵدا" وەکـو ڕاپـەڕینی کوردەکـان لـە ناوچەکانی کوردستان و لوڕستان وشێروان لە دژی دەوڵەتی سـەفەوی، هـەروەها ڕاپەڕینی هۆزەکانی ئەفغانی غەڵزایی و ئەبداڵی" بەسەرکردایەتی مـیر مـەحمودی کوڕی وەیس لە ساڵی ١٧٢٢ ز، هێرشیانکردە سەر شاری ئەسـفەهان و دەوڵـەتی سەفەویی تەمەن ٢٢٢ ساڵەیان ڕووخاند[24].

## تەوەرەی یەكەم:-

## هێرشی ئەفغانییەكان بۆسەر ئێران،و ڕووخانی دەوڵەتی سەفەویی

### یەكەم:- بارودۆخی ئەفغانستان بەر لەداگیر كردنی ئێران.

### ڕەگ و ڕەچەڵەكی ئەفغانییەكان:

مێژوو نوسان، سەبارەت بە بنەچەو ڕەچەڵەكی ئەفغانییەكان، ڕاو بۆچوونی جیاوازییان هەیەو هاودەنگ نین، هەندێكیان پێیانوایە بۆ یەكەمجار ناوی ئەفغانییەكان وەك هۆزێك لەسالی ٩٨٣ز، هاتووە لە كتێبی ( حدود الحالم، مؤلف مجهول )" ئاماژەی بەشوێنی نیشتەجێبونی ئەفغانییەكان كردووە كەدەكەوێتە نێوان هندستان و غەزنە[١].

هەروەها مێژوونوسی ئەفغانی، ( فیض محمد كاتب هەزارە، كە لە سالی ١٣٣١ك، مردووە )، بەم شێوەیە باس لە سنووری ئەفغانستان دەكات و دەڵێت، ئەو شوێنەی كە ئێستا بە ئەفغانستان ناسراوە، لەسەردەمانی كۆن پێی گووتراوە كابولستان و زابولستان[٢]. بەڵام لەدوای گەیشتنی سوپای ئیسلام، ئەوناوچەیە دابەش دەبێتە سەردووبەشی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، كە ڕۆژئاواكەی لە شاری كابول و قەندەهار، تاكوو سنووری خوراسانی ئێران درێژدەبێتەوە،بەناو بانگترین شاریشی هیراتە" لە ڕۆژهەڵاتیشەوە لە زنجیرە چیاكانی ڕۆژهەڵاتی ڕووباری سند تا سنووری هیندستان، درێژدەبێتەوە[٣].

ناوی ئەفغانستان، ناوێكی نوێیەو زیاتر لەسەدەی ١٨ز،بەم ناوە ناسرا بەتایبەتیش لەدوای دامەزراندنی یەكەمین دەوڵەتی ئەفغانی لەلایەن دووڕانییەكانەوە ١٧٤٧-١٨١٨ز[٢٥]" بەڵكوو پێشتر ئەوناوچەیەی كەئێستا پێی دەگوترێ ئەفغانستان، بەشێك بوو لە خوراسانی بچوك[٢٦]" هەروەها ڕۆژهەڵاتی وڵاتی فارسیشی پێگوتراوە، ئەفغانییەكان لەڕووی شارستانییەوە زۆر

پێشکەوتوو نەبوون، ژیانێکی سادەو ساکارییان هەبوو، زیاترخەریکی بەخێوکردنی مەڕوومالآت و شوانکاری بوون لە هەمانکاتیشدا بەشەڕکەری وتالآنچێتی، ناوبانگییان دەرکردبوو بەتایبەتی کاتێك هێرشیان دەکردە سەرناوچە دەوڵەمەندەکان تالآنییان دەکرد[٤]. ئەفغانییەکان، کە لەچەند هۆزێکی جۆراوجۆر پێکدەهاتن، تاکۆتایی سەدەی ١٧ز، سەرەتای سەدەی ١٨ز، دەوڵەتێکی تایبەت بەخۆیان نەبوو، بەڵکوو کەوتبوونە نێوان دوو ئیمپڕاتۆریەتی گەورەی ئەوکات" ئیمپڕاتۆری مەغۆلی لەهیندستان،و ئیمپڕاتۆری سەفەویی لەڕۆژهەلآت[٢٧].

بە هەمان شێوە هۆزەئەفغانییەکانیش لە نێوان ئەم دوو ئمپراتۆریەتەدا،دابەش ببوون،وەکوو هۆزەکانی ( هەزارە، تیمانی، چهار ئیماخ، ئۆزبەك،...) کە لە شاری کابوولوو ناوچەکانی دەوروبەری نیشتەجێ بوون، سەربەدەوڵەتی مەغۆلی بوون" شاری هیراتیش سەربە دەوڵەتی سەفەوی بوو، شاری قەندەهاریش کە چەند هۆزێکی تێدانیشتەجێ بوو، بەلآم لەهەموویان بەهێزتر هۆزەکانی غەلزایی بوو، ئەم شارە ببووە جێگای شەڕوململانێ لەنێوان هەردوو ئیمپڕاتۆریەتی سەفەوی و هیندی مەغۆلی[٢٨].

کەهەندێ جار لە ژێردەستی مەغۆلیەکان بوو، وە هەندێ جاریش لەژێر دەستی سەفەوییەکان بوو، بەلآم شا عەباسی یەکەم، توانی لە سالّی ١٦٢٢ز، ئەم شارە بەیەکجاری بیخاتە سەر دەوڵەتی سەفەوی، ئیتر لێرە بەدواوە والی و فەرمانبەرانی ئەم شارە، لەلایەن شاکانی سەفەوییەوە دادەنران هەروەها لەڕووی ئایینی شەوە، زۆربەی هۆزە ئەفغانییەکان موسڵمان، بوون، لەسەر مەزهەبی سوونەی حەنەفی بوون،و بە زمانی فارسی قسەیان دەکرد، تەنها هەزارەییەکان[٢٩]، نەبێت شیعە مەزهەب بوون. ئەم جیاوازییە مەزهەبیەی

ئەفغانییەکان لەگەڵ دەوڵەتی سەفەوی و زوڵم و زۆری حاکم و بەرپرسەکانی سەفەوی، وایکرد کەوا راپەڕین و شۆڕش بەرپابکەن و بێن دەوڵەتی سەفەوی لەناو ببەن لەساڵی١٧٢٢ز، بەهۆی ئەو زوڵم وستەمەی کەلێیان دەکرا لەلایەن فەرمانبەرو کاربەدەستانی دەوڵەتی شیعەی سەفەوییەوە[٢٠].

## شۆڕشی هۆزی ئەفغانی یە غەلزاییەکان:

ئەفغانییە غەلزاییەکان، کەلە شاری قەندەهار و دەوروبەری نیشتەجێ بوون، ژیانێکی سادەو ساکارو نیمچە کۆچەرییان هەبوو، زیاتر خەریکی شوانکاری و بەخێوکردنی مەڕومالات بوون، لەڕووی سەربازیشەوە ئازاو شەڕکەر بوون، بەردەوام ململانێ و شەڕیان لەگەڵ ناوچەکانی دەوروبەریان هەبوو لەوانەش هۆزی ئەبدالی[٣١] کە لەشاری هێرات نیشتەجێبوون. بەلام کاتێك شا عەباسی یەکەم لەساڵی ١٦٢٢ز، دەستی بەسەر شاری قەندەهار داگرت، ئیتر ئەم شارە بووبە بەشێك لەدەوڵەتی سەفەوی و حاکم و کاربەدەستانی، لەلایەن دەوڵەتی سەفەوییەوە بۆ دادەنرا، کەزۆرجار ئەم بەرپرسانەش خەڵکیان دەچەوساندەوەو زوڵم و ستەمیان لەخەڵکی ئەم شارە دەکرد، کەئەمەش وایکرد چەندین شۆڕش وراپەڕین لەلایەن هۆزی غەلزاییەکانەوە، لەدژی دەوڵەتی سەفەوی بەرپابێت[٣٢].

شاسوڵتان حوسێن ١٦٩٤–١٧٢٢ز، کەسێکی بەناوی عەبدوڵڵا خان، لەساڵی ١٦٩٨ز، کردە والی شاری قەندەهار، ئەویش سیاسەتێکی توندوتیژی بەرامبەر بەخەڵکی شاری قەندەهار پەیڕەو دەکردو دەیچەوساندنەوە، ئەم سیاسەتەش بووە هۆی راپەڕینی هۆزە بەلووچەکان،و غەلزاییەکانی، شاری قەندەهار، بەسەرکردایەتی میرسەمەندەر[٣٣]، لەساڵی ١٧٠٣ز، توانییان دەست بەسەر

شــارەکەدا بگــرن، شاســولّتان حوســێن، ســوپایەکی بــە مەبەســتی سەرکووتکردنەوەی ڕاپەڕینەکەوگێڕانـەوەی شـاری قەنـدەهار ڕەوانـەکرد، بـە سـەرکردایەتی گـورگین خـان[٣٤]، لێرەدا گـورگین خـان تـوانی بەسـەرکەوتووانە کارەکەی ئەنجام بدات،وڕاپەڕینەکە لەناوببات ودواتـر لەسـالی ١٧٠٤ز، لـە لایـەن شاسولّتان حوسێن کرایە والی شاری قەندەهار[٣٥].

گورگین خان، هەرچـەندە سـەرکەوتوو بـوو لـە سـەرکوتکردنەوەی ڕاپـەڕینی هۆزەکـانی، بـەلووچ و غـەلزایی یـەکانی شـاری قەنـدەهار، بـەلاّم نـەیتوانی سەرکەوتوو بێت لەڕاکێشانی ئەفغانییـەکان، بـەلای خۆیدا،ئەمـەش بـەهۆی زولّـم وستەمەی لەخەلّکەکـەیان دەکـرد، سـەرەڕای وەرگـرتنی بـاج وسـەرانەیەکی زۆر لەخـەلّکی و چەوسـاندنەوەیان،لەلایەن، گـورگین خـان و سـەربازە گـورجی یەکانەوە،جگـە لـەوەی کـە گورجییـەکان لـەڕووی ئایینیـەوە مەسـیحی بـوون، ئەفغانییـەکانیش موسـلّمان بـوون، لەهەمانکاتـدا بەرپرسـی پۆلیـسی شـاری قەندەهار کەسێك بوو، بەناوی میر وەیس کـوڕی شـاعالەم[٣٦]، کەسـەرۆکی هـۆزی هوتـەکی–غـەلزایی بـوو، لەشـاری قەنـدەهار، وخـاوەن پێگەیـەکی جـەماوەری بەهێزبوو،کاری بازرگانی لەگەڵ هیندستان، ئەنجام دەدا وە زۆرهەوڵیدا کەوا بـەر لەزولّم وستەمی گورگین خان، وسەربازەگورجیەکان، بگرێت وچەندین جار نامەی نـاڕەزایی بـۆ شـای سـەفەوی، دەنـارد سـەبارەت بـە ستەمکاری گـورگین خـان، سەربازانی گورجی، دەرهەق بە خەلّکی شاری قەندەهار، ئەنجامیان دەدا[٣٧].

بەلاّم بەهۆی بێ ئاگایی شـا سـولّتان حوسـێن، لـەکاروباری ولاّت و سـەرقالّ بـوونی بـەڕابواردن و خۆشـگوزەرانی یـەوە، بـوونی کاربەدەسـتانی گـورجی، لەدەرباری شای سەفەوی، نەیاندەهێشت شا چاوی بە سکالاّکانی خەلّك بکەوێت" لەئەنجامی ئەمەدا خەلّکی قەندەهار، لەسـالی١٧٠٦ز، بەشـەکردایەتی میروەیـس،

ڕاپەڕین لەدژی گورگین خان والی سەفەوی شاری قەندەهار، بەڵام گورگین خان، توانی ڕاپەڕینەکە سەرکووت بکاتەوەو، میر وەیسیش، دەسگیر بکات و ڕەوانی شاری ئەسفەهانی کردوو تیایدا ئاگاداریکردنەوە، کەوا میر وەیس، کەسێکی مەترسیدارەو،پێویستە چاودێری بکرێت و،ڕێگای پێنەدرێت کەبگەڕێتەوە بۆ شاری قەندەهار[٣٨].

بەڵام میر وەیس، کەسێکی زیرەك وبەتوانابوو" ئەوکاتەی گەیشتە ئەسفەهان نەك هەرتەنها توانی خۆی ئازاد بکات، بەڵکوتوانی لەڕێگای دانی بەرتیل خۆی بگەیەنێتە شای سەفەوی و نارەزاییەکانی خەڵکی قەندەهار و زوڵم وستەمی گورگین خان و سوپاکەشی، بگەیەنێتە شای سەفەوی شاشی لێهان بدات میر وەیس، توانی بەبیانوی حەج کردن بچێتە مەککەو لەوێش چاوی بە زانایانی ئایینی سوننە مەزهەب، بکەوێت و فەتوای حەڵاڵکردنی شەڕ( جیهاد )" لەدژی دەوڵەتی شیعەی سەفەوی بەدەست بێنێت، داوی حەجکردن و بەدەستهێنانی فەتوای شەڕ کردن لە دژی دەوڵەتی سەفەوی شیعە مەزهەب، میر وەیس، گەڕایەوە بۆ ئەسفەهان لەساڵی ١٧٠٨ز، ئەوکاتە باروو دۆخی ئەسفەهان شڵەژاو بوو، بەهۆی ئەوەی کەوا ڕووسەکان، نوێنەرییان ناردبووە ئەسفەهان و هەوڵیان دەدا کەوا لە ڕێگای بازرگانی لەگەڵ ئێران، بگەنە هیندستان وکەنداو، بەڕێگای دەریای قەزوین[٣٩].

لێرەدا میر وەیس بەزیرەکی خۆی، توانی خۆی بگەیەنێتە شای سەفەوی سوڵتان حوسێن" شا لە گورگین خان هان بدات، کە گوایە گورگین خان، دەیەوێ هاوکاری ڕووسەکان، بکات تاکوو دەست بە سەر کەنارەکانی دەریای قەزوین، دابگرن کەشوێنێکی بازرگانی و ئابووری گرنگی هەبوو میر وەیس، توانی ڕەزامەندی شا سولتان حوسێن، بەدەستبێنێ و بگەڕێتەوە بۆ شاری قەندەهار،

لە ساڵی ١٧٠٨ز، نەك هەر ئەوەندەش بەڵكوو ببێتە چاودێریش بەسەر هەڵسوکەوتوو جموجۆڵەکانی گورگین خانەوە، لەگەڵ گەڕانەوەی میر وەیس، بۆ قەندەهار،گورگین خان، بەهۆی لەدەستدانی لایەنگرەکانی لە ئەسفەهان، بەمەبەستی سوکایەتی پێکردن داوای کچی میر وەیسی کرد" میر وەیسیش کچێکی تری لەجێگای کچی خۆی بۆ ڕەوانکرد، بۆ ئەوەی لێی دڵنیا بێتەوە کەوا لەگەڵی ڕوو ڕاست و نیاز پاکە[1].

میر وەیس بەدوای دەرفەتێك دەگەڕا بۆ ئەوەی گورگین خان لەناو ببات، تاکوو جارێکیان وارێکەوت،سوپای گورگین خان، سەربازە گورجیەکان، بەمەبەستی تەمبێکردنی یەکێك لەهۆزە ئەفغانییەکان، شاری قەندەهاریان بەجێ هێشتبوو، تەنها ژمارەیەکی کەم پاسەوانی لەگەڵ دامابۆوە" میر وەیس ئەم دەرفەتە دەقۆزێتەوەو هێرش دەکەنە سەر گورگین خان و پاسەوانەکانی هەموویان دەکوژن، کاتێك سەربازە گورجیەکان، گەڕانەوە بینیان سەرکردەکەیان کوژراوە شەڕێکی سەخت لەنێوانیان ڕوودەدات و لە ئەنجامدا هۆزەکانی غەڵزایی بەسەرکردایەتی میر وەیس، سەرکەوتن بەدەست دێنن و دەست بەسەر شاری قەندەهار دادەگرن بەتەواوەتی لەساڵی ١٧٠٩ز[2].

## دووەم- هێرشی ئەفغانییەکان بۆ سەر ئێران وڕووخانی دەوڵەتی سەفەوی.

### هەڵمەتی یەکەمی میر مەحمودی ئەفغانی، بۆسەر ئێران:

لە دوای مردنی میر وەیس، براکەی بە ناوی میر عەبدولعەزیز، لەساڵی ١٧١٥ز، جێی گرتەوەو بوو بەسەرۆکی هۆزی غەڵزایی و فەرمانڕەوای شاری قەندەهار عەبدولعەزیز،کە ١٨مانگ حوکمڕانی کرد، بەپێچەوانەی میر وەیسی، برای کەسێکی ئاشتیخواز بوو حەزی بەشەڕکردن نەبوو، هەربۆیە نامەی نارد بۆ

شا سوڵتان حوسێن و پێی ڕاگەیاند کەوا ئێمە ئامادەین بەناوی دەوڵەتی سەفەوی حوکمڕانی شاری قەندەهار بکەین، بەومەرجەی فەرمانڕەوایی شارەکە لەناو بنەماڵەکەیاندا پشتاو پشت بێت، ئەم هەڵوێستەی میر عەبدولعەزیز، بووە جێگای نارەزایی زۆرێك لە سەرکردەو پیاوماقولانی هۆزی غەلزایی، چونکە ئەوان بەهیچ شێوەیەك ڕازی نەدەبوون جارێکی تر بگەڕێنەوە ژێر دەسەڵاتی سەفەوییەکان. هەربۆیە میر مەحمودی کوڕی میر وەیس یان لە دژی هاندا تا بیکوژێت، بەمەش میر مەحمود بوو بە سەرۆك هۆزی غەلزایی، لە ساڵی ١٧١٧ز، کە ئەوکاتە تەمەنی ١٨ ساڵان[٤٠].

میر مەحمودی غەلزایی، بەپێچەوانەی مامی لەڕووی سەربازییەوە کەسێکی دڵ ڕەق و شەڕکەربوو، بەلام لەڕووی سیاسیەوە زۆر شارەزا نەبوو، بەهۆی تەمەن بچوکییەوە، بەلام لە شانسی باشی ئەودا، دەوڵەتی سەفەوی ئەوکات لەلاوازیدا بوو لە هەمانکاتیشدا، ئەبدالیەکانی شاری هیرات بەسەرکردایەتی ئەسەدوڵلا خان، سەربەخۆیی خۆیان لەدەوڵەتی سەفەوی ڕاگەیاندبوو" میر مەحمود، هێرشی کردە سەریان و توانی دەست بەسەر شاری هیرات، دابگرێت و ئەسەدوڵلا خانیش بکوژێت،و سەرەکەشی بۆ ئەسفەهان، ڕەوانەکرد، بۆ ئەوەی وا نیشان بدات کەوا نیاز پاکە بەرامبەر بەدەوڵەتی سەفەوی، وە لە لایەن شای سەفەوییەو نازناوی حوسێن قولیخان[٤١] ی پێداو بەفەرمی کرایە فەرمانڕەوای شاری قەندەهار[٤٢].

میر مەحمود، بۆماوەی دوو ساڵ، واتە لە ساڵی ١٧١٧ تا ١٧١٩ز، خەریکی خۆڕێکخستن و ئامادەکاری بوو لەڕووی سەربازی یەوە، بۆ ئەوەی هێرش بکاتە سەر دەوڵەتی سەفەوی، بەرلەوەی دەوڵەتی سەفەوی هێرشی بکاتە سەر. وەلەو کاتەشدا باروودۆخەکە زیاتر گونجاو بوو، بۆئەوەی بەبێ ترس هێرش بکاتە سەر

ئێران، چونکە ئەفغانیە ئەبدالییەکانی، شاری هیرات، سەرقاڵی کێشەو ململانێی ناوخۆیی بوون،و توانای ڕووبەڕوو بوونەوەی غەلزاییەکانیان نەبوو، بەهۆی کێشەی ناوخۆییانەوە، ئەمە لەلایەك" وەلەلایەکی تریشەوە دەوڵەتی مەغۆلی لەهیندستان، لەلاوازیدابوو،وبەرەو ڕووخان دەڕۆیشت، هەروەها میر مەحمود، توانی ئەفغانییە هەزارەییەکان کە شیعە مەزهەب بوون، بەلای خۆیدا ڕایانکێشێت لەدژی دەوڵەتی سەفەوی، میر مەحمودی ئەفغانی لەکۆتایی هاوینی ١٧١٩ز، بەسەرکردایەتی سوپایەکی ١١ هەزار کەسی، بەرەو سیستان، بەڕێکەوت لە ڕۆژهەڵاتی ئێران، بۆ ئەوەی جموجۆڵەکانی سەرنجی دەوڵەتی سەفەوی، بەلایخۆیدا ڕانەکێشێ ئەوەك سوپا بنێرن بۆ ڕوو بە ڕوو بوونەوەی، وابڵاویکردەوە کەوا مەبەست لەم لەشکرکێشیەی جارێکی تر دەیەوێت ئەبداڵییەکانی شاری هیرات، تەمبێ بکات" کاتێك سوپای ئەفغانییەکان، گەیشتە ناوچەی سیستان لە ڕۆژهەڵاتی ئێران، لەجیاتی ئەوەی ڕێگای باکوور، بگرنەبەر بەرەو شاری هیرات، بەڵکوو ڕێگای باشووریان گرتەبەر، بەڕێگای دەشتی لووت، بەرەو شاری کرمان بەڕێکەوتن" لێرەدا سوننە مەزهەب، و زەردەشتیەکانی شاری کرمانیش، چوونە ڕیزی سوپای ئەفغانییەکانەوە، بەهۆی ئەو زوڵم و ستەمەی دەسەڵاتدارانی سەفەوی لێیان دەکردن، لێرەدا حاکمی سەفەوی شاری کرمان حوسێن خانی سیستانی، کەزانی توانای ڕووبەڕوو بوونەوەی سوپای ئەفغانییەکانی نیە، شاری کرمانی، بەبێ هیچ بەرەنگاربوونەوەیەك ڕادەستی میر مەحمودی ئەفغانی کرد، بەمەش سوپای ئەفغانی لە کۆتایی هاوینی ساڵی ١٧١٩ز، دەستیان بەسەر شاری کرمان داگرت[٤٢].

سوپای ئەفغانی بۆماوەی ٩ مانگ، لە شاری کرمان، مایەوەو خەریکی ئامادەکاری بوون بۆ هەنگاوی داهاتوویان، بۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەر

ناوچەکانی تری ئێران، ئەفغانییەکان لەو ماوەیەی کە لە شاری کرمان بوون، مامەڵەی زۆر توندیان لەگەڵ خەڵکی شارەکەدا دەکرد" هەرچەندە خەڵکی کرمان،لەکاتی هاتنی سوپای ئەفغانی بۆ شارەکە هیچ بەرگرییەکیان نەکرد، بەڵام باج و سەرانەیەکی، زۆریان لەخەڵکی شارەکە وەردەگرت، بەمەبەستی دابینکردنی خەرجی سوپاکەی دوای گەیشتنی هەواڵی گرتنی شاری کرمان، لەلایەن ئەفغانییەکانەوە شای سەفەوی شاسولتان حوسێن، سوپایەکی بەسەرکردایەتی لوتف عەلیخان حاکمی هەرێمی فارس[٤٤]، نارد بۆ دەرکردنی ئەفغانییەکان،و گێڕانەوەی شاری کرمان، هاوکاتی هاتنی سوپای سەفەوی بەسەرکردایەتی لوتف عەلیخان، لەشاری قەندەهاریش، شۆڕش وڕاپەڕینێك ڕویدابوو، لەدژی دەسەڵاتی میر مەحمودی ئەفغانی، هەربۆیە میر مەحمود، ناچاربوو بەپەلە خۆی بگەیەنێتەوە بۆ شاری قەندەهار، بە مەبەستی سەرکوتکردنەوەی شۆڕشەکەو لەناوبردنی[٤٥].

لێرەدا لوتف عەلیخان، توانی شاری کرمان، بەسەرکەوتوویی بگێڕێتەوە بۆ ژێر دەسەڵاتی سەفەوییەکان، خۆی ئامادە دەکرد، بۆ ئەوەی هێرش بکاتە سەر شاری قەندەهار،و سوپای میر مەحمودی ئەفغانی، بەڵام بەهۆی ئەو ناحەزو دوژمنیانەی، کەلەناو دەرباری سەفەویدا هەیبوو، شا سولتان حوسێن یان لێهاندا، تاکوو لەپۆستەکەی دووری بخاتەوەو، بیخاتە زیندانەوە، بە بیانووی ئەوەی گوایە نیازی هەبوە بۆخۆی دەسەڵات بگرێتە دەست، بەم شێوەیە هەڵمەتی یەکەمی میر مەحمودی ئەفغانی، بۆسەر وڵاتی ئێران کەدەستی بەسەر شاری کرمان،داگرتبوو ٩ مانگی خایاند[٤٦].

## هەڵمەتی دووەمی میر مەحمود و ڕووخانی دەوڵەتی سەفەوی:

لەڕاستیدا لەنێوان لەشکرکێشی یەکەم،ودووەمی میر مەحمودی ئەفغانی، بۆسەر ئێران، نزیکەی دووساڵی خایاند، وەلەدوای لەشکرکێشی یەکەم، دەوڵەتی سەفەوی هیچ هەنگاوێکی نەنا، بۆ ڕووبەڕووبونەوەی ئەفغانییەکان، بەم شێوەیە میر مەحمود لەمانگی ١٧٢١/١٠ز، بە سوپایەکی ١٢ تا ٢٠ هەزار کەسی، جارێکی تر هێرشی کردەوە سەر وڵاتی ئێران، میر مەحمودی غەلزایی، بەهەمان شێوەی جاری پێشوو، بەڕێگای دەشتی لووت، پەلاماری شاری کرمانیاندا لە ١٧٢١/١٠/٢٢ز، بەڵام ئەمجارەیان حاکمی شاری کرمان، کەناوی ڕۆستەم مەحەمەد سەعدەلوو،بوو شوراو قەڵاکانی شارەکەی قایم کردبوو، وەبەرگرییەکی قارەمانانەی لەشاری کرمان،کردو ژمارەکی زۆریان لەسوپای ئەفغانییەکان کوشت، میر مەحمود، گەمارۆی شاری کرمانیدا[٤٧].

گەمارۆی ئەفغانییەکان بۆشاری کرمان، تاکۆتایی مانگی ١٧٢٢/١ز، لەوماوەیەدا چەندین جار هێرشیانکردە سەر شاری کرمان بۆیان نەگیرا،کەببووە هۆی بێزاربوونی سوپای میر مەحمودی ئەفغانی، بەڵام لەوکاتەدا ڕووداوێك بەهانای مەحمودی ئەفغانییەوە هات، ئەویش مردنی حاکمی کرمان، ڕۆستەم سەعدەلوو بوو ئەوکەسەی جێی گرتەوە کەسێکی لاوازوبێ توانابوو، هەربۆیە نامەی بۆ میر مەحمودی غەلزایی، ناردو شاری کرمانی تەسلیم کرد، لەبەرامبەردا میر مەحمود، دەست لەگەمارۆدانی شاری کرمان هەڵبگریت، پارەیەکی زۆری پێدەدەن، لێرەدا مەحمودی غەلزایی، بە پێشنیارەکە ڕازی بوو بەسوپاکەیەوە بەرەو شاری یەزد چوون، بەڵام کاتێك سوپای ئەفغانییەکان گەیشتنە شاری یەزد، دووچاری بەرگرییەکی توند بوونەوە لەلایەن، خەڵکی شاری یەزدەوە، هەربۆیە میر مەحمودی ئەفغانی،ئەمجارەیان بڕیاریدا هێرش بکاتە سەر شاری ئەسفەهان، پایتەختی دەوڵەتی سەفەوی[٤٨].

لەوکاتەی کەسوپای ئەفغانییەکان، بەرەوشاری ئەسفەهان، دەڕۆیشت، شای سەفەوی شاسولتان حوسێن، چەند جارێك نوێنەری خۆی نارد بۆلای میر مەحمودی ئەفغانی و داوای لێکرد ئەگەر بێتوو واز لە هەڵمەتەکەی بێنێ وبگەڕێتەوە بۆ ئەفغانستان، ئەوا پۆست ودیاری جۆراوجۆری، پێدەدات بەلام میر مەحمود، ئەم هەڵوێستەی بە نیشانەی لاوازی وبێ توانایی دەوڵەتی سەفەوی، دەزانی پێشنیاری شای سەفەوی، ڕەتکردەوەو بەردەوامبوو لەبەرەو پێشچوون، تاکو بەسەرکردایەتی سوپاکەیەوە، گەیشتنە ناوچەی گولناباد[49]، کەدەکەوێتە ٨ مایلی ڕۆژهەلاتی شاری ئەسفەهان، لەسەرەتای مانگی ئاياری/١٧٢٢ز،دا[50].

## شەڕی گولناباد، لە ٨/٥/ ١٧٢٢ز :

سوپای ئەفغانی، کە ژمارەیان نزیکەی ٢٠هەزارسەرباز، دەبوو بەسەرکردایەتی، میر مەحمودی ئەفغانی، لەسەرەتای مانگی ١٧٢٢/٥ز، گەیشتنە ناوچەی گولناباد، وە سوپای سەفەویش کەژمارەیان نزیکەی ٥٠ هەزار سەرباز، دەبوو، بەسەرکردایەتی قوللەرئاغاسی و ڕۆستەم خانی گورجی، گەیشتنە مەیدانی جەنگ" واتە ناوچەی گولناباد، ئەمە جگەلەوەی لەریزی سوپای سەفەوی ژمارەیەکی زۆر لەعەرەبەکانی، ناوچە عەرەب نشینەکان و کوردەکانی ناوچەی لوڕستان و کۆهگلیوە، بەسەرکردایەتی عەلیمەردان خانی فەیلی، ئامادەبوون" هەردوولا، سوپاکەیان دابەشی سەر سێ دەستە ڕاست، چەپ، ناوەڕاست،کردبوو، بەم شێوەیە شەڕ لەڕۆژی ١٧٢٢/٥/٨ز، دەستی پێکرد بەهێرشی سوپای ئێرانی" بۆسەر لای چەپی سوپای ئەفغانی. سەرەڕای ئەوەی کە ژمارەی سوپای سەفەوییەکان، دووبەرابەری سوپای ئەفغانییەکان، بوو،

تەنانەت لە ڕووی جل وبەرگیشەوە، سوپای ئێران، ڕێکوپێکترو جوانتر بوون لەئەفغانییەکان لارنس لاکهارت، لێرەدا: "سوپای سەفەوی دەشوبهێنێ، بەسوپای ساسانیەکان، وەسوپای ئەفغانییەکانیش، بەعەرەبە موسڵمانەکان،دەشوبهێنێ لە جەنگی قادسیە ساڵی ٦٣٥ز، ساسانیەکان لەسەرەتای جەنگ شانازیان، بەهێزو هەیبەت وشکۆی خۆیان دەکرد،ولەبەرامبەردا گاڵتەیان بە موسڵمانەکان و،شێوازی جلوبەرگیان، دەکرد، بەڵام لەئەنجامدا عەرەبەکان سەرکەوتنیان بەدەستهێنا، سەفەویەکانیش بەهەمان شێوە گاڵتەیان بە ئەفغانییەکان، دەکرد لەسەرەتای جەنگەکەدا بەڵام دواتر دۆڕان"[٥١].

هەرچەندە سوپای سەفەوی یەکان، لەسەرەتای جەنگدا توانیان سەرکەوتنێکی سەرەتایی، بەسەر لای چەپی سوپای ئەفغانییەکاندا، بەدەست بێنن، بەڵام ئەفغانییەکان، توانیان ڕیزەکانیان ڕێکبخەنەوەو هێرش بکەنە سەر سوپای سەفەوی و لەئەنجامدا، توانیان سەرکەوتنێکی گەورە لەجەنگی گوڵناباد ١٧٢٢ز، بەدەست بێنن"و دەست بەسەر تۆپخانەی سەفەویەکان،دابگرن و بووە هۆی تێکشکانی سوپای سەفەویەکان، وکوژرانی پێنج هەزارسەربازی سەفەوی و کوژرانی ژمارەیەك لەسەرکردەکانیان، لەوانەش ڕۆستەم خانی گورجی و قوللەرئاغاسی...، ڕاکردنی هەندێك لەسەرکردەکان لەمەیدانی جەنگ، لەوانەش والی عەرەبستان و سوپاکەی، لەبەرامبەردا ئەفغانییەکان، تەنها ٥٠٠ تا ٧٠٠ کەسیان، لێکوژرا لەم شەڕەدا. ئەفغانییەکان،توانیان سوپای تێکشکاوی سەفەوی، تاکو ناو شاری ئەسفەهان، ڕاوبنێن،و گەمارۆی شاری ئەسفەهانیش بدەن[٥٢].

## باروو دۆخی شاری ئەسفەهان، لەماوەی گەمارۆدانی ئەفغانییەکاندا

دوای شکانی سوپای سەفەوی لەجەنگی گوڵناباد، پاشماوە سوپاکە بە دۆڕاوی گەڕانەوە بۆشاری ئەسفەهان، وهەواڵی شکانی سوپای سەفەوی لەناو شاردا بڵاوبیبوەوە، بووەهۆی بڵاوبوونەوەی ترس ودڵەڕاوکێ، کەگوایە ئەفغانییەکان، دێن ودەست بەسەر شارەکەیا دادەگرن لارنس لاکهارت، پێی وایە: " ئەگەر ئەفغانییەکان، هەر ئەوکاتە بەدوای سوپای تێکشکاوو، ڕاکردووی سەفەوی، کەوتبانایە زۆر بەئاسانی دەیانتوانی شاری ئەسفەهانیش، بگرن، ئەوکاتە خەڵکی ئەسفەهانیش دووچاری ئەونەهامەتی و ڕۆژە ڕەشە نەدەبوونەوە، کەلەماوەی گەمارۆدانی شارەکەیاندا، بەسەریانهات"[٥٣].

بەڵام میر مەحمودی ئەفغانی، دوای سێ ڕۆژ، لەسەرکەوتنیان بەسەر سوپای سەفەویدا، بەسوپاکەیەوە بەرەو شاری ئەسفەهانی پایتەخت، هات واتە لەڕۆژی ١٧٢٢/٥/١١ز، گەیشتە نزیك شاری ئەسفەهان و سەربازگەی خۆی هەڵدا، کە ڕووباری زایندە ڕوود[٥٤]، ببووە بەربەستی نێوانیان، وزۆربەی پردەکانی شارەکە لەژێردەستی سوپای سەفەوی بوو،دواتر سوپای ئەفغانییەکان، توانیان لە ١٧٢٢/٥/١٧ز، دەست بەسەر ناوچەی فەرەح ئاباد[٥٥]، دابگرن، کە شای سەفەوی شا سوڵتان حوسێن، ئەم شوێنەی بۆ حەوانەوەی خۆی دروستکردبوو، دواتر ئەفغانییەکان، توانیان لە ئەنجامی لاوازی سوپای سەفەوی، دەست بەسەر سەرجەم ڕێگاکانی هاتووچۆی شاری ئەسفەهان، دابگرن وبەتەواوی گەمارۆی شارەکە بدەن[٥٦].

ماوەی گەمارۆدانی شاری ئەسفەهان[٥٧]، کە نزیکەی ٦مانگی خایاند، بە ناخۆشترین و ڕەشترین و تاڵترین، ماوە لە مێژووی خەڵکی شاری ئەسفەهان دادەنرێت، میر مەحمودی ئەفغانی، لەسەرەتای گەمارۆدانەکەدا نوێنەری خۆی

دەنێـرێ بـۆلای شـای سـەفەوی، پێـی ڕادەگەیـەنێت، کـەوا ڕازی دەبێـت واز لەگـەمارۆی شـاری ئەسـفهان، بێنێـت و بگەڕێتـەوە بـۆ ئەفغانـستان، بـەلام بەمەرجێك" پێویستە شای سـەفەوی کچی خـۆی لێمـارە بکـات،و فـەرمانڕەوایی ناوچەکانی قەندەهار،و کرمان،و خوراسانی بەڕەسمی پێبدات، بـەلام شـای لاوازو نـەزانی سـەفەوی داواکـەی ڕەتکـردەوەو ڕازی نەبوو،هەربۆیـە مـیر مـەحمودی ئەفغانی، گەمارۆی سەر شاری ئەسفەهانی توندتر کرد[٥٨].

سەبارەت بە بارودۆخی خەڵکی شاری ئەسفەهان، لەماوەی گەمارۆدانەکەدا، زۆربەی سەرچاوە مێژووییەکان، پێیان وایە کەوا ڕاستەوخۆ دوای بیستنی هەواڵی شکانی سوپای سەفەوی، لە جەنگی گوڵناباد، بۆ بەیانیەکەی نرخی کـەل وپـەل، لەبازاڕەکانی شاری ئەسفەهان، بەرز بۆوە، بۆ چـەند بەرابـەری نرخـی پێـشووی" وە لـەدوای تێپـەڕبونی چـەند مانگێـك، بەسـەر گەمارۆکـەدا، هـیچ ئازووقـەو خواردنێك، لە شاری ئەسفەهان، نامێنێت کەخەڵك بیخوات،هەر بۆیە خەڵك ناچـار دەبن لەبرسان" ڕوویکەنە بەخواردنی گۆشتی، کەر،و هێستر،و سـەگ،و پـشیلە،و کەئەمانەش نامێنێ، دەست دەکەن بـەخواردنی گۆشـتی مرۆڤـی مـردوو،و دزیـنی منداڵەکان لەکوچەو کۆڵانەکان، بەمەبەستی خواردنی گۆشتەکەی[٥٩].

مێژوونووسـی ئێرانـی مـیرزا مهـدی خـان اسـترآبـادی، دەڵێـت:("خـەڵکی ئەسفەهان، کەپێشتر جلی ئاوریشمیان، لەبەر دەکرد، بـەلام ئێـستا خۆیـان وەك کرمـی ئاوریـشمیان، لێهـاتووەو کەوتوونەتـە خـواردنی داروو درەخـت"). ئەمـە سەرەڕای قاتووقڕی، لەهەمانکاتیشدا نەخۆشی تـاعون، لـەناو شـاردا بڵاوبـۆوە، کەبە هۆیەوە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی شاری ئەسـفەهان، مـردن، بـەجۆرێك کـە کۆڵان و شەقامەکانی شاری ئەسـفەهان، پڕببـوو لەلاشـەی مـردووان. ئـەم بـاروو دۆخـەش بـووە هـۆی بێزاربـوونی خـەڵکی ئەسـفەهان، وبەرزبوونـەوەی دەنگـی

نارەزاییـان، بـەجۆرێك داواییـان دەكـرد، كـەوا ئێمـە پێمـان باشـە بەدەسـتی ئەفغانییەكان، بكوژرێین، نەوەكوو بەهۆی نەخۆشـی و برسـێتی یـەوە بمـرین شـا سولتان حوسێن، لەئەنجامی فشاری خەڵكی شاری ئەسفەهان، بەهۆی هـەژاری و برسێتی و گەمارۆی ئەفغانییەكان، بۆسەر شارەكە، ناچاربوو لەگەڵ ژمارەیەك لە هاوەڵەكانی یەوە، لـەرۆژی ٢٣/١٠/١٧٢٢ز، سـەردانی مـیر مـەحمودی ئـەفغانی، بكات لەناوچەی فەرەح ئابادی ئەسفەهان" كاتێـك شاسـولتان حوسـێن، گەیشتە فـەرەح ئابـاد، پاسـەوانەكانی مـەحمودی ئـەفغانی، پێیـان ڕاگەیانـد كـەوا مـیر مەحمود، خەوتووەو پێویستە چاوەڕێ بكەیت تـا لەخـەو هەڵدەستێت، بەمـەش شای سەفەوی، بۆماوەی چـەند كاتـژمێریك بەسـەر ئەسـپەكەیەوە، لەبـەر گـەرما لەچاوەڕوانی مەحمودی ئەفغانی دابوو كاتێك میری ئەفغان، لەخەو هەستا شـای سـەفەوی، چـووەلایی و دوای گفتووگۆیـەكی زۆر شـا حوسـێن، بەدەسـتی خـۆی تاجی شایەتی، ئێرانی لەسەری، میر مەحمودی ئەفغانی نا، دواتر مـیر مـەحمود، ژمارەیەك لەسەربازی ئەفغانی، ناردە ئەسـفەهان، بۆئـەوەی ئامادەكـاری بكـەن، بـەم شـێوەیە مـیر مـەحمودی غەڵزایی،لـە ٢٥/١٠/١٧٢٢ز، لـەڕێو ڕەسمێكـی جەماوەریدا چووە ناوشاری ئەسفەهان و لەسەر تەختی شای سـەفەوی، دانیـشت وبـەم شـێوەیە كۆتـایی بـەماوەی فـەرمانڕەوایی سـەفەوییەكان، هـات لەئێرانـداو سـەردەمی ئـەفغانی، دەسـتی پێكـرد، بـۆ مـاوەی حـەوت سـاڵ، تـا ١٧٢٩ز، فەرمانڕەوایی ئێرانیان كرد[٦٠].

**تەوەرەی دووەم:-**

**سیاسەت و شێوازی هەڵسوکەوتی ئەفغانییەکان لە ماوەی فەرمانڕەواییاندا لە ئێران**

**یەکەم:- سیاسەتی ناوخۆی ئەفغانییەکان بەرامبەر بە ئێرانییەکان.**

**١- فەرمانڕەوایی میر مەحمود لە ئێران ١٧٢٢-١٧٢٥ز :-**

لەڕاستیدا ئەفغانییەکان،بە شێوەیەکی گشتی، بۆ ماوەی حەوت ساڵ،لە ١٧٢٢–١٧٢٩ز، فەرامانڕەوایی بەشێك لە وڵاتی پان و بەرینی ئێرانیان کردوو، توانیان دەوڵەتی سەفەوی خاوەن شارستانی بڕووخێنن" لە سەردەمی شا سوڵتان حوسێن[٦١]. دا کەبە لاوازترین و بێتواناترین شا، لە مێژووی فەرمانڕەوایی بنەماڵەی سەفەوییەکان، دادەنرێت لە ئێراندا، کە بەدەستی خۆی تاجی شایەتی ئێرانی، لە سەری میر مەحمودی ئەفغانی نا "کە ئەمەش بۆ یەکەم جاربوو لەمێژووی ئێران و جیهانیش شایەك ئاوا بە زەلیلی خۆی تاجی پادشایەتییەکەی لەسەری داگیرکەری وڵاتەکەی بنێت" بەم شێوەیە میر مەحمود، لە ١٧٢٢/١٠/٢٥ز، لە ڕێوڕەسمێکی جەماوەرییدا چووە ناو شاری ئەسفەهان و لەسەرتەختی شایەتی ئێران دانیشت لە کۆشکی چل ستوونی شاری ئەسفەهان، بوو بە شای نوێی ئێران لەژێر ناوی شا مەحمودی ئەفغانی[٦٢]، لەساڵی ١٧٢٢ تا ١٧٢٥ز، فەرمانڕەوایی ئێرانی کرد[٦٣].

لەڕاستیدا میر مەحمودی ئەفغانی، کەسێکی زیرەك و بەتوانا بوو، هەربۆیە لەسەرەتای وەرگرتنی دەسەلاتی، سیاسەتێکی مامناوەندی پەیڕەوکرد لە ئێران، بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتی ئێران، و ڕاکێشانی خەڵکی ئێران بەلای خۆیدا "لە سەرەتادا شا سوڵتان حوسێن،و سەرجەم شازادەکانی تری سەفەویی، لە یەکێك لەکۆشکەکانی شاری ئەسفەهان، دەست بەسەرکران و تاڕادەیەك مامەڵەیەکی ڕێکوپێکیان لەگەڵدا دەکرا هەروەك محمد هاشم ئاسف، لە کتێبی

ڕستم التواریخ، ص١٦٠، دا دەڵێت: " لەوکاتەی شا سوڵتان حوسێن، تاجی شایەتی لەسەری میر مەحمودی ئەفغانی، داناو سەری ماچکردوو گووتی تۆکوڕی بەڕێزی منی، بەهەمان شێوە میر مەحمودیش، گووتی تۆ باوکی بەڕێزی منی، ئەگەر ئێوە هەڵەیەك نەکەن، ئەوا من هەڵەتان بەرامبەر ناکەم، دواتر شا سوڵتان حوسێن کچێك و خوشکێکی، خۆی لە میر مەحمود مارەکرد".

میر مەحمودی ئەفغانی، سەرچاوە مێژووییەکان بە کەسایەتیەکی دڵڕەق و بێ بەزەیی، وەسفی دەکەن، بەڵام لەسەرەتای دەسەڵاتیدا سیاسەتێکی تاڕادەیەك نەرمی پەیڕەوکرد بەمەبەستی ڕاکێشانی خەڵکی ئێران، بەلای خۆیداو بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتی ئێران، بەشێوازێکی ڕێکوپێك" بەهۆی ئەوەی، ئەفغانییەکان شارەزاییەکی ئەوتۆیان لە بواری سیاسی و کارگێڕییەوە نەبوو، هەربۆیە سەرجەم فەمانبەرو کاربەدەستە ئێرانیەکانیان لەشوێنی خۆیان هێشتەوەو، لەگەڵیاندا فەرمانبەری ئەفغانی، دانا بۆ ئەوەی فێری سیستەمی بەڕێوەبردن ببن، وە لەهەمانکاتیشدا ببنە چاودێر بەسەریانەوە[٦٤].

یەکێکی تر لەوکارەباشانەی کە میر مەحمود، ئەنجامیدا، لەدوای هاتنە سەرتەختی دەسەڵات، فەرمانیدا ڕێژەیەکی زۆر خۆراك بەسەر خەڵکی لێقەوماوی ئەسفەهان، دابەش بکەن دواتر دەستی کرد بەکوشتنی هەموو ئەوانەی کە لەکاتی گەمارۆدانی شاری ئەسفەهاندا " خیانەتیان لە شای سەفەوی، کردبوو،چووبوونە ڕیزی ئەفغانییەکانەوە" بە هۆی ئەوەی، میر مەحمود، پێی وابوو ئەگەر ئەوانە ئامادەبن خیانەت لە شای خۆیان بکەن، ئەدی چۆن لەگەڵ ئەودا ڕووڕاست و دڵسۆز دەبن[٦٥].

هەرچەندە ئەفغانییەکان، هەوڵیاندا هەست و سۆزی، ئێرانیەکان بەلای خۆیاندا ڕابکێشن، لەماوەی فەرمانڕەواییاندا لەئێران، بەڵام لەم هەوڵەیاندا

سەرکەوتوو نەبوون" چونکە خەڵکی ئێران، بە چاوێکی سووك و داگیرکەر سەیری دەسەڵاتی ئەفغانییەکانیان، دەکردوو، هەروەها ئەفغانییەکانیان، بەدواکەوتوو و نەزان لەقەڵەم دەدا، سەرەڕای ئەوەی ئێرانیەکان هەمیشە سەرسام، بوون بە دەسەڵاتی شایەکانی سەفەوی، سەرەڕای لاوازی و بێ توانایی شایەکانی کۆتایی سەفەوییەکان، بەڵام ئێرانییەکان، بە ئاسانی دەسەڵاتی بێگانەیان بەسەر وڵاتەکەیان قبوڵ نەدەکرد[٦٦].

هەرچەندە میر مەحمودی ئەفغانی، لەکاتی هێرشی بۆ سەر ئێران، توانی دەست بەسەر شارەکانی ئەسفەهان، و قوم، قەزوین، و کرمان، و شیراز، تەهران" دابگرێت، بەڵام نەیتوانی هەموو ناوچەکانی ئێران،و شارە گەورەکانی وەك: یەزد،و بەندەر عەباس، و کاشان، مازندەران...، دەست بەسەر دابگرێت بەهۆی بەرەنگاربوونەوەی خەڵکی ئێران، لەدژی داگیرکاری ئەفغانیدا[٦٧]. وە لەهەمانکاتیشدا ڕووخانی دەوڵەتی سەفەوی، لەلایەن ئەفغانییەکانەوە ڕێگەخۆشکەربوو بۆ هەردوو دەوڵەتی عوسمانی،و ڕووسیای قەیسەری" کە لەمێژ بوو هەوڵیان بۆ دەدا، دەست بەسەر چەندین شارو ناوچەی بەپیتی خاکی ئێران دابگرن[٦٨].

سەرەڕای ئەوەش، سەرکەوتوو نەبوو کە خەڵکی ئێرانی، بێنێتە ڕیزی سوپاکەیەوە، بۆ سەرکوتکردنەوەی شۆڕش و ڕاپەڕینی ئێرانیەکان،و بەرەنگاربوونەوەی سوپای، هەردوو دەوڵەتی عوسمانی،و ڕووسیای قەیسەری، کە بۆ ئەم مەبەستە پێویستی بە سوپا هەبوو، وەهاتنی سوپاش لەئەفغانستانەوە کارێکی ئاسان نەبوو،و کاتێکی زۆریشی پێدەچوو، تەنها توانی ژمارەیەکی کەم لە کوردەکان، بەلای خۆیدا ڕابکێشێ لەڕێگای دانی ئیمتیازو پارە بەکوردەکانەوە[٦٩].

هەربۆیە زۆری پێنەچوو، سیاسەتی میر مەحمودی ئەفغانی، گۆڕانی بەسەر داهات، بەرامبەر بە پاشماوەی دەسەلأتدارانی سەفەوی،و شازادەکانی سەفەوی، سیاسەتێکی لەڕادەبەدەر توونـدوو تیـژی پـەیڕەوکرد" بەتایبـەتی دوای ئـەوەی یەکێك لە شازادەکانی سەفەوی بـەناوی سـەفی مـیرزا، کـە لـە شـاری ئەسـفەهان، دەست بەسەر بوو ڕایکرد بۆ ناوچەی بەختیاری " ئەمە جگەلەوەی کە تەهماسب میرزای کوڕی شا سوڵتان حوسێن، لە کاتی گەمارۆدانی شاری ئەسفەهان، بـەرەو شاری قەزوین" ڕایکردبـوو بـە مەبەسـتی کۆکردنـەوەو هێنـانی هێـزی سـەربازی، لەدژی گەمارۆی ئەفغانییەکان، بـۆ سەرشـارەکە، وە لـەدوای داگیرکردنـی شـاری ئەسفەهان، خۆی بە شای سەفەوی ڕاگەیاند لەژێر ناوی شا تەهماسـبی دووەم، و سکەی، بەناوی خۆی لێدا لە شاری قەزوین[٧٠].

هەربۆیـە مـیر مـەحمود، سـوپایەکی چـوار هـەزار کەسـی، بەسـەرکردایەتی ئـەمانوڵڵا خـان[٧١]، ڕەوانـەکرد بـۆ گـرتنی شـاری قـەزوین و لـەناو بردنـی شـا تەهماسـبی دووەم، بـەلأم کـاتێ شـا تەهماسـبی دووەم هـەواڵی هـاتنی سـوپای ئەفغانی بۆ شاری قەزوین بیست" ڕایکرد بۆ شاری تەورێز، چونکە توانای ڕوو بـە ڕوو بوونـەوەی سـوپای ئەفغانییـەکانی نـەبوو" خـەڵکی قـەزوین سـەرەتا هـیچ بەرەنگاربوونەویـەکی سـوپای ئەفغانییـەکانییان، نـەکرد بـەلأم بـەهۆی زوڵـم و ستەمەی، سوپای ئـەفغانی، لـە خـەڵکی شـاری تـەورێزیانکرد، هەربۆیـە خـەڵکی شارەکە لە سوپای ئەفغانییەکان، هەڵگەڕانەوەو ژمارەیـەکی زۆریـان لـە سـوپای ئەفغانییـەکان کوشـت، سـەرکردەی سـوپای ئەفغانییـەکان ئـەمانوڵڵا خـان، بەبرینداری خۆی گەیاندەوە شاری ئەسفەهان[٧٢]. ئەم شکستەی سوپای ئەفغانی، لەبەرامبـەر خـەڵکی شـاری قـەزوین، لەهەمانکاتیـشدا شـۆڕش و ڕاپەڕینـەکانی خەڵکی ئێران، لەدژی داگیرکاری ئەفغانی لەناوچە جیاجیاکانی ئێراندا، کاریگەری

کردە سەردەرۆوونی میر مەحمودی ئەفغانی لەساڵی ١٧٢٥ز، هەربۆیە فرمانیدا بە کوشتنی سەرجەم، شازادەکانی سەفەوی[٧٣]، کە لەشاری ئەسفەهان، دەست بەسەر بوون، جگە لە شا سوڵتان حوسێن شای لەسەر کار لادراوی سەفەوی، نەبێت ئەوانیتر هەر هەموویانی کوشت" کە لەناویاندا منداڵیش هەبوو، ئەم ڕوداوە دڵتەزێنەش، بە بەرچاوی شا سوڵتان حوسێن،و خەڵکی شاری ئەسفەهان، ئەنجام درا[٧٤].

وەك سەرچاوەکان ئاماژەیان پێکردووە، چەند ڕۆژێك دوای تێپەڕبوونی ئەم ڕووداوە، میر مەحمودی ئەفغانی، تووشی نەخۆشی دەروونی ( شێتی )، دەبێت و عەقڵی لەدەست دەدات کەوای لێهاتبوو گۆشتی خۆی بەگاز لێدەکردەوەو شك و گومانی" لەهەموو کەسێك دەکرد،و قسەی ناشیرینی بەدەورووپشتەکانی دەگووت، و توانای بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی نەمابوو، هەربۆیە سەرکردەکانی ئەفغانی، بیریانکردەوە، کەوا میر مەحمود، لە دەسەڵات لابدەن و میر ئەشرەفی ئامۆزای میر مەحمود، لەشوێنەکەی دابنێن لەساڵی ١٧٢٥ز[٧٥].

**-فەرمانڕەوایی میر ئەشرەفی ئەفغانی لەئێران ١٧٢٥-١٧٢٩ز :-**

میر مەحمودی ئەفغانی[٧٦]، لەئەنجامی ناڕەزایی خەڵکی ئێران، لەدەسەڵاتی ئەفغانییەکان،و هەڵگەڕانەوەیان لەناوچە جیاجیاکانی ئێران، و ڕۆژ بە ڕۆژ ژمارەی ئەوانەی دەچوونە ریزی شا تەهماسبی دووەم، زیادی دەکرد، وە لەترسی هەڵگەڕانەوەی" خەڵکی شاری ئەسفهانیش، فرمانی کوشتنی سەرجەم شازادەکانی سەفەوی، دەرکرد، کەلەنێوانیاندا منداڵیش، هەبوو، هەربۆیە چەند ڕۆژێك دوای ئەم ڕووداوە، وەك سەرچاوەکان ئاماژەیان پێکردووە، میر مەحمود،

تووشی نەخۆشی دەروونی دەبێت، و باری تەندرووستی تێکدەچێت،و توانای بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتی نامێنێت[٧٧].

سەرکردەکان و پیاوماقوڵانی ئەفغانی، بڕیارانکردەوە کەوا پێویستە کەسێکی تر لەشوێنی میر مەحمود، دابنێن بۆ ئەوەی کاروباری وڵاتی ئێران، بەڕێوە ببات" هەربۆیە میر ئەشرەف ئامۆزای میر مەحمود یان، لەشوینی داناو کردیانە شای ئێران لەساڵی ١٧٥٢ز، کەدواتر بە میر ئەشرەف ناسرا، کەتاساڵی ١٧٢٩ز، فەرمانڕەوایی بە شێك لە ناوچەکانی ئێرانی کرد[٧٨].

هەرچەندە میر ئەشرەف، لە میر مەحمودی ئامۆزای، زیرەکترو بەتواناتر بوو، لەڕووی سیاسی، کارگێڕییەوە، لەسەرەتای هاتنە سەردەڵاتی هەوڵیدا خەڵکی ئێران، بەلای خۆیدا ڕابکێشێت، بەڵام لەو هەوڵەیدا سەورکەوتوو نەبوو لەبەر خەڵکی ئێران دژی دەسەڵاتی بێگانە بوون بەسەر وڵاتەکەیانەوەو، هەروەها داگیرکردنی چەندین ناوچەی بەپیت لە خاکی ئێران، لەلایەن هەردوو دەوڵەتی عوسمانی،و ڕووسیای قەیسەری، هەروەها دەرکەوتنی کەسایەتیەکی سەربازی بەتوانا" لەناوچەکانی خوراسان[٧٩]، کە ڕۆڵی بەرچاوی هەبوو، لە بەرەنگاربوونەوەو دەرپەڕاندنی سوپای داگیرکەران، لەناو خاکی ئێران، ئەویش نادر قولی ئەفشار، بوو کە دواتر بە نادر شا ناسرا، کەتوانی لەساڵی ١٧٢٩ز، بۆ هەتاهەتایە کۆتایی بە داگیرکاری ئەفغانییەکان بێنێت، لەئێراندا[٨٠].

**دووەم: سیاسەتی دەرەوەی ئەفغانییەکان.**

**١ـ بەرامبەر بە ڕووسیا :**

ڕووســیای قەیـسەری، لەســەردەمی پەترۆســی گــەورە ١٦٨٢-١٧٢٥ز، کەســەردەمەکەی بــەزێڕین، ناســراوە، لــەبوارەکانی سیاســی، و ئــابوری،و کۆمەلایەتیـەوە، هەولێـدا پەیوەندیـەکانی لەگـەڵ ئێـران، لـەڕووی بازرگانیـەوە، بــەهێز بکــات" تــاکوو بتوانێــت لــەڕێگای پەیوەندییــەکانی لەگــەڵ ئێرانــەوە، بەرژەوەندییە بازگانیەکانی بەدی بێنێت، ئەوانیش بریتی بوون، لە دروستکردنی پەیوەندی بازرگانی لەگەڵ هیندستان، لەڕێگای ولاتی ئێراندا، هـەروەها گەیشتن بە ئاوە شلتێنەکانی کەنداو،و پەیداکردنی سەروەری بازرگانی لەدەریای قـەزوین، کەلەژێر دەستی ئێراندابوو..." هەربۆ ئـەم مەبەسـتە پەترۆسی گـەورە، لەسـالی ١٧٠٠ز و ١٧١٥ز، داوای لەدەولـەتی سـەفەوی، کـرد کـەوا مـافی بازرگـانی، بـدات بەدەولەتی ڕووسیا، لە دەربەندی باکۆ، بەلام شای سەفەوی داواکەی ڕەتکردەوە " بـەلام لەسـالی ١٧٢٢ز، چـەند ڕووداوێـك ڕوویانـدا، بـوو بـە ڕێگـا خۆشـکەرو دەرفەتێکی زێڕین، بۆ پەترۆسی گەورە، بۆ ئەوەی هێرش بکاتە سەرخاکی ئێران ئەم ڕووداوانەش بریتی بـوون، لەهێرشـی ئەفغانییـەکان، بۆسـەر ئێـران،و گـرتنی شاری ئەسفەهان، لەسـالی١٧٢٢ز" هـەروەها هێرشـی لـەزگی یـەکان[٨١]، بـۆ سـەر شاری شەماخی،و بەتالانبردنی سەروەت،و سامانی بازرگانە ڕووسیەکان، ئەمەش دەرفەتێکی باش بوو بۆ پەترۆس، بـە بیـانووی پارێزگـاریکردن لـە هاولاتیـەکانی هێرش بکاتـە سـەر خـاکی ئێـران هـەر بۆیـە بـە سـوپایەکی ٢٢ هـەزار سـەربازی لەسـالی ١٧٢٢ز" بـەڕێگای دەریاییـەوە، هێرشـی کـردە سـەرباکووری ڕۆژئـاوای دەریـای قـەزوین" تـوانی بەئاسـانی دەسـت بەسـەر شـاری دەربەنـد لـەباکووری

ڕۆژئاوای دەریای قەزوین، دابگرێت و دواتریش دەست بەسەر زۆربەی شارەکانی کەناری دەریای قەزوین، دابگرێت[82].

پەترۆسی گەورەی قەیسەری ڕوسیا دوای ئەوەی توانی دەست بەسەر شاری دەربەند، دابگرێت بەبێ هیچ ڕووبەڕووبونەوەیەك، لەشاری دەربەند، هێزەکانی خۆی ڕێکخست بۆ ئەوەی لەهەنگاوی داهاتوودا دەست بەسەر شاری باکۆشدا بگرێت" بۆیە کاتێك ئەم هەواڵە گەیشتە سولّتانی عوسمانی، سولّتان ئەحمەدی سێیەم ١٧٠٣-١٧٣٠ز، زۆر تووڕە بوو نامەیەکی بۆ پەترۆسی گەورە، ناردو ئەگەر بێتوو زیاتر پێشڕەوی بکات، ئەوا ڕووبەڕووی سوپای عوسمانی دەبێتەوە" وە لەهەمانکاتیشدا میر مەحمودی ئەفغانی، سوپایەکی نارد، بۆگرتنی شاری ڕەشت، بەلاّم حاکمی شارەکە کەزانی توانای ڕووبەڕووبوونەوەی سوپای ئەفغانییەکانی نییە، داوای هاوکاری لە پەترۆسی گەورە، کرد بۆ دەرکردنی ئەفغانییەکان، لەبەرامبەردا کلیلی شاری ڕەشتی، پێشکەش دەکات[83]. ئەمەش ڕێگا خۆشکەر بوو بۆئەوەی ڕووسیا دەست بەسەر ناوچەکانی ڕەشت،و گەیلان،و مازندەران، دابگرێت، وەلە هەمانکاتیشدا ڕووسیا" ڕێکەوتنامەی پوترسبۆرگ[84] یان، لەگەڵ شا تەهماسبی دووەم، لە ٢٣/ئەیلولی/ ١٧٢٣ز مۆرکرد" لەبەرامبەر هاوکاری ڕووسیا، بۆ شا تەهماسبی دووەم،و گێڕانەوەی بۆ سەر دەسەلاّتی ئێران، و دەرکردنی ئەفغانییەکان، لەئێران، لەبەرامبەریشدا تەهماسبی دووەم، هەموو ناوچەکانی دەربەند، وباکۆ،و مازندەران، و ئەستەراباد، و گەیلان، و ڕەشت" بۆ تا هەتایە بداتە ڕووسیا بەلاّم لەڕاستیدا ئەم ڕێکەوتنامەیە تەنیا نووسینی سەر کاغەز بوو، چونکە لەهەمانکاتدا عوسمانییەکان، دەستیان بەسەر ناوچەیەکی فراوانی خاکی ئێراندا" گرتبوو لەناوچەکانی باکوور و ڕۆژئاوای ئێران خەریکبوو هەردوولا ڕووبەڕووی یەکتر دەبوونەوە، ئەگەر ناوبژیوانی فەڕەنسا،

نەبوایە" بەم شێوەیە ڕێکەوتنامەی ئەستەمبۆڵ یان، بەناوبژیوانی فەڕەنسا لە ٢٤/حوزەیرانی/١٧٢٤ز، مۆرکرد، بەمەبەستی دابەشکردنی ناوچەکانی باکوورو ڕۆژئاوای ئێران، لەنێوان هەردوولادا بەیەکسانی[٨٥].

بەپێی ئەو ڕێکەوتنامەیە ڕووسیا ناوچەکانی گەیلان و مازندەران، و ئەستەرابادو چەند ناوچەیەکی تری گرنگی لەخاکی ئێران، بەرکەوت، وە لەساڵی ١٧٢٥ز" پەترۆسی گەورە، کۆچی دوایی کرد،و ئیتر فراوانخوازیەکانی ڕووسیا لەناو ئێران وەستا لەدوای مردنی پەترۆسی گەورە لێرەدا ئەفغانییەکان، بەدرێژایی ئەو حەوت ساڵەی فەرمانڕەوایی ئێرانیان کرد، تەنانەت لەدوای هاتنە سەردەسەلاتی میر ئەشرەف ئەفغانیش، زۆر هەوڵیدا کەوا ئەو ناوچانەی کەلەلایەن ڕووسیاو عوسمانییەکان، دەستی بەسەر داگیراوە بیگەڕێنێتەوە" بەڵام سەرکەوتوو نەبوو، بەهۆی ئەو شۆڕش و ڕاپەڕینانەکانی کە خەڵکی ئێران، بەرپایان کردبوو، وە هێرشی ڕووسیا و عوسمانییەکانیش، لەهەمانکاتدا بەم شێوەیە زۆربەی ناوچەکانی ئێران، لەژێردەستی ڕووسیا" مایەوە تاکوو دەرکەتنی نادر قولی ئەفشار" کەتوانی هەموو ئەو ناوچانەی ڕووسیا دەستی بەسەر داگرتبوو، لە ڕووسیا، وەربگرێتەوە، لە ئەنجامی بەستنی دوو ڕێکەوتنامە لەگەڵ ڕووسیادا" کەرێکەوتنامەی(ڕەشت ١٧٣٢ز)، و ڕێکەوتنامەی (گەنجە ١٧٣٥ز)[٨٦].

### ٢- بەرامبەر بە عوسمانییەکان:

دەوڵەتی عوسمانی، لەسەردەمی سوڵتان ئەحمەدی سێیەم ١٧٠٣–١٧٣٠ز، کەسەردەمەکەی هاوچەرخ بوو لەگەڵ سەردەمی شاسوڵتان حوسێن شای سەفەوی، و هێرشی ئەفغانییەکان، بۆ سەردەوڵەتی سەفەوی" هەربۆیە

عوسمانییەکان زۆر بە وردی سەیری ڕووداوەکانی ئێرانیان دەکرد" وە کاتێك ئەفغانییەکان دەستیان بەسەر شاری ئەسفەهانداگرت، و دەوڵەتی سەفەوییان ڕووخاند، داماد ئیبراهیم پاشا[٨٧] سەدری ئەعزەم - گەورە وەزیری عوسمانی، نامەیەکی بۆ حەسەن شا، والی بەغدا، ناردوو داوای لێکرد، کەوا هێزەکانی خۆی ڕێکبخات و لەئامادەباشی دابێت، نەوەکوو ئەفغانییەکان لەدوای گرتنی ئەسفەهان، بێن و هێرش بکەنە سەر شاری بەغدا[٨٨]. هەربۆیە حەسەن شای والی بەغدا، نێردراوێکی نارده لای میر مەحمودی ئەفغانی، و داوای لێکرد کەوا هۆکاری هێرشیان بۆ سەر ئێران، بۆ ڕوونبکاتەوە، لەوەلامدا میر مەحمود، گووتی: ئێمە دژی عوسمانییەکان، نینەو بەڵکوو هاتووینە دەوڵەتی سەفەویی شیعە مەزهەب، لەناو ببەین، کە زوڵم و ستەم لەسەر زەوی بڵاو دەکاتەوە، لەڕاستیدا ڕووخانی دەوڵەتی سەفەوی دەرفەتێکی لەبار بوو بۆ دەوڵەتی عوسمانی، بۆ ئەوەی هێرشێکی بەرفراوان بکاتە سەرخاکی ئێران، و ژمارەیەك لە هەرێم و ناوچە دەوڵەمەندەکانی ئێران دەست بەسەر دابگرێت[٨٩].

عوسمانییەکان، لەچەند لایەکەوە هێرشیان کردە سەر ئێران،حەسەن شای والی بەغدا، لە ساڵی ١٧٢٣ز، توانی دەست بەسەر شاری کرماشان دابگرێت، بەبێ هیچ بەرەنگاربوونەوەیەك، دواتریش بۆ گرتنی شاری هەمەدان، بەڕێکەوت بەڵام بەهۆی هاتنی وەرزی زستان، شارەکەی بۆ نەگیراو گەڕایەوە بۆ شاری کرماشان" بەڵام حەسەن پاشا هەر لەوساڵەدا کۆچی دوایی کرد[٩٠]، لێرەدا سوڵتانی عوسمانی، ئەحمەد پاشای کوڕی حەسەن پاشای کردە والی بەغدا " کە لەساڵی ١٧٢٤ز، توانی شاری هەمەدان،دابگرێت" عوسمانییەکان، لەهەمانکاتدا لە ناوچەکانی باکووری ڕۆژئاوای ئێران، لەپێشڕەویدابوون، لە ناوچەکانی ئەرمەنستان،و گورجستان، ڕووسەکانیش" لەهەمانکاتدا دەستیان بەسەر شاری،

دەربەندو، ڕەشت،و ئەستەراباد، داگرتبوو[91]. خەریكبوو هەردوولا ڕووبەڕووی یەكتر دەبوونەوە، لەسەر ناوچە دەوڵەمەندەكانی ئێران، ئەگەر ناوبژیوانی فەرەنسا، نەبوایە هەربۆ ئەم مەبەستە لەساڵی ١٧٢٤ز، ڕێكەوتنامەی ئەستەمبۆڵیان، مۆركرد بۆ دابەشكردنی ناوچەكانی باكووری ڕۆژئاوای ئێران، لەنێوانیاندا.

بەم شێوەیە عوسمانییەكان، تا كۆتایی هاوینی، ١٧٢٥ز، توانیان هەموو هەرێم، و ناوچەكانی گورجستان، و ئەرمەنستان،و ئازربایجان،و شێروان...، بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە، وە لەناوچەكانی ڕۆژئاوای ئێرانیش، توانیان دەست بەسەر شارەكانی، كرماشان، و هەمەدان،و كوردستان، ئەردەلان...، دابگرن، ئەو فراوانخوازیانەی عوسمانی لەناوچەكانی ئازربایجان، و ئەرمینیا، تاڕادەیەك، پەیوەندی لەگەڵ ڕووسەكان، ئاڵۆز كردو، زۆر هەوڵیاندەدا كەوا عوسمانییەكان، پابەند بن بەو ڕێكەوتنامەیەی كەلە نێوانیاندا هەبوو، بەڵام عوسمانییەكان گوێیان پێنەدەدا و لەدوای ئەوەی میر ئەشرەفی ئەفغانی لە ساڵی ١٧٢٥ز، بوو بەشای ئێران، و دەسەڵاتی جێگیر بوو هەوڵیدا، هەموو ئەو ناوچانەی كە لە لایەن عوسمانییەكانەوە" دەستی بەسەر داگیرابوو بیگەڕێنێتەوە بۆ ژێردەسەڵاتی خۆی بۆیە نێردراوی خۆی ناردە ئەستەمبۆڵ، لەگەڵ ١٩ زانای ئایینی ئەفغانی[92] كە تیایدا ڕەخنە لە دەوڵەتی عوسمانی" دەگرن، كەوا چۆن هاوپەیمانی ١٧٢٤ز، لەگەڵ دەوڵەتێكی مەسیحی، وەكوو ڕووسیا، دەبەستێ، لە دژی دەوڵەتێكی موسڵمانی، سوننە مەزهەب" هەروەها ئاماژەیان بەوە كردبوو كە ئیسلام، ڕێگا دەدات لەكاتێكدا دوو پێشەوا ( ئیمام )، هەبێت، وە ئەفغانییەكان، لە پێشترن لە عوسمانییەكان، بۆ پێشەوایەتیكردنی موسڵمانان" چونكە ئەفغانییەكان لە نەوەی خالیدی كوڕی وەلیدن، بەڵام عوسمانییەكان توركن[93].

کاتێـك سـولّتانی عوسمـانی، گوێبیـستی ئـەم هەواڵـە بـوو زۆر تـوورە بـوو، هەربۆیـە داوای لـە ( شـیخ الاسـلام)[٩٤] کـرد کـەوا فەتوایـەك، لـە دژی فـەتوای زاناکـانی ئـایینی ئـەفغانی دەربکـات" لێـرەدا شـیخ الاسـلام وەلاّمـی فـەتوای ئەفغانییەکانی دایەوە، بەم شێوەیە، ئەگەر بەیعەت بە دوو خەلیفە، درا لەکتێکدا ئەوا دووەمیان دەبێت بکوژن" وەنابێت دوو ئیمام، لەیـەك کاتـدا هـەبێت، مەگـەر بەربەستێکی گەورە لەنێوانیاندا هەبێت، وە مـیر ئەشـرەفی ئـەفغانیان، بـە یـاخی بوو هەڵگەڕاوە لەئیسلام لە قەڵەم دا[٩٥].

سـولّتانی عوسمـانی، لەسـەر فـەتوای شـیخ الاسـلام، شـەڕی لـەدژی ئەفغانییەکان، ڕاگەیاند"و داوای لە ئەحمەد شای والی بەغدا، کـرد کـەوا هێـرش بکاتە سەر شاری ئەسفەهان، بـە مەبەسـتی دەرکردنـی ئەفغانییـەکان، لـە ئێـران لێرەدا ئەحمەد شـا، بەسـەرکردایەتی سـوپایەکی زیـاتر لـە ٦٠ هـەزار سـەبازی، بەرەو شاری ئەسفەهان، بەڕێکەوت کە لـە ڕیـزی سـوپاکەیدا ژمارەیـەکی زۆر لـە کوردەکـانی، میرنـشینەکانی سـۆران، و بابـان،و ئـەردەلان" بەشـداربوون کـە ژمارەیان لە ٢٠ هەزار کەس، زیاتر دەبوو سوپای ئەفغانییەکانیش، کە ژمارەیان نزیکـەی ٢٠هـەزار سـەرباز، دەبـوو بەسـەرکردایەتی مـیر ئەشـرەف" بـۆ ڕووبەڕووبوونـەوەی سـوپای عوسمـانی بەڕێکـەوت" هـەردوو سـوپا لـە دەشـتی ئەنجـدانی[٩٦]، کـە دەکەوێتـە نێـوان ئەسـفەهان و هەمـەدان لـە ٢٠/ تـشرینی دووەم/١٧٢٦ز، بەیەك گەیشتن[٩٧]. میر ئەشرەفی ئەفغانی، کەسێکی زیرەك و فـێڵ باز بوو، دەیزانی کە بەوسوپایە کەمـەی کەهەیـەتی نـاتوانێ ڕووبـەڕووی سـوپای عوسمانی بێتـەوەو بەسـەریاندا سـەربکەوێت، چـونکە تـەنیا ٢٠ هـەزار سـەربازی هەبوو" وە تۆپەکانیشی بە بەراورد لەتۆپی عوسمانی زۆر بچوك،و لاوازتـر بـوون" بۆیە هەوڵیدا دووبەرەکی بخاتە نـاو ڕیـزی سـوپای عوسمانییەکانـەوەو نوێنـەری خۆی ناردە لای ئەحمەد شا، دوای لێکرد کەوا چۆن شـەڕ لەگـەڵ ئەفغانییـەکان، دەکات لە کاتێدا ئەوانیش وەکوو خۆتان، سوننە مەزهەبن[٩٨].

بەڵام ئەحمەد شا، لەوەڵامدا گوتی ئەفغانییەکان، میللەتێکی دواکەوتوو و بێئەسڵو نەسەبن،و ئێمە هاتووینە تاکوو دەسەڵاتی ئێران، بۆ خاوەنە شەرعییەکەی خۆی بگەڕێنینەوە، مەبەستی شا سولتان حوسێن، بوو هەربۆیە ئەشرەف خان، بەخێرایی چەند کەسێکی ناردەوە بۆ ئەسفەهان، و شا سولتان حوسێنیان کوشت و سەرەکەشیان، بۆ ئەحمەد شای والی بەغدا، نارد هەروەها جگە لەمەش توانی دووبەرەکی بخاتە ناو سوپای عوسمانی" و ژمارەیەکی زۆر لە سەرۆك هۆزە کوردەکان[99]، لەڕیزی سوپای عوسمانی جیا بکاتەوە، کە ژمارەیان ٢٠هەزار کەس دەبوو" لەڕێگای پێدانی دیاری و خەلات، هەروەها پلەی خانیان پێ بدات لەناوچەی وڵاتی فارس[100].

بەم شێوەیە شەڕ لەنێوان هەردوولا دەستی پێکرد، و ئەفغانییەکان، توانیان سەرکەوتنێکی گەورە، لەم شەڕەدا بەدەست بێنن بەسەر عوسمانییەکانەوە،و نزیکەی ١٢هەزار کوژراو لەمەیدانی جەنگدا بەجێ بێڵن" دواتر لەکۆتایی ساڵی ١٧٢٧زدا " هەردوولا ڕێکەتنامیەکیان مۆرکرد، بۆ کۆتایی هێنان بە کێشەکانی نێوانیان، کە گرنگترین خاڵەکانی، بریتی بوولە" هەموو ناوچە داگیر کراوەکانی ئێران، لەژێر دەستی عوسمانییەکاندا، بمێنێتەوە، هەروەها ئەشرەف خان، دان بە خەلیفایەتی سولتانی عوسمانی بنێت، وەکوو خەلیفەی هەموو موسڵمانان، هەروەها دەوڵەتی عوسمانیش" دان بە دەسەڵاتی ئەشرەف خان دەنێت وەکوو شای ئێران بەم شێوەیە عوسمانییەکان، هەموو ئەو هەرێم، و ناوچانەی وڵاتی ئێران" کە لەدوای ڕووخانی سەفەوییەکان، دەستیان بەسەر داگرتبوو لەژێر دەستیان مایەوە، تاکوو دەرکەوتنی نادر قولی ئەفشار، لە ئێران، کە نەك تەنیا توانی هەمووناوچەکانی ئێران" لە عوسمانییەکان، وەربگرێتەوە، لەساڵی ١٧٣١ز، بەڵکوو چەند جارێکیش هێرشی کردە سەر شاری بەغدا، بە مەبەستی گرتنی[101].

**تەوەرەی سێ یەم:-**

## فەرمانڕەوایی میر ئەشرەفو، کۆتایی هاتنی حوکمرانی ئەفغانییەکان لە ئێران.

## یەکەم ـ ململانێی پاشماوەی سەفەویەکان لە دژی ئەفغانییەکان لە ئێران.

## تەهماسب میرزا ـ شا تەهماسبی دووەم

لەڕاستیدا زۆربەی زۆری مێژوو نووسان، پێیان وایە، کەوا مێژووی دەوڵەتی سەفەوی، بە هێرشی ئەفغانییەکان، بەسەرکردایەتی میر مەحمودی ئەفغانی، لەساڵی ١٧٢٢ز، بۆ سەر ئێران، و گرتنی شاری ئەسفەهان کۆتایی پێدێت، بەڵام هەندێکی تر لە مێژوو نووسان ساڵی ١٧٣٦ز، بەساڵی ڕووخان، و لەناوچوونی ماوەی فەرمانڕەوایی سەفەوییەکان، لە ئێران، دادەنێن چونکە لە دوای دەرکردنی ئەفغانییەکان، لە ئێراندا، دوو شای تری سەفەوی حوکمڕانی وڵاتی ئێرانیان، کردووە تا ساڵی ١٧٣٦ز،وە نازناوی شای سەفەویشیان هەڵگرتووە. ئەوانیش: شا تەهماسبی دووەم، و شاعەباسی سێ یەم بوون، ماوەی فەرمانڕەوایی ئەم دووشایەش، بە بەشێك لە مێژووی بنەماڵەی سەفەوییەکان، دادەنێن کە لەساڵی ١٧٣٦ز، لەلایەن نادر قولی ئەفشار، بە یەکجاری کۆتاییان پێهات[١٠٢].

لە دوای شکانی سوپای ئێران، لە شەڕی گوڵناباد، لە ساڵی ١٧٢٢ز، لە بەرامبەر سوپای ئەفغانییەکاندا، لە کاتی گەمارۆدانی شاری ئەسفەهان، زۆربەی سەرکردەو گەورە کاربەدەستانی سەفەوی، گەیشتنە ئەو بڕوایەی کەوا پێویستە یەکێك، لە کوڕەکانی شا سوڵتان حوسێن، دەست نیشان بکەن" بۆ ئەوەی بیکەن بە وەلی عەهد– جێنشین[١٠٣]، و بۆ ئەوەی ڕەوانی دەرەوەی شاری ئەسفەهانی بکەن، تاکوو بتوانێت، هێزێکی سەربازی و سوپایەك کۆبکاتەوەو، شاری ئەسفەهان، و دەوڵەتی سەفەویش، لە ڕووخان و هەڕەشەی داگیرکەران ڕزگاربکات[١٠٤].

هەربۆیە کاربەدەستانی سەفەوی[105]، سەرەتا کوڕی گەورەی شا سوڵتان حوسێن، سوڵتان مەحمود میرزا، یان کردە وەلی عەهد- جێنشین،لە ١٠/مارسی/١٧٢٢ز، بەڵام لە دوای چوار ڕۆژ لایانداو، کوڕی دووەمی شا حوسێن، یان کردە جێنشین کە ناوی سەفی میرزا، بوو لە ١٤/مارسی/١٧٢٢" بەڵام زۆری پێنە چوو ئەویشیان لاداو کوڕی سێ یەمی شا سوڵتان حوسێن، تەهماسب میرزا، یان کردە جێنشین لە ٢٦/مارسی/١٧٢٢ز[106]. دواتر لەگەڵ ژمارەیەك لە هاوەڵانی، بەنهێنی و دوور لەچاوی سوپای ئەفغانییەکان، لەشاری ئەسفەهان، چوونە دەرەوە سەرەتا بۆ شاری کاشان، و دواتر ڕۆیشت بەرەو شاری قەزوین، بە مەبەستی کۆکردنەوەی سوپاو ڕزگارکردنی شاری ئەسفەهان، لە گەمارۆی ئەفغنەکان[107].

ئەو کاتەی کە تەهماسب میرزا" لە شاری قەزوین، بوو بە مەبەستی کۆکردنەوەی سوپا، لە هەمانکاتدا هەواڵی گرتنی شاری ئەسفەهانی، پێگەیشت هەربۆیە ڕاستەو خۆ دوای ئەم هەواڵە خۆی بە شای سەفەوی ڕاگەیاند، لە ژێرناوی شا تەهماسبی دووەم لە ساڵی ١٧٢٢ز، میر مەحمودی ئەفغانیش، دوای گرتنی شاری ئەسفەهان، خۆی وەك شای نوێی ئێران، ڕاگەیاندوو، دواتریش سوپایەکی بە سەرکردایەتی ئەمانوڵلا خان، لە ساڵی ١٧٢٣ز، نارد بۆگرتنی شاری قەزوین، بە مەبەستی لەناوبردنی هەڕەشەو مەترسی شا تەهماسبی دووەم"لێرەدا شا تەهماسبی دووەم، کاتێك هەواڵی هاتنی سوپای ئەفغانی، بەرەو شاری قەزوین، بیست، بەهۆی ئەوەی کەتوانای ڕووبەڕوو بوونەوەی سوپای ئەفغانییەکانی، نەبوو ناچاربوو لەگەڵ ژمارەیەکی کەم، لەسوپاکەی شاری قەزوینی، بەجێهێشت و ڕوویکردە ناوچەی ئازربایجان، و شاری تەورێز[108].

لێرەدا سوپای ئەفغانی، بەبێ هیچ بەرەنگاربوونەوەیەك، چوونە ناو شاری قەزوین و دەستیان بە سەرداگرت، بەڵام دواتر بە هۆی ئەو زوڵم، و ستەمەی کە

سوپای ئەفغانییەکان، لە خەڵکی شارەکەیانکرد، بووە هۆی ڕاپەرینی خەڵکی شارەکە لەدژی سوپای ئەفغانییەکان و توانیان هێرشیان بکەنە سەروو ژمارەیەکی زۆریان لێ بکوژن لەساڵی ز١٧٢٣، لێرەدا ئەمانوڵڵاخانی سەرکردەی سوپای ئەفغانی بەزحمەت توانی خۆی ڕزگاربکات، کاتێك میر مەحمود هەواڵی شکانی سوپای ئەفغانییەکانی لەشاری قەزوین" پێگەیشت زۆر توورەبوو هەستا بە کوشتنی ژمارەیەکی زۆر لە خانەدان و گەورە کاربەدەستانی" دەوڵەتی سەفەوی و کورەکانیان و کوشتنی نزیکەی سێ هەزار کەس لە قزلباشەکان[١٠٩].

شا تهماسبی دووەم، بەهۆی ئەوەی هیچ سوپایەکی وای نەبوو، تا بتوانێت ڕووبەڕووی ئەفغانییەکان، بێتەوە هەربۆیە بەمەبەستی بەدەستهێنانی هاوکاری، پەنای بۆ هەموولایەك دەبرد تەنانەت دووژمنە دێرینەکەشی، کە دەوڵەتی عوسمانی بوو بۆ ئەم مەبەستە دوو نوێنەری خۆی نارد، یەکیان بۆ دەوڵەتی عوسمانی، بەناوی مورتەزا قولی بەگ[١١٠]، لە مانگی ١٧٢٣/١٠ز، گەیشتە ئەستەمبوڵ، و داوای هاوکاری لە عوسمانییەکان، کرد بۆ دەرکردنی ئەفغانییەکان، لەئێران، بەڵام نەگەیشتنە هیچ ئەنجامێك، چونکە نوێنەری تەهماسب، ڕازی نەبوو لەبەرامبەر هاوکاری عوسمانییەکان، چەند ناوچەیەکی گرنگی ئێران بداتە دەوڵەتی عوسمانی، نێردراوی دووەمیشیان، بۆ ڕووسیا، بەسەرکردایەتی ئیسماعیل بەگ[١١١]، بوو ڕێکەوتنامەیەکی لەگەڵ ڕوسیا مۆرکرد لە شاری سان پترسبۆرگ لەئەیلەلی/١٧٢٣ز، کە تیایدا تەهماسبی دووەم، ڕازیبوو هەموو ناوچەکانی کەناری دەریای قەزوین، و هەرێمەکانی گەیلان، ومازندەران، وئەستەرئاباد، بدات بە ڕووسیا، لەبەرامبەر دەرکردنی ئەفغانییەکان لەئێران، و گێڕانەوەی سەفەوییەکان، بۆ سەر دەسەڵات بەڵام لەڕاستیدا ئەم ڕێکەوتنامەیە تەنیا نووسینی سەر کاغەز بوو، چونکە لەهەمانکاتدا عوسمانییەکان، دەستیان

بەسەر ناوچەیەکی دەوڵەمەندی خاکی ئێراندا گرت"و دواتر هەردوولا لە سەر لاشەی ئێران ڕێکەوتنامەی ١٧٢٤ز، مۆرکرد[١١٢].

کاتێك میر ئەشرەفی ئەفغانی، لە ساڵی ١٧٢٥ز، دەسەڵاتی گرتە دەست لەدوای مردنی میر مەحمود، هەوڵیدا بە فێڵێك، شا تەهماسبی دووەم، دەستگیر بکات، و لەناوی ببات ئەگەر لەلایەن گەورە کاربەدەستانی سەفەوی کە لە ئەسفەهان، مابوونەوە ئاگادار نەکرابایەوە لەم پیلانەی میر ئەشرەفی ئەفغانی[١١٣]. سەرەتای پیلانەکە بەم شێوەیە بوو میر ئەشرەف، بەر لەوەی بێتە سەردەسەڵات، لە بەندیخانە بوو هەربۆیە داوای لە شا تەهماسبی دووەم، کرد ئەگەر بێتوو لە بەندیخانە ڕزگاری بکات ئەوا هاوکاری دەکات بۆ لەناوبردنی، میر مەحمودی ئەفغانی،و گەڕانەوەی بۆ سەر دەسەڵات بەڵام کاتێك میر مەحمود، دووچاری نە خۆشی شێتی بوو لە ساڵی ١٧٢٥ز، هەستا بەکوشتنی سەرجەم شازادەکانی سەفەوی" ئەم ڕووداوە ڕێگا خۆشکەر بوو بۆئەوەی ئەشرف خان، دەسەڵات بگریتە دەست، لە١٧٢٥ز، و مەحمودی ئامۆزای لەناوببات[١١٤].

بۆیە دوای ئەوەی میر ئەشرەف، هاتە سەردەسەڵات، هەوڵیدا وا نیشان بدات کەوا نیازی پاکەو، مەبەستی چارەسەر کردنی کێشەکانی نێوانیانە، هەربۆیە نوێنەری خۆی بۆلای تەهماسبی دووەم، ناردو داوای لێکرد کەوا لە شوێنێك لەنێوان شاری تاران، و قوم، چاویان پێك بکەوێت، بەڵام بەومەرجەی هەردوولا سوپا لەگەڵ خۆیان نەبەن، جگە لە چەند کەسێك نەبێت[١١٥]. بۆیە کاتێك تەهماسبی دووەم، چوو بۆ شوێنی مەبەست لەلایەن گەورە کاربەدەستانی سەفەوی، لەنیازی ئەشرەف خان، ئاگاداریانکردەوە، کەوا ئەشرەف، بەسوپایەکی زۆرەوە بۆ ناوچەکە دێت بەمەبەستی لەناوبردنی هەربۆیە شا تەهماسبی دووەم، ڕایکردوو توانی لەپیلانی میر ئەشرەفی ئەفغانی، ڕزگاری بێت، دواتر شا تهماسب، لە مانگی ١٧٢٥/١٢ز، لەنزیك شاری تاران، لەگەڵ

[123] مجید دوامی، طوطی، انتشارات راستی نو، تهران، چ۱، ۱۳۸۲هـ.ش، ص۵ " مرتضی راوندی، پیشین،ج۲، صص۴۳۸-۴۳۹.

[124] شوکروڵڵای بابان، س.پ، ل۱۹۰" ئەکرەم جەمیل شا، مێژووی کوردستان، و:فەیزوڵڵابرایم خان- بارزان وەهاب، چ.بیر، دیار بەکر،تورکیا، چ۲، ۲۰۰۷، ل ل۱٦۲-۱٦٤.

[125] **مەلیك مەحمودی سیستانی**، یەکێك بوو لە سەرکردەکانی ناوچەی خوراسان، کە بە رەچەڵەك دەگەڕایەوە بۆ سەر سەفارییەکان، و ماوەیەکی کەم بەر لەهێرشی ئەفغانییەکان، بۆ سەر ئێران، توانی دەست بە سەر شاری مەشهەد، و چەند ناوچەیەکی تر لە خوراسان، دابگرێت،و ناوی لە خۆینا مەلیك، و سکە بە ناوی خۆی لێدا، خوتبەش بەناوی ئەو دەخوێنرایەوە" وە لەکاتی هێرشی میر مەحمودی ئەفغانی، بۆ سە دەوڵەتی سەفەوی، هیچ بەرەناگرییەکی سوپای ئەفغانی نەکردوو، لەگەڵ میر مەحمود، رێککەوت، کە لە ناوچەی خۆیدا بە شێوازێکی سەرەخۆ فەرمانڕەوایی بکات. بۆ زانیاری زیاتر بروانە، محمد شفیع تهرانی، مرآت واردات، تحقیق. منصور صفت طل، انتشارات میراث مکتوب، تهران، ض۱، ۱۳۸۳ه.ش،صص ۱۱۸-۱۲۵"رضا شعبانی، تاریخ اجتماعی ایران در عصر افشاریة، ثیشین، ج۱، صص۱۷-۲۱.

[126] پناهی سمنانی، پیشین، صص۸۰-۸۱" محمد شفیع تهرانی، همان، صص۱٤۷-۱٥۲.

[127] هۆکاری ئەوەی کەوا نادر قولی، ڕازی نەبوو سوپاکەیان یەك بخەن، لەوە دەترسا ئەگەر هاتوو لەو شەڕەدا سەرکەوتن، ئەوا دژایەتی ئەو بکەن و لەگەڵی بە شەڕبێن.

[128] لارنس لاکهارت، پیشین، ص۲٦۸.

[129] تەهماسب قولی، نازناوێك بەمانای بەندە-غوڵام- خزمەتکاری تەهماسب دێت لەلایەن شاتەهماسب دووەم درا بە نادرقولی ئەفشار، ئەم نازناوەش زیاتر لە لایەن شاکانی سەفەوی دەدرا بەوکەسانەی کە ئازاو لێهاتوو بوونایە لەرووی سەربازییەوە.

[130] رضا شعبانی، تاریخ ایران در عصر افشاریه، پیشین، ج۲، ص۱۰٦.

[131] لارنس لاکهارت، پیشین، ص۲٦۸" عبدالعظیم رضایی، پیشین، ج٤، ۱٤.

[132] لەڕاستیدا هۆکاری کوشتنی فەتح عەلیخانی قاجار، لە لایەن نادر قولیی ئەفشار، دەگەڕێتەوە بۆ هەوڵو دژایەتیەکانی فەتح عەلیخان، بۆ نادر قولیو، شا تەهماسبی دووەمەوە، کە فەتح عەلیخان، هەولیداوە خۆی تاکە کەس بێت و کەسێکی تر نەبێت بەرهەڵستکاری بکات، بۆیە کاتێك نادر سا چووە ریزی تەهماسبی دووەمەو، ژمارەیەکی زۆر لەکوردەکانی ناوچەی خوراسان، چوونە ریزی سوپای تەهماسبی دووەمەوەو، بەمەش رۆژبەرۆژ پێگەی بەهێزتر دەبوو، لێرەدا فەتح عەلیخان، ئەمەی بە هەرشەیەك بۆ سەر پێگەو دەسەڵاتی خۆی دەزانی، و لەدەرفەتێك دەگەڕا تاکوو بتوانێت نادر، لەناو ببات، ئەوەی وایکرد کەوا پەیوەندی نێوان نادر، و فەتح عەلیخان، تێك بچێت دەگەڕێتەوە بۆ:- أ- فەتح عەلیخانی قاجار لەکاتی گەمارۆدانی

شاری مەشهەد، نوێنەری خۆی بەنهێنی بۆ لای ( مەلیك مەحمودی سیستانی )، رەوانەکردووەو داوای لێکردووە کەوا ببنە هاوپەیمانی یەکتری بەمەبەستی لەناوبردنی نادر قولی. ب- هەروەها یەکێکی تر لەو هۆکارانەی کەبووە هۆی تێکچوونی پەیوەندی نێوان نادر قولیو، فەتح عەلیخانی قاجار، کوشتنی ژمارەیەکی زۆر لە سەرۆك هۆزە کوردەکانی ناوچەی ( خەبوشان) لەلایەن فەتح عەلیخانی قاجار، وە بەهۆی ئەوەی کوردەکان، بەشێکی سەرەکی سوپای نادر قولیان، پێکدەهێنا هەربۆیە داوای هاوکاریان لە نادر قولی، کرد لەدژی فەتح عەلیخانی قاجار. بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە بۆ ( لارنس لاکهارت، پیشین، صص٢٦٩-٢٧٠" پناهی سمنانی، پیشین، صص٧٦-٧٩)" عەلی نەقی ئەلحوسەینی، مێژووی ٦٤١ ساڵەی فەرمانڕەوایی ئەردەلانییەکان، س.پ، ل.ل ٣٨-٤١.

[133] پناهی سمنانی، همان، ص٧٩.

[134] پناهی سمنانی، کریم خان زند،پیشین، ص١٢"حسن پیرنیا، پیشین، ص٧١٢" علی اصغر شمیم، پیشین، ج١٠، صص٢٦-٢٧.

[135] لەدوای گرتنی شاری مەشهەد، شا تەهماسبی دووەم، داوای لەنادر، کرد کەوا هێرش بەکەینە سەر شاری ئەسفەهان، و دەرکردنی میر ئەشرەفی ئەفغانی، لە ئێران، بەڵام نادر قولی پێی وابوو سەرەتا کە سەرەتا پێویستە هێرش بکاتە سەر شاری هەرات، ئەوەش بەهۆی ئەوەی **یەکەم:- هۆزەکانی** شاری هەرات، ململانێی ناوخۆییان هەبوو لەسەر دەسەڵات، ئەمەش دەرفەتێکی باشبوو بۆ نادر، کەوا هێرشیان بکاتە سەر. **دووەم :-** نادر قولی، پێی وابوو کەوا ئەگەر سەرەتا هێرشی کردە سەر شاری ئەسفەهان، لەوانەیە ئەفغانییەکانی شاری هەرات، لە پشتەوە هێرشی بکەنە سەر، هەربۆیە بۆ ئەوەی لە پشتەوەی خۆی دڵنیا بێتەوە، سەرەتا هێرشیکردە شەر شاری هەرات. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە : عبدالعظیم رضایي، پیشین، ج٤، ص١٦.

[136] **کافر قەلعە**، ناوی قەڵایەك بوو، کە دەکەوتە نزیك شاری هەرات، بەڵام ئێستا ناوی گۆڕاوە بۆ **ئیسلام قەلعە**، وە شەڕی یەکلاکەرەوەی نێوان، نادر قولی، و ئەفغانیە ئەبداللیەکانی شاری هەرات، لەوێ ڕوویدا، لە ساڵی **١٧٢٨ز**، کە لە ئەنجامدا نادر قولی سەرکەوتنی بەدەستهێناو دەستی بەسەر شاری هەرات، داگرت. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: لارنس لاکهارت، پیشین، ص٢٨٤" رضا شعباني،مروري کوتاه بر تاریخ ایران،ئیشین،ص٥٢٠.

[137] پناهی سمنانی، پیشین، صص٧٧-٧٨.

[138] مێهماندۆست،ئەو ناوچەیە بوو لە نزیك شاری سمنان، هەردوو سوپای ئێرانی و ئەفغانی، تیایدا ڕووبەڕووی یەکتر بوونەوە، ئەفغانییەکان لەشەڕەداشکان و ڕایانکرد. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: عبد الحسین زرین کوب، روزگاران، پیشین، ص٧٤٣.

[139] پناهی سمنانی، همان، صص٨٨-٨٩" عبد الحسین زرین کوب، روزگاران، پیشین، ص٧٤٣.

[140] لارنس لاکهارت، پیشین، ص٢٩١"رضا شعبانی، تاریخ اجتماعی ایران از اغاز عصر مادها تاپایان دوران قاجاریه، منبع پیشین، ٥٢٠.

[141] لارنس لاکهارت، همان، صص٢٩٠-٢٩٣" پناهی سمنانی، پیشین، ص٩٥.

[142] حسن پیرنیا، تاریخ ایران، پیشین، صص٧١٣-٧١٥.

[143] محمد هاشم اصف، پیشین، صص ١٩٢-٢٠٠" حسن پیرنیا، پیشین، صص٧١٥-٧١٧.

[144] همان، صص ٢٠٧-٢٠٩" رضا شعباني،تاريخ اجتماعی ایران در عصر افشاریه،پیشین، ج٢،ص٢٠.

[145] حسن کریم جاف، م.س، ص٩١" نەجاتی عەبدوڵڵا، س.پ، ل ل٥٥-٦٠" هنری مورتمیر دوراند، نادرشاه،ت:مهندس سید عبدالرضا بلادی، انتشارات نوید،شیراز،چ٢، ١٣٨٦هـ.ش.ص.٤٠٠،ص٣٠٥.

[146] پیتر اوری، پیشین،ص٥٨" رضا شعباني،تاريخ اجتماعی ایران در عصر افشاریه،پیشین، ج٢،ص٤١" هنری مورتمیر دوراند، همان صص٣٠٣-٣٠٧.

[147] لارنس لاکهارت، پیشین، صص٢٩٣-٢٩٧"عبد العظیم رضایي،ثیشین،صص٣٢-٣٥" حسن کریم جاف، م.ن،ص٩١" منصور صفت گل، پیشین، ص٣٤٦.

# پەیوەندیەکانی شەریف حسین و حکومەتی بەریتانیا

ئامادەکردنی قوتابی ماستەر:
قـارەمان حەیـدەر رەحمان

## پێشەکی

مێـژووی عـەرەبی نـوێ و هاوچـەرخ توێژینەوەیـەکی زۆری لەسـەر هەیـە کەتایبـەتن بـە گێرانـەوەی رووداوە مێژوییـەکانی رووبـەرووی جیهـانی عـەرەبی بۆتەوە،بەلاّم سەیردەکەین لە گرنگترین ئەو کێشانەی کەوا دێنە پـێش توێـژەران بریتیـە لـە جیاکردنـەوەی قۆنـاغی نـوێ و هاوچـەرخی ئـەم مێژووە،بـەهۆی تێکەلاّوبوونی رووداوەکـان بەیـەکتری، هەربۆیـە بـە تێروانینـی مێژوونوسـان ئـەم قۆناغـە زۆر گـرنگ و پـر لەبایەخـە بـەهۆی ئـەوەی ئـەو قۆناغـە بـە قۆنـاغی گواسـتنەوە دادەنرێـت لـە مێـژووی عـەرەب ، بـەجۆرێك لـە قۆنـاغی حـوکمی عوسمانی و سەپاندنی رژێم وسیستەمی ئەو دەوڵەتە هەر لـە ساڵی ١٥١٧ز تـاکو هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانی ناوچەکە و فـەرمانرەوایانی لـەژێر فـەرمانی دەوڵەتی عوسمانیدا کاروباریان بەرێوە کردووە،دواتر لەگەڵ هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانی و نزیك بوونەوەی بەرژەوەندی سیاسی و ئـابووری و عەسـکەری وولاّتـانی زلهێـزی ئـەورووپی بەگـشتی و بـەریتانیا بەتایبـەتی لەناوچـەکە رەنگدانـەوەی دەبێـت لەسـەر دروسـت بـوونی پەیوەنـدی لـە نێـوان عـەرەب و هاوپەیمان، کەدواتریش دەبێتە هۆی رزگاربوونی عەرەب لـەژێر چـنگی دەوڵـەتی

عوسمـــانی بـــەهۆی هەڵگەرانـــەوەو ڕاپـــەڕینی ناوچـــەکانی حیجـــاز وشـــام و بەدەستهێنانی سەربەخۆیی لەو دوو هەرێمەدا ، وێرای گۆڕینی بارودۆخی سیاسی و ئیداری ناوچەکانی تری ڕۆژهەلاتی عەرەبی وەکو عێراق و سوریا و فەلەستین.

لەو توێژینەوەیەدا هەوڵدراوە کە باس لە دەستپێکی ئـەو گۆرانکاریانـەو ئـەو هەولانەی شـەریف حـسێن بکرێـت لەگـەڵ حکومـەتی بـەریتانیا بۆئـەوەی بتـوانن سـەربەخۆی و ئـازادی خۆیـان بەدەسـت بهێـنن بـە هاوکـاری و کۆمـەکی بەریتانیەکان، بەر لەدروست بـوونی پەیوەندیـەکانی شـەریف حـسێن و بـەریتانیا تیشکمان خستۆتە سەر ئەو فاکتەرانەی کە بوونە هۆی نارەزایی شـەریف حـسێن لەبەرامبەر سیاسەتی ئیتحادیەکان.

لە تەوەرێکی تـری باسـەکەدا بـەووردی باسـی بـارودۆخی هـەرێمی حیجـاز و کاردانەوەی شـەریف حـسێن لەبەرامبـەر سیاسـەتی خۆسـەپێنی ئیتحادیـەکان و نزیکبوونەوەی لـە بەریتانیـەکان کـراوە لـە کـاتی هەڵگیرسـانی جـەنگی یەکـەمی جیهانیدا،کەدواتر لە چوارچـێوەی پـەیوەندیـەکی دیبلۆماسـیدا شـەریف حـسێن و هنری مەکماهۆن لە لایەنی بەریتانی ژمارەیەك نامە ئاڵوگۆر دەکەن کە لە مێژوودا ناسـراوە بـە نامەگۆڕینـەوەکانی حـسێن — مـەکماهۆن و کاریگەریـەکانی بەسـەر ڕاپەڕینی گەڵی عەرەبی لە حیجاز خراوەتە ڕوو.

لە چوارچێوەی ئەو باسەدا باسمان لە کەسایەتی شەریف حـسێن بـن عـەلیو گـرنگترین سـیماو خاسـیەتەکانی ئـەو سـەرکردەیەمان خـستۆتە ڕوو، وێـرای باسـکردنی گـرنگترین هۆکارەکـانی پاڵنـەربوون بـۆ ڕاپـەڕینی گـەڵی عـەرەبی لـە حیجاز تیـشکی خراوەتـە سـەری لـەدوای گەڕانـەوە بـۆ پـەیوەندیـەکانی شـەریف حسێن بە حکومەتی بەریتانیاوە.

لەکۆتایی باسەکەم دا رژاومەتە سەر باسکردنی سەرکەوتنی شۆرشی عەرەبی لە حیجاز و دامەزراندنی حکومەت و پاڵشتی بەریتانیەکان بۆ شەریف حسێن، دواتریش ئەو گۆرانکاریە لە بارودۆخی سیاسی و ئابووری و عەسکەرییەی حیجاز دەخەمە روو کە بەهۆی زیادەرۆیی کردنی شەریف حسێن لە ئامانجەکانی رووبەرووی دەبێتەوە ، کە لە کۆتایی بە کۆتایی هاتنی دەسەلآتی ئەشرافەکان تەواودەبێت لە حیجاز.

## تەوەری یەکەم:

## پەیوەندیی شەریف حسێن و ئیتحادیەکان لە دەوڵەتی عوسمانی

شەریف حسێن* بە یەکێك لە کەسایەتیە گرنگەکانی مێژووی عەرەبی نوێ دادەنرێت ، لە لایەنەکانی ئاینی و نەتەوەیی و سیاسی، لەهەمان کاتدا لە سالّی ١٩١٦ز تاکو سالّی ١٩٢٥ز بوو بە کەسایەتیەکی جیهانی بەهۆی فەرمانرەوایەتی کردنی میرنشینی حیجاز، بۆیە بە پێویستی دەزانین کورتەیەك لەبارەی ژیانی باس بکەین ،لەو کاتەی کە بووە شەریفی مەککە تاکوو راگەیاندنی شۆرشەکەی لە حیجاز سالّی ١٩١٦ز. شەریف حسێن لە سالّی ١٨٥٣ لە ئەستانە لە دایك بووە ، بەهۆی ئەوەی بنەماڵەکەی لەو کاتەدا لە ئەستانە نیشتەجێ بوینە . دواتر لەگەلّ خانەوادەکەی چونەتە مەککە ،لەو کاتەشدا شەریف حسین تەمەنی تەنها دوو سالآن بووە. لە سالّی ١٨٥٥ز باپیرەی حسێن پۆستی شەریفی مەککەی هەبووە ،دوای مردنی باپیرەشی ئەو پۆستە گواستراوەتەوە بۆ مامەکەی کەناوی شەریف عەبدوللا بن مەحەمەد بن عەون بووە لەسالّی ١٨٥٧ز. شایانی باسە شەریف حسێن لەدوای مردنی باوکی لەسالّی ١٨٧٠ز لەلایەن مامەکەیەوە سەرپەرشتی و پەروەردەکراوە، وەکو دابو نەریتی

عەرەبەکانی نیمچە دورگەی غەرەبی کە منداڵەکانیان بەشێوازی تایبەت پەروەردە دەکرد، ئەمیش هەرلە منداڵیەوە فێری خوێندن و نوسین و فوقه کراوە لەئاین و رایان هێناوە لەسەر سوارچاکی و ڕاوچیەتی. دواتر هەڵدەستێ بە مارەکردنی کچە مامەکەی خۆی بەناوی (عوبیدە خانم)وە سێ کوری دەبێت بە ناوەکانی عەبدوللا و فەیسەڵ و عەلی([2]). ململانێ لەسەر پۆستی شەرافەتی مەککە دەبێتە هۆکار بۆ دروستبوونی ئاڵۆزی و پەشێوی لە نێوان بنەماڵەی هاشمیەکان و ئال عەون لە حیجاز ، بنەماڵەی هاشمیەکان ئەو پۆستە لە ساڵی ١٨٨٢زبەدەست دەهێنن، هەربۆ مەبەستی ئاسایی کردنەوەی دۆخەکە باب ئەلعالی بانگهێشتی حسێن دەکات بۆ ئەستانە لە ساڵی ١٨٩٣زو دەیخاتە ژێر نیشتەجێبوونی زۆرە ملێ(ألاقامةالجبرية)، ماوەی پانزدە ساڵان لە ئەستانە مایەوە تاکو لەدوای کودەتای ئیتحادیەکان لە ساڵی ١٩٠٨ز بووە شەریفی مەککە ([3]) .

سەبارەت بە دامەزراندنی شەریف حسێن وەکو شەریفی مەککە بیرورای جیاوازی لەسەر هەیە ، کەباس لە هەڵویستی هەریەك لە سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمی عوسمانی و لە بەرامبەریشدا باس لە هەڵویستی ئیتحادیەکان لەمەڕ دامەزراندنی حسێن دەکەن لەو پۆستەدا، بەجۆرێك هەندێك پێیان وایە کەوا حسین بە پشتگیری سولتان ئەو پۆستەی وەرگرتووە بۆ کەمکردنەوی دەسەلأتی ئیتحادیەکان، لە بەرامبەردا هەندێك پێیان وایە ئیتحادیەکان پشتگیریان کردووە بۆ وەرگرتنی ئەو پۆستە.

بەلأم دەکرێ بلێن لەبەرئەوەی لەوکاتەدا ئیتحادیەکان خاوەن دەسەلأت بوون لەدەوڵەتی عوسمانی ، هەر ئەوان پشتگیریان لە حسێن کردووە بۆ دامەزراندنی لەسەرپۆستی شەرافەتی مەککە ([4]) .

ئیتحادیەکان لەسەرەتادا دروشمی بریقەداریان بەرزکردبۆوە سەبارەت بە ئازادی وسەربەخۆیی گەلانی ژیر دەسەلاتی دەولەتی عوسمانی بەلام هەرزوو ئەو سیاسەتەیان گۆرانکاری بەسەرداهات بەتایبەتی بەرامبەر بە میرنشینی حیجازلە ئەنجامی بەرهەلستی کردنی شەریف حسین بۆ جێبەجێکردنی پرۆژەی هێلی ئاسنینی حیجاز کە لە مەدینەوە بۆ مەککە دەچوو ، لەبەرئەوەی شەریف حسێن هەستی بە پیلانی ئیتحادیەکان کردبوو بە گەمارۆدانی دەسەلاتەکەی ، لەئەنجامدا پەیوەندی نێوان شەریف حسێن و ئیتحادیەکان بەرەو ئالۆزی چوو ،ئیتحادیەکان هەولیاندا لەرێگای سەپاندنی دەسلاتی مەرکەزی بەسەر حیجاز بە دەرکردنی یاسای ویلایەتەکان لەسالی ١٩١٣ز گورزێك بوەشێنن لە شەریف حسێن و لەدەسەلاتی دوور بخەنەوە[٥] .

لێرەدا شەریف حسین بیردەکاتەوە رووبکاتە حکومەتی بەریتانیا بۆ بەدەستهێنانی پشتگیری و پشتیوانی ئینگلیزەکان لە دژی حکومەتی ئیتحادیەکان ، بەلام لەو کات و ساتەدا بەریتانیەکان ئامادەنەبوون بچنە ناو کێشەیەکی لەم جۆرە لەگەلّ دەولەتی عوسمانی بەهۆی بوونی بەرژەوەندیەکی زۆریان لە ناوچەکە[٦] .

زیاتر لەمەش ئیتحادیەکان بەردەوام بوون لەسەر دروستکردنی فشار بە چەندان شێواز لەسەرشەریف حسێن،بەهۆی هەلویستە دژەکانی لەبەرامبەریاندا، بۆیە ئەمجارە هەستان بەناردنی والی وەهیب پاشا بۆ حیجاز وەك هەولێك بۆ سنووردانان بۆ دەسەلاتەکەی شەریف حسێن لە ناوچەکە، ئەم والیە ناسرابوو بە وابەستەیی و پابەندبوونی توندی بە بنەماکانی سیاسەتی ئیتحادیەکان، لەو کاتەی دەسەلاتەکانی جێبەجێکردن و کارگێری هەرێمەکەی لەدەست دابوو، جگە لەوە یەکەیەکی سەربازی لەگەلیدا رەوانەی ناوچەکە کرابوو بۆ هاوکاریکردنی

لەپێناو سەپاندنی سیاسەتی ئیتحادیەکان لە ناوچەکە .ئیتحادیەکان چەند ڕێنماییەکیان بە والی وەهیب پاشا دابوو بۆ لاوازکردنی دەسەلآتی شەریف حسێن و لەهەمان کاتیش ڕێگایان پێدابوو ئەگەر پێویستیشی کرد دەتوانێت دەستگیریشی بکات [٧].

هەڵوەشاندنەوەی دەستکەوتەکانی ناوخۆیی لە حیجاز، وەکارکردن بە یاسای ویلایەتی نوێ،دەستکردن بە جێبەجێکردنی پرۆژەی هێڵی ئاسنینی حیجاز، بێگومان ئەو سیاسەتە ڕەنگدانەوەی خراپی هەبوو،لەبەرئەوەی لەو کاتەدا حیجاز بەخشرابوو لە باج و خزمەتی سەربازی. دامەزراندنی والی نوێ گوزارشتی لە گۆڕینی سیاسەتی عوسمانیەکان دەکرد، هەربۆیە لەماوەیەکی کورتدا پەیوەندی نێوان شەریف حسێن و وەهیب پاشای والی تێکچوو بەتایبەتی دوای ئەوەی والی عوسمانی داوای سەد پارچە تفەنگی لە شەریف حێن کرد بۆ چەکدارکردنی پاسەوانەکانی ، لەبەرئەوەی شەریف حسێن ئەمەی بە سوکایەتی وەسف کرد بۆسەر خۆی،ئەمەش بووە هۆکاری ڕووبەڕووبوونەوەلە نێوان هەردوو بەرەدا [٨].

تورکەکان مەبەستیان بوو کەوا شەریف حسێن لە پۆستەکەیدا دوور بخەنەوە، بەلآم بەهۆی بوونی نارەزایی سەدری ئەعزەم (سەعید حەلیم*) و مەحمود پاشا شرکوسلی وەزیری جەنگ لە ئەستانە و پشتگیریان لە شەریف حسێن ئەم کارە ڕووی نەدا [٩].

کاتێك میر عەبدوللای* کوری شەریف حسێن چووە ئەستانەی پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی لەگەڵ سەدری ئەعزەم کۆبوە ، هەردوولا گفتوگۆیان کرد لەسەر چۆنیەتی سنووردانان بۆ ئەو بارودۆخە ئالۆزەی کەوا لە پەیوەندیەکانی نێوان ئیتحادیەکان و شەریف حسین دا دروست بووە، بۆیە کۆمەلێك پێشنیار

وەکو مەرج خرانە بەردەم میر عەبدوللا بۆ ئەوەی بە باوکی رابگەیەنێت بۆ ئاسایی بوونەوەی پەیوەندیەکانی نێوان هەردوولا، لەمانەش:

(أ) شەریف حسێن سێ یەکی داهاتی پرۆژەی هێلی ئاسنینی حیجاز دەبات ئەگەر رێگری نەکات لە جێبەجێکردنی پرۆژەکە ..

(ب) میرایەتی بۆ خۆی و منالّ و نەوەکانی دەبێت بەدرێژایی تەمەنی.

(ج) دانانی هێزیی پێویست لە ژێر دەسەلاّتی شەریف حسێن بۆ جێبەجێکردنی پرۆژەکە.

(د)دووسەدو پەنجا هەزار(٢٥٠٠٠٠)ملیۆن جونەیە دەخرێتە بەردەستی شەریف حسێن بۆ ئەوەی لە عەرەبەکانی کۆچەری سەرفیان بکات .

شەریف حسێن لەبەرئەوەی گومانی لە نیاز پاکی ئیتحادیەکان هەبوو ئەم داواکاری و پێشنیارانەی رەتکردەوە[١٠].

لەهەمان کاتدا دوای گەرانەوەی میر عەبدوللا بۆ حیجاز بنەماڵەی ئال عون کۆبوونەوەو میر عەبدوللا پێشنیاری راگەیاندنی سەربەخۆیی حیجازی کردلە ژێردەسەلاّتی عوسمانیەکان بەسوود وەرگرتن لە یەکێتی سوریاو عێراق و پشتیوانی دیبلۆماسی حکومەتی بەریتانیا،بەم جۆرەش هەولّی ئیتحادیەکان شکستی هێنا بۆ نەهێشتنی ئەو دەسەلاّتەنیمچە سەربەخۆییەی حیجاز،بەتایبەتی دوای نزیك بوونەوەی شەڕی جیهانی یەکەم،لەو نێوەندەشدا شەریف حسێن هەولّی دا سوود لەکات وەربگرێ بۆ خۆنزیکردنەوە لە حکومەتی بەریتانیا،هەربۆیەش شەریف حسێن لەسەرەتای هەلّگیرسانی جەنگ هەلّویستی کۆتایی خۆی سەبارەت بە شەڕکردن لەدژی تورکەکان ئاشکرا نەکرد و چاوەروانی بەرچاورروونی زیاترو ئەنجامی پەیوەندیەکانی لەگەلّ حکومەتی بەریتانیا دەکرد[١١].

## تەوەری دووەم :

## شەریف حسێن و پەیوەندیەکانی لەگەڵ حکومەتی بەریتانیا

پێشهاتە سیاسییەکانی جیهان بەگشتی و نیمچە دوورگەی عەرەبی بەتایبەتی پاڵنەرێك بوون بۆ عەرەبەکانی حیجاز خۆیان لە حکومەتی بەریتانیا نزیك بکەنەوە. سەرەتای ئەو نزیك بوونەوەیەش لەوکاتەدا دەستی پێکرد کاتێك میر عەبدوللای کوری شەریف حسێن کە لە ئەستانە ساڵی ١٩١٤ز چاوی کەوت بە لۆرد کتشنرمەندوبی سامی بەریتانی لە میسرومستر ئالان سیر رۆناڵد ستورز سکرتێری رۆژهەلات لە داری ئیعتمادی بەریتانی وگفتوگۆیان کرد سەبارەت بە هەڵویستی بەریتانیا لەمەڕ رەوشی نیمچە دورگەی عەرەبی و فشارەکانی دەوڵەتی عوسمانی بەمەبەستی سەپاندنی دەسەلاتی مەرکەزی بەسەر هەرێمەکەیاندا،لە کۆبونەوەکەدا عەبدوللا پەیوەندی خراپی نێوان شەریف حسێن و ئیتحادیەکانی بۆ باسکردن و پێ راگەیاندن کەوا ئیتحادیەکان هەوڵی لابردنی شەریف حسێن ئەدەن لە پۆستەکەی و ئاگاداری کردنەوە کە ئەگەر تورکەکان هەڵوێستێکی لەم جۆرە ئەنجام بدەن ئەوا دەبێت چاوەروانی شۆرشێك بکەن لە حیجاز،لێرەشدا عەبدوللای کوری شەریف حسێن مەبەستی بوو بەشێوەیەکی سیاسی لە هەڵوێستیحکومەتی بەریتانیا بگات ئەگەر هاتوو شۆرشێکیان لە پێناوی سەربەخۆیی لەدژی عوسمانیەکان راگەیاند،بەلأم کتشنر وەلامێکی نارەحەتی بە میر عەبدوللا گەیاندو روونی کردەوە کەوا حکومەتی بەریتانیا رێکەوتنی دوستانەی هەیە لەگەڵ عوسمانیەکان و خۆی ناخزێنێتە ناو هیچ کێشەیەکی نێوان عەرەب و تورك [١٢].

شیاوی باسە بەریتانیا هەر لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمەوە میرنشینە عەرەبیەکانی کەنداوی بەستبۆوە بە چەندین رێکەوتن و پەیماننامە

لــــەماوەی دەســــەلات رۆیــــشتوویدا بەســــەر ناوچــــەکە، لەســــاڵی ١٨٥٣ز رێکەوتنامەیەکی هەمیشەیی بەستبوو لە گەڵ میرنشینەکانی کەنداو،لەرێگەیـەوە هەوڵیان داوە سیاسەتی پەرتکەو زاڵ بـە لەسـەر ئـەو میرنشینانە پیـادە بکـەن بۆئەوەیلەیەکتریان جیا بکاتەوە بەمەبەستی لاوازکردنیان و دەسـت رۆیـشتوویی زیاتری خۆیان لە پێناو مسۆگەرکردنی بەرژەوەندی زیاتری سیاسی و ئابووری لە ناوچەکەدا [١٢].

بۆیە دەکرێ بلێن بەریتانیا بەگوێرەی بەرژەوەندیەکانی خۆی هەڵس و کەوتی لەناوچەکەدا دەکرد ، ئەو میرنشینانەی کەوا رێکەوتنی پێشووتری لەگەڵدا هەبوو بەشێوەیەکی راستەوخۆ پارێزگاری لێدەکردن ئـەمیش پارێگـاریکردن نـەبوو لـە عـەرەب بـەڵکو پاریزگـاری لـە بەرژەوەندیـەکانی خـۆی دەکـرد، ئەوانـەی تـریش بەگوێرەی پێویستی دۆخەکە سیاسەتی لەگەڵدا دەکـردن ، بـەجۆرێك هـەرکاتێك پێویـستی بکردبایـە خـۆی لێیـان نزیـك دەکـردەوە و پـشتگیری لێ دەکـردن ، هەرجارێکیش خۆنزیکردنەوەی لـەو هێزانـە لـەدژی بەرژەوەندیـەکانی بوایـە بـەو پەری ساردوسری هەڵس و کەوتی لەگەڵدا دەکردن.

هەرچەندە بەرپرسە بەریتانیەکانی لـە میـسر بـوون داواکاریـەکانی عـەرەبیان رەتکردەوە ،بەلآم بەشـێوەیەکی روکـەش هـەڵس و کـەوتیان لەگەڵـدا نـەکرد،میر عەبدوللا ئەمجارە هەوڵیدا کەوا رونالد ستورز رازی بکات بە مەترسی دۆخەکـە لـە حیجاز و ئاست و توانای باوکی بۆ هێرشکردنە سەر عوسمانیەکان،زۆری نـەخایاد دوای کۆبوونەوەکەی نێوان میر عەبدوللاو کتشنری مەندوبی سـامی بـەریتانی لـە ئەستانە،میر عەبدوللا سەردانی میسری کرد و ئەمجارەلەگـەڵ (مـستر سـتور)لـە کۆشـکی عابـدین کۆبونـەوە، بۆیـە هەولیـدا کـەوا حـەزێك بداتـە سـتورز بـە

پێشکەشکردنی دوو خاڵی گرنگ کە وەك بنەمایەك بێت بۆ هەماهەنگی کردنی یەکتری ([14]).

یەکەم: دڵنیایی دان بە بەرگریکردن لە هێزەکانی حکومەتی بەریتانیا لە کەنارەکانی حیجاز لە ئەگەری هەر هێرشێکی تورکەکان بۆ سەر ئەو ناوچەیە،لەگەڵ کردنەوەی ڕێگای بورسودان بەئامانجی دەستەبەرکردنی پەیوەندی و کارەکانی هەواڵگری.

دووەم: دانپێدانانی حیجاز بە بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا و ئاسانکاریکردن وپێدانی ئەولەویەت بە بازرگانی بەریتانیا لە ناوچەکە .

هەرچەندە بەریتانیەکان وەڵامی داواکاریەکانی حیجاز یان نەدایەوە بەڵام دڵخۆش بوون بەو هەڵویستە، هەوڵیاندا بەشێوەیەکی سیاسی، هێمنی و بێدەنگی بنوێنن و چاوەڕوانی بەرەو پێشچوونی دۆخەکەیان دەکرد ،ستور نامەیەکی دایە میر عەبدوللا بۆئەوەی بیگەیەنێتە دەستی باوکی و سوپاسگوزاری حکومەتی بەریتانیای پێ ڕابگەیەنێت سەبارەت بە کۆششەکانی بۆ پاراستنی شوێنە پیرۆزەکان و دابینکردنی سەلامەتی حاجیەکان، وە پێ ڕاگەیاند کە حکومەتی بەریتانیا لاری نیە لە گەڕاندنەوەی خەلافەتی ئیسلامی بۆ عەرەب،ئەگەر باوکی مەبەستی بێت ئەو پۆستە وەربگرێت [15].

کاتێك جەنگی یەکەمی جیهانی هەڵگیرسا لە ئابی ١٩١٤ز،کتشنر لە مۆڵەت و پشوو دابوولە ئینگلتەرا، بەخێرایی پشوەکەی خۆی پچراندو گەرایەوە میسر ،دوای ئەوەی کرایە وەزیری جەنگ، کتشنر مەترسی هەبوو لە نزیك بوونەوەی ئەلمانیا و تورکیا، هەرچەندە دەوڵەتی عوسمانی بەرووکەش خۆی وەکو بێلایەن لە شەڕەکە نیشاندا، بەلاَم بەریتانیا باوەری بەو هەڵوێستەی دەوڵەتی عوسمانی نەبوو[16].بۆیە بەریتانیەکان بە پێویستیان زانی سوود لەو بارەگرژەی

کـەوتبووە نێـوان دەوڵـەتی عوسمـانی و عەرەبـەکانی حیجـاز وەربگـرن لـە بەرژەوەندی خۆیان، هەربۆیە کتشنر داوای لە داری ئیعتمادی بەریتانی لە میسر کرد کـەوا هەوڵبـدات بـۆ تێگەیـشتن لـە هەڵوێستی شـەریف حـسێن لەبەرامبـەر شـەڕ،ئایا لـە ئەگـەری خزینـی دەوڵـەتی عوسمـانی بـۆ نـاو شـەڕەکە لایـەنگیری عوسمانیـەکان دەکـات ، یـاخود بـۆ بەدەسـتهێنانی سـەربەخۆی دەچـێتە پـاڵ بەریتانیا[17].

بەریتانیەکان بـاوەڕپێکراوێکی خۆیـان بـە نامەیەکـەوە بـە شـێوازێکی نهێنـی بەناوی (عەلی ئەفەندی ئەسغەر) لە ناوەراستی تشرینی یەکەمی ١٩١٤ز ڕەوانـەی لای عەبدوللای کوری شەریف حسێن کرد، لە نامەکەدا هاتبوو کە مستر ستورسی سکرتێری رۆژهەلاتی لە میسر نوسیبووی و دەلێت: فەرمانم پێکراوە لەلایەن لۆرد کتشنر وەزیری جەنگی بەریتانی ئەو نامەیە بۆ بەرێزتان بنوسم سەبارەت بەوەی ئایا ئێوەی بەرێز و باوکی بەرێزتان لەسەر هەمان هەڵوێستی یەکەم جارتان ماون سەبارەت بە بەرگریکردن لە مافەکانی عەرەب[18].

شیاوی باسە لە تشرینی دووەمی هەمان ساڵدا شەریفی مەککە دوونامەی تری بەدەست گەیشت ، یەکێکیان لە سـوڵتان مەحەمـەد رەشــاد وئـەوەی تریـان لـە حاکمی سوریا جـەمال پاشـا، کـە داوایـان کـرد شـەریفی مەککـە بەشـداری شـەڕ لەدژی بەریتانیەکان بکات، بـەو سـیفەتەی پـارێزەری شـوێنە پیرۆزەکـانی وەکـو مەککە و مەدینەیە، بەڵام شەریف حسێن بەو بیـانووەی کـەوا مەترسـی هەیـە لـە بوونی کەشتی گەلی جـەنگی بـەریتانی لـە ئاوەکـانی لـە کەنداوی عـەرەبی و لـە دەریـای سـوور گـووتی ترسـم هەیـە بەئاشـکرایی جیهـاد رابگەیـەنم لـە دژی بەریتانیەکان نەوەك بەریتانیەکان حیجاز بۆردومان بکەن[19].

ئەو پێشهاتانە شەریف حسێنی خستە دۆخێکی ئاڵۆزو تەنها دوورێگای لەبەردەمدا بوو،یان ئەوەتا لەشەڕەکەدا ببێتە لایەنگیری تورکەکان و بەو جۆرەش هەڵوێستێکی باشی لەسەرتۆماربکەن،یان ئەوەتا لەدژی تورکەکان رابوەستێت و لێیان هەڵبگەرێتەوە و بە شمشێر داوای سەربەخۆیی خۆیان بکەن، کورەکانی شەریف حسێن هاوڕا نەبوون لەسەر پرسکە ، فەیسەڵی کورە گەورەی پێوابوو کەوا فەرەنسا بەرژەوەندی هەیە لە شام و بەریتانیاش لە باشووری عێراق،بۆیە رێگا نادەن بە دەستەبەردارکردنی سەربەخۆیی بۆ عەرەب ،بۆیە پێی باشتر بوو کەوا بنەماڵەکەی خۆی بەدووربگرێت لە شۆرشکردن ،چونکە بە بیروای ئەو ئەگەرێکی زۆر هەیە لەسەرسەرنەکەوتنی شۆرشەکە، بەلام عەبدوللا لەبەرئەوەی ئەندام بوو لە رێکخراوێکی شۆرشگێری نهێنی، هەست و سۆزێکی شۆرشگێری زۆری تێدابوو،دوپاتی لەسەر پێویستی راپەرین دەکردەوە لە دژی عوسمانیەکان بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی. لە نێوان هەردوو بیروڕادا شەریف حسێن هەلوێستێکی مام ناوەندی وەرگرت و نامەیەکی بۆ ستورزری سکرتێری رۆژهەلاتی بەریتانی لە میسر رەوانەکرد و پێی راگەیاندن کەوا لاری نیە ئەگەر لەگەڵ بەریتانیەکان رێکەوتن بکات بەو مەرجەی داوای بەشداریکردنی شەڕی لێنەکەن ،لەبەرئەوەی بەهۆی پێگە ئاینیەکیەوە ناتوانێ لە دژی موسڵمانان رابوەستێ [٢٠]. بەلام لە ئەگەری دروست بوونی فشار لەلایەن عوسمانیەکانەوە رایگەیاند کەوا دەتوانێت سەرکردایەتی خەڵکە نزیکەکانی خۆی بکات و لەدژی عوسمانیەکان رابوەستێت بەو مەرجەی حکومەتی بەریتانیا پشتیوانی لێ بکات.

لە وەلامی نامەکەی شەریف حسێن،لە٣١ تشرینی یەکەمی ١٩١٤ز کتشنر بروسکەیەك دەکات بۆ داری ئیعتیمادی بەریتانی لە قاهیرە و لە دەستپێکدا رایدەگەیەنێت کە تورکیا چۆتە ناو شەڕ، بۆیە ئەگەر عەرەبەکانی حیجاز بریاری

ئەوە بەدەن کەوا بچنە پاڵ بەریتانیا لە شەڕەکەدا لەدژی دەوڵەتی عوسمانی ، ئەوا حکومەتی خاوەنشکۆی بەریتانیا بەڵێنی پشتگیری و پشتیوانی بە شەریف حسێن ئەدات بە جۆرێك پشتێوانی مانەوەی شەریف حسێن دەکات لە پۆستەکەی لە هەمان کاتیشداپارێزگاری لەهەموو دەسەلأت و مافەکانی دەکات وجگە لە پاراستن و پارێزگاریکردن لە هەر دەست درێژیەکی بیانی بۆسەر ناوچەکەی، لەکۆتایشدا کتشنر رایگەیاند کەوا بەریتانیا پشتگیری لە شەریف حسێن دەکات بۆ گواستنەوەی خەلافەت بۆ عەرەب ،ئەگەر شەریف حسێن خەلافەت رابگەیەنێت بەسەرِ عەرەب.بەلأم شەریف حسێن وا لەنامەکەی کتشنر گەیشت کەوا بەریتانیا هانی هەموو عەرەب ئەدات بۆ شۆرشکردن لە پێناو بەدەستهێنانی سەربەخۆیی هەموو گەلّ و خاکی عەرەبی، وەلەبەرئەوەی کتشنر خاوەن پێگەیەکی بەهێز بوو لە رۆژهەلأت بۆیە شەریف حسێن راستەوخۆ دەستی بە هەولّەکانی کرد بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجە،هەربۆیە عەبدالله بە رێنماییی باوکی وەلأمێکی رەوانەکرد بۆ قاهیرە و بریاری رێکەوتن و هاوپەیمانی دا بە نهێنی لەگەلّ بەریتانیا[٢١]. بەریتانیا هەموو هەولّەکانی لەگەلّ شەریف حسێن بریتی بوو لە کردنەوەی بەرەیەکی نوێی شەڕ لەدژی عوسمانیەکان ،لەرێگای هاندانی عەرەبەکانی حیجاز بۆشۆرشکردن[٢٢].

هاوپەیمانان بە گشتی و حکومەتی بەریتانیا بەتایبەتی لە جەنگی یەکەمی جیهانی ئامانجیان لە نزیك بوونەوە لە وولأتانی رۆژهەلأتی عەرەبی بریتی بوو لە رووبەرووبوونەوەی مەترسی عوسمانیەکان لەو بەرەیە بەتایبەتی دوای راگەیاندنی جیهاد لەدژی بەرەی هاوپەیمانان،بەهۆی ئەوەی بە ملیۆنەها موسڵمان لەژێر دەستی وولأتانی وەکو بەریتانیا و فەرەنسا و روسیا بوون، لەهەمان کاتدا بەریتانیا هەولّی داوە سوود لە عەرەبەکان وەربگرێ بەتایبەتی

عەرەبــەکانی رۆژهــەلآت لەبەرئــەوەی عەرەبــەکان نــارازیبوون لــە دەســەلآتی عوسمانی بەڕ لەشەڕەکە، بۆیە بـەریتانیا کـاریکرد بـۆ راپـەرانـدنی ئـەو عەرەبانـە لـەدژی دەولـەتی عوسمـانی بـۆ ئـەوەی بتوانێـت بـە ئاسـانی بەسـەر هێزەکـانی عوسمانیدا زالّ بێت ، وەکارکردن بۆ سـەرقالّکردنی عوسمانیـەکان بـە شۆرشـــی عەرەبی لە رۆژهەلآتی عەرەبی (٢٣).

لـە یۆنیـۆی ١٩١٥ز هنـری مـەکماهۆن مەنـدوبی سـامی بـەریتانی لـە میـسر گوتارێکی دا بەلێنی دا کە بەریتانیا لە ئەگەری ئیمزاکردنی هەر رێکەوتنامەیـەکی ئاشـتی دان دەنێـت بــە ســەربەخۆیی نیمــچە دوورگــەی عــەرەبی بــە هــەموو سەروەریەکانیەوە بەسەر شوێنە پیرۆزەکان،وە راگەیاندنی ئامادەیی وولآتەکـەی بۆ پێشوازیکردن لە راگەیاندنی خەلآفەتی عەرەبی (٢٤).

شیاوی باسکردنە کەوا سیاسەتی حکومەتی بەریتانیا لە بەرامبەر بـە کێشەی عەرەب سیاسەتێکی دووفاقی بووە ، تەنها مەبەستی ئـەوەبووە کـەوا سـوود لـە نارەزاییــەکانی عــەرەب وەربگرێــت لەبەرامبــەر دەولــەتی عوســـــمانی و وەك ئامرازێك بـەکاری بهێنێـت بـۆ سـەپاندنی دەسـەلآتی خـۆی لـە ناوچـەکە، لەگـەلّ دابەشکردنی مولّکەکانی دەولّەتی عوسمانی .

بەشی دووەمی گفتوگۆیەکان لە مـانگی تـەمووز لـە نێـوان شـەریف حـسێن و هنری مەکماهۆن دەست پێدەکاتەوە، دوای ئەوەی شەریف حسێن راوێـژ دەکـات لەگەلّ بەشێك لە سەرکردەکانی عەرەبی، نامەیەك دەنێرێ بۆ هنری مـەکماهۆن ، کە بەیەکەم نامە دادەنرێت لەو کۆمەلّە نامە دیبلۆماسیانەی کـەدواتر ناسـران بـە نامە گۆرینەوەکانی حسێن – مەکماهون (٢٥).

هەلّوێـستی عــەرەب لــەو کاتــەدا جێگــەی بایــەخ بــوو لــەلای هاوپەیمانـەکان بەگشتی و بەریتانیا بـە تایبـەتی، چـونکە سـەپاندنی دەسـەلآتی تـورکی بەسـەر

وولاتـــی شـــام و عێـــراق بـــووە هۆکـــاری دروســـتکردنی هەرەشـــە لەســـەر بەرژەوەندیـەکانی بـەریتانیا لـە دووخـاڵی گـرنگ و زینـدوو ئـەمانیش لـە کـەناڵی سوێس لە گەڵ دەروازەی کەنداوی عەرەبی کە کانـەکانی زەیتـی هـەبوو ئـەمیش نرخ و بەهایەکی زۆری لە بازارەکاندا هەبوو بە تایبەتی بۆ کۆمپانیای ئینگلیزی - ئێرانـی ، جگـە لـە چـەندان هەڕەشـەی تـر ، کـە کاریگـەری هـەبوو لەسـەر بارودۆخەکە(٢٦).

لەلایـەنی سیاسیـشەوە بانگـەوازی جیهـاد لـە لایـەن دەوڵـەتی عوسمـانی گەورەترین مەترسی بـوو بەسـەر بەریتانیـەکان ، ئـەوەی کـەوا ئـەو بانگـەوازەی لاوازکرد بەلای بەریتانیەکان ئەوەبوو کە عوسمانیەکان هاوپـەیمانی نەسـرانیەکان بـوون لەشـەڕەکەدا، نزیکـەی ٧٠٠٠٠٠٠٠ملیـۆن موسـڵمان لـە هنـد لەژێردەسـتی بەریتانیـەکان بـوون ، جگـە لـەوەی ١٦٠٠٠٠٠٠ملیـۆنی تـر لـە میـسرو سـودان ، هەروەها لە ئەفریقاش ٢٠٠٠٠٠٠٠ملیۆن موسڵمان لەژێر دەسـتی فەرەنـسا بـوون ، لە روسیاش بەهەمان شێوە، یەکێك لەو رێگایانەی کە وایکرد کەوا هاوپەیمانەکان لەو مەترسیانە رزگاریان بێت راکێشـــانی عـەرەب بـوو بـۆ بـەرەی خۆیـان، بـەو جۆرەش کێشەی عەرەبی کەوتە چوارچـێوەی سیاسـەتی ئـەورووپی دوای ئـەوەی تورکیا چووە ناو جەنگی یەکەمی جیهانیەوە(٢٧).

## تەوەری سێیەم :

## نامەگۆرینەوەکانی حسێن مەکماهۆن و کاریگەری لەسەر پەیوەندیەکانی عەرەب و ئینگلیز

گردبوونەوەی کۆمەڵە هۆکارێك بەسەر یەکتری پاڵنەربوو بۆ ئەوەی حکومەتی بـەریتانیا و شـەریف حـسین لـە یـەکتری نزیـك ببنەوە،لـە ئـەنجامی ئـەوەدا

ئەنجومەنی وەزیرانی بەریتانی رێگای دا بە سیر هنری مەکماهۆن مەندوبی سامی بەریتانی لە میسر دانوستاندن بکات لەگەڵ شەریف حسێن و دەرکردنی بەیاننامەیەك کە لەگەڵ داواکاریەکانی عەرەب بگونجێ[٢٨].

زۆر نوسراوە سەبارەت بە نامە گۆرینەوەکانی نێوان شەریف حسێن و هنری مەکماهۆن* کە لە ١٤ تەموزی ١٩١٥ز دەستیان پێکرد تاکو ١٠ ئاداری ١٩١٦ز،ئەوانەی کەوا لە ناوەرۆکی ئەو نامانەدا باسکراون بریتی بوو دیاریکردنی سنووری وولاتانی عەرەبی ، واتە ئەو سنوورەی مەبەست بوو سەربەخۆیی خۆی رابگەیەنێت کە هەموو وولاتانی رۆژهەلاتی عەرەبی دەگرتەوە جگە لە هەندێك حالەتی وەکو لبنان کە لەژێردەستی فەرەنسا بوو وە باشوری عێراق لەژێر دەستی بەریتانیا بوو ئەمانە لەدەرەوەی ئەو بازنەیەدا بوون[٢٩].

شیاوی باسە ئەو بەلێنانەی کەوا بەریتانیەکان بە حسین بن عەلی یان دابوو سەبارەت بە دامەزراندنی دەولەتێکی عەرەبی و سەربەخۆیی وولاتانی عەرەبی ژێر دەسەلاتی دەولەتی عوسمانی وایکرد عەرەبەکان بچنە پاڵ بەریتانیا و پشتگیری لە هاوپەیمانەکان بکەن لەشەڕی یەکەمی جیهانی دا ،بەلام ئەوەی راستی بێت بەلێنەکانی بەریتانیا تەنها فێلێکی سیاسی بوو بۆ راکێشانی عەرەبەکان بۆلای خۆیان بەهۆی پێویستی زۆریان بەهێزو توانای عەرەبەکان بۆ پرکردنەوەو داپۆشینی راگەیاندنی جیهادی ئاینی چاوەڕوانکراوی عەرەب لە حیجاز،لەهەمان کاتدا شەریف حسێن بۆ هەموو جیهانی ئیسلامی رایگەیاند کەوا شۆرشەکەی لەدژی دەسەلاتدارانی عوسمانی لە ئەنجامی خۆسەپاندنی کۆمەلەی یاخود گروپی ئیتحادو تەرەقی دێت بەسەر هەموو کەنالەکانی دەسەلات لە ئەستانە و پەلکێشکردنی دەولەت بۆ شەرێك کەهیچ سودێکی بۆ موسلمانان تێدا نیە[٣٠].

لەیەکەم ڕێکەوتنی شەریف حسێن لەگەڵ هنری مەکماهۆندا کە لە کانونی دووەمی ساڵی ١٩١٦ز بەسترا ، حکومەتی بەریتانیا چەند بەڵێنێکی دا لەمانە :

یەکەم :- بەریتانیا بەڵێنی دا بە دامەزراندنی حکومەتێکی عەرەبی سەربەخۆ بەهەموو ماناکانی سەربەخۆیی ناوخۆیی و دەرەکی سنوورەکەیەوە لەرۆژهەڵات کەنداوی فارس و لەرۆژئاوا دەریای قەزوین و سنووری میسرو دەریای ناوەراست، لە باکوریش سنووری ویلایەتی حەلەب و موسلی باکووری رووبای فورات لەو شوێنەی کە لەگەڵ رووباری دیجلە یەك دەگرێتەوە.

دووەم:- حکومەتی خاوەن شکۆی بەریتانیا بەلێن دەدات بە پاراستنی ئەو حکومەتە و لەهەردەست درێژیەك و دەستێوەردانێك بە هەموو جۆرێك لە ناوەخۆ و پاراستنی سنوورەکانی ووشکانی و دەریایی لە هەموو دوژمنکاریەك لەهەر شێوە شێوازێك بێت.

سێیەم : - ویلایەتی بەسرە لەژێر سەرپەرشتی بەریتانیا دەبێت تاوەکو ئەو حکومەتە تازەیە کاردەکات بۆ رێکخستنی ئابووری .

چوارەم:- حکومەتی بەریتانیا ئەرکی دابینکردنی هەموو پێویستەکانی سەربازی و دارایی ئەو حکومەتە عەرەبیە دەگرێتە ئەستۆ لە کاتی شەڕ.

لەدوای ئەم رێکەوتنە شەریف حسێن بریاری دا بەشێوەیەکی پراکتیکی بچێتە ناو شەڕ و کاربکات بۆ دەرکردنی تورکەکان لە بەشێك لە هەرێمە عەرەبیەکان ، هەربۆیە لە ٥ حوزەریانی ساڵی ١٩١٦ز شۆرشەکەی خۆی لەدژی تورکەکاندا راگەیاند[٣١].

بەریتانیا زۆر سوودی لە بانگهێشتنەکەی شەریف حسێن وەرگرت لە ئامادەکردنی عەرەب دژی سیاسەتی بەتورك کردن و سیستەمی مەرکەزی کە ئیتحادیەکان پەیرەویان دەکرد و توانیان هەستی نەتەوایەتی لەناو عەرەبەکاندا

بزوێنن بۆ بەدەستهێنانی متمانەی ئەفسەرە عەرەبەکانی کە لەریزی لەشکری عوسمانی خزمەتیان دەکرد دوای ئەوەی گوێ بیستی هەڵگیرسانی شۆرشی عەرەبی بوون لە حیجاز(٣٢).

لەئەنجامی هەڵگیرسانی شۆرش چەندان رووبەرووبوونەوەی سەربازی رویاندا لە نێوان هێزە عەرەبیەکان و سوپای عوسمانی لە مانگەکانی ئاب و ئەیلولی ١٩١٦ز لە دەوروبەری شاری مەدینە، لە تائیف بە هەمان شێوە هێزە عەرەبیەکان بە سەرکردایەتی میر عەبدوللا لە ئێوارەی رۆژی هەینی ٩ حوزەیرانی ١٩١٦زدەستی بە راپەرین کرد، بەلام هەموو ئەمانە راگەیاندنی فەرمی شۆرشی عەرەبی نەبوون تاوەکو شەریف حسێن لە ١٠ حوزەیرانی ١٩١٦ز یەکەم گوللەی شۆرشی لە مەککە تەقاند و شۆرشی عەرەبی بە فەرمی راگەیاند(٣٣).

شۆرشەکەی عەرەبی لە حیجاز پشتیوانی و پشتگیریەکی باشی لێکرا لە دورگەی عەرەبی ، بەجۆرێك عەبدولعەزیز ئال سعود میری نەجد و شێخ جابر موبارەك سەباح میری کویت و شێخ خەزعەل میری مەحەمەرە لە کویت کۆبوونەوە و جگە لە مانیش کۆبوونەوەکە سەد و پەنجا سەرۆك هۆزی تر تیایدا ئامادەبوون و میر عەبدولعەزیز لە کۆبوونەوەکەدا هانی عەرەبەکانی دا کەوا لەدژی ئیتحادیەکان رابوەستن(٣٤).

لە٣ تشرینی یەکەمی ١٩١٦ز شەریف حسێن حکومەتێکی بە سەرۆکایەتی خۆی و شێخ عەبدوللای بن سەراجی جێگری ئەندامیەتی عەبدوللای کوری حسێن وەك وەزیری دەرەوە و فەیسەڵی کوری حسێن وەکو وەزیری ناوەخۆ و عەبدولعەزیز بن عەلی سەرۆك ئەرکانی سوپا و شێخ عەلی مالکی وەزیری مەعاریف و شێخ یوسف بن سالم وەزیری ئەشغالی گشتی و شێخ مەحەمەدئەمین وەزیری ئەوقاف و شێخ ئەحمەد عەبدولرەحمان وەزیری دارایی پێکهێنا(٣٥).

دەکرێ بلێن حکومەتی شەریف حسێن بەسەرەتای سیستەمێکی نوێی کاریگێری دادەنرێت، بە بیروڕای بەشێك توێژەران بەیەکەم ئەزموون دادەنرێت بۆ دەوڵەتێکی عەرەبی تەواو سەربەخۆ کە لە سەدەی بیست دامەزراوە(٣٦).

لە تشرینی دووەمی ١٩١٦ز زانایانی ئاینی مەککە بەیعەتیان بە شەریف حسێن دا وەکو مەلیکی عەرەب لە مەراسیمێکی تایبەت، دواتریش بەشێوەیەکی گشتی لە حەرەمی مەککە بەیعەتیان پێدا(٣٧).

ماوەیەکی کوورت بەسەر شۆرش تێپەری نەکرد ،سوپای عەرەبی توانیان دەست بەسەر ناوچەیەکی بەرفراوان بگرن لە حیجاز و جەزیرە، بەجۆرێك دوای تەنها پانزدەمانگ لەدوای راگەیاندنی شۆرش هێزەکانی فەیسەڵی کوری حسێن دەستیان گرت بەسەر عەقەبە لە تەموزی ١٩١٧ز، دواتر دەنگوباسی کەوتنی مەعان و عەمان بلاوبۆوە لەگەڵ هەواڵی کەوتنی فەلەستین بەدەستی بەریتانیەکان بەهاوکاری هێزە عەرەبیەکان، لە ٣٠ ئەیلولی ١٩١٨ز دوا ئەفسەرو سەرکردەی عوسمانی کە جەمال پاشای بچووك بوو لە دیمەشق چووە دەرەوە(٣٨).

لەلای خۆیەوە حکومەتی بەریتانیا هەستا بە دامەزراندنی جەنەرال سیر (ونفایت)بۆ بەرێوەبردنی کاروباری جەنگی، لە ئەرك و بەرپرسیارەتی ونفایت بوو کەوا بەگوێرەی توانا هاوکاری و یارمەتی ئینگلیزی بۆ شەریف حسێن دەستەبەر بکات و لەگەڵ دابین کردنی راوێژکارێك بۆ کاروباری سەربازی. هەربۆیە سیر ونفایت هەستا بەناردنی کۆلۆنێل (ولسن) حاکمی پێشووی سودان بۆ جەدە تاوەکو ببێتە نوێنەری حکومەتی بەریتانیا لە جەدە، دواتر لە شۆرشەکەیدا شەریف حسێن زۆربەی کات راوێژی بە ولسن دەکرد لە بەرێوەبردنی ئاراستەکانی شۆرش(٣٩).

بەریتانیەکان بەگوێرەی ئەو ڕێکەوتنەی کەوا لەگەڵ شەریف حسێن یان کردبوو کەبریتی بو لە پێشکەشکردنی کۆمەکردنی دارایی و سەربازی ، لەماوەی نێوان ساڵەکانی ١٩١٦از تاکو ١٩٢٠زکۆی گشتی ئەو کۆمەکیانەی گەیشتە بڕی ١١,٠٠٠,٠٠٠ملیۆن جونەیهی ئیستەرلینی، بەڵام بە شێوەی مانگانە دەیانبەخشی ، واتە لەهەر مانگێك برێکی دیاری کراوی پارەیان دەنارد بۆ حیجاز، بەڵام ئەو بڕە پارەی کەوا مانگانە ڕەوانەیان دەکرد قۆناغ بە قۆناغ گۆرانکاری بەسەرداهات بە کاریگەری گۆرانکاری سیاسەتی گشتی بەریتانیەکان بەرامبەر بەعەرەب بەگشتی و شەریف حسێن بەتایبەتی ، بە جۆرێك لە سەرتادا کە پرۆسەکە لە ئابی ١٩١٦از دەستی پێکرد بەریتانیەکان بڕی ١٢٥,٠٠٠هەزار جونەیهیان وەکو کۆمەکی دارایی بەخشی بە حیجاز ، دواتر ئەو ڕێژەیە بەرزبۆوە لە ئاداری ١٩١٧از بۆ ١٤٥,٠٠٠هەزار جونەیە ، ئنجا لە نیسانی ١٩١٧زگەیشتە ٢٠٠,٠٠٠هەزار جونەیە، دواتر بەهۆی داخوازی شەریف حسێن بۆ پێویستی زیاتری بە هاوکاریەکان ڕێژەکە گەیشتە ٢٢٥,٠٠٠هەزار جونەیە[٤٠].

شیاوی باسە لەماوەی بەرێوەچوونی جەنگی یەکەمی جیهانی دا حکومەتی بەریتانیا بەردەوام بوو لەبەخشینی کۆمەکییە داراییەکانی بە شەریف حسێن ، بەڵام دواتر بەهۆی نزیك بوونەوەی کۆتایی شەڕەکە ، دەستیان کرد بە چاوخشاندنەوە بەسیاسەتی داراییان بەرامبەر بە حسێن ، هەربۆیە لە ٢٤ تشرینی دووەمی ١٩١٨از وڵسن لەگەڵ شەریف حسێن کۆبۆوە بە مەبەستی راگۆرینەوە لەسەر پرسی کۆمەکیە دارییەکانی حکومەتی بەریتانیا بۆ حیجاز. ئەوەبوو وڵسن بریاری دا کەوا مانگانە تەنها بڕی ١٣٠,٠٠٠هەزار جونەیە ببەخشێ بە شەریف حسێن، ئەمەش ئەو بڕە پارەیە بوو کەوا هنری مەکماهۆن دیاری کردبوو بۆ شەریف حسێن بەر لە دەستپێکردنی شەڕ، دواتر بەریتانیا بەردەوام

بوو لە کەمکردنەوەی کۆمەکیە دارایەکانی بە شێوەیەك لە نیسانی ۱۹۱۹ز بڕی کۆمەکیەکانی حکومەتی بەریتانیا بۆ حیجاز بوونە ۱۲۰,۰۰۰ جونەیە لە هەر مانگێکدا، هەرچەندە شەریف حسێن هەوڵی دا کەوا ئەو بڕە پارەیە جێگیر بکات بە مەبەستی ئەنجامدانی هەندێك چاکسازی ناوەخۆیی بەڵام هەوڵەکانی بێ سوود بوون ،بەڵکو ئەمجارەش ئاستی کۆمەکیەکان دابەزی بۆ تەنها ۱۰۰,۰۰۰ هەزار جونەهی مانگانە[٤١].

دەکرێ بڵێین ئەمە بەسەرەتای گۆرینی سیاسەتی بەریتانیا دادەنرێت بەرامبەر بە شەریف حسێن ، دوای ئەوەی بەریتانیا لە قۆناغەکانی کۆتایی شەڕ نزیك بۆوە و تاکو ئاستێکی زۆریش سەرکەوتنی لەشەڕ مسۆگەرکردبوو ، ئیترئەوەندەی لەلایەنی سیاسی بۆ قۆناغەکانی دوای شەڕ پێویستی بە لایەنگیری شەریف حسێن هەبوو ، ئەوەندە لەبواری سەربازی پێویستی بەو هێزە عەرەبیە نەما بوو لە نیمچە دوورگەی عەرەبی، بەتایبەتی لەبەرئەوەی شەریف حسێن تەنها نوێنەرایەتی حیجازی دەکرد نەك هەموو وولآتانی عەرەبی، لەبەرئەوەی لە هەرێمەکانی تری وەکو نەجد و یەمەن و کوێت و بەسرە فەرمانرەوای تری عەرەبی هەبوون کە لەپێشتر حکومەتی بەریتانیا رێکەوتنی لەگەڵدا هەبوون ، حکومەتی بەریتانیا بەلێنی پاراستنی دەسەلآتیانی پێان دا بوو ، زیاتر هاریکاریکردنی شەریف حسێن جگە لەوەی مەترسی داهاتووی هەبوو لەسەرهەژمونی بەریتانیا ، مەترسی دروست دەکرد لەسەر دەسەلآتی لایەنگرەکانیشی لە نیمچە دوورگەی عەرەبیدا ، هەربۆیە سەریردەکەین لە قۆناغەکانی دواتر پەیوەندیەکانی نێوان شەریف حسێن لەگەڵ بەریتانیا لەسەر ئەم بابەتە و چەند بابەتێکی تر زیاتر بەرەو لاوازی و لێکترازان دەچێت.

شیاوی باسە پێگەی بەهێزی سیاسی و سەربازی میر عەبدولعەزیز ئال سعود لە نەجد و پشتگیری بەردەوامی لەلایەن فەرمانڕەوایانی بەریتانی لە هند ئەمیش کاریگەری خۆی هەبوو لەسەر گۆڕانی هەڵوێستی بەریتانیا لە بەرامبەر بە شەریف حسێن ،بەتایبەتی دوای ئەو سەرکەوتنی عەسکەرییەی کەوا میر عەبدولعەزیز ئال سعود لەبەرامبەر شەریف حسێن بەدەستی هێنا لە شەڕی (تربە) ساڵی ١٩١٩ز کە بووە هۆی سەرکەوتنی قوتابخانەی هند بەسەر قوتابخانەی قاهیرە کە پشتگیریان لە شەریف حسێن دەکرد[٤٢].هەربۆیە لە کۆنگرەی قاهیرە کە بەسەرۆکایەتی ونستۆن چەرچلی وەزیری داگیرگەکانی بەریتانی لە ئاداری ١٩٢١ز بەڕێوەچوو ، بە هاوسەنگی بڕی ١٠٠,٠٠٠ هەزار جونەیە بۆ شەریف حسێن و ١٠٠,٠٠٠ هەزار جونەیە بۆ میر عەبدولعەزیز ئال سعود تەرخانکرا ، بەوشێوەیەش حکومەتی بەریتانیا گورزێکی گەورەی وەشاند لە پێگە و مەقامی شەریف حسێن و لە بەها و نرخی ئەو هاوپەیمانەتیەی کەمکردەوە[٤٣]. لە هەمان کاتدا حکومەتی بەریتانیا بەخشینی ئەو کۆمەکیانەی مەرج دار کرد بەرازیبوونی شەریف حسێن لەسەر ئەو سیاسەتەی کە هاوپەیمانان رێکەوتنیان لەسەر کردووە لە کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس کە لە ساڵی ١٩١٩ز بەسترابوو.وە ئەگەر بێتوو شەریف حسێن دژایەتی ئەو سیاسەتە بکات ئەوا هەموو کۆمەکی و یارمەتیەکی دارایی لێ دەبردرێت و بەو جۆرەش بەرەو ئیفلاس بوون دەچێت، ئەمەش کاریگەری خراپی بەسەر بارودۆخی ئابووری لە مەملەکەتی حیجاز هەبوو، بۆیە وردە وردە دام و دەزگاکانی یەك لەدوای یەك بەرەو رووخان چوولەماوەی ئەو چوارساڵەی تەمەنی کەمابوونەوە[٤٤].

## تەوەری چوارەم :

## هەلوێستی بەریتانیا لەمەڕ پادشایەتی حسێن لەسەڕ عەرەب

لە دوای ئەوەی شەریف حسێن بەیعەتی پێدرا لەلایەن عەرەبی جەزیرە وە ،میر عەبدوللا بروسکەیەکی بۆقاهیرە کرد و فەرمانرەوایی باوکی بەسەڕ عەرەب پێ ڕاگەیاندن پاش جیابوونەوە لە دەوڵەتی عوسمانی، بە پێویستیشی زانی کەوا حیجاز هەژماربکرێت وەکو ئەندامێکی کارا لە نێوەندە نێودەوڵەتیەکان، لە بروسکەکەیدا میر عەبدوللا دەلێت بەپەری خۆشحالیەوە بە بەرێزانتان رادەگەیەنم کە پیاو ماقولانی وولات و ریش سپی و زانایانی ئاینی بەگشتی بە هەموو چین و توێژەکانیشەوە کۆبوونەوە لە بەرەبەیانی ٧ تشرینی یەکەمی ١٩١٦ز بەرێکەوتن لەگەڵ یەکتری و بەکۆی دەنگ بریاریاندا لەسەر هەڵبژاردنی خاوەن شکۆ شەریف حسێن بن عەلی وەکو پادشای نەتەوەی عەرەب[٤٥].

کاتێك بروسکەکە گەیشتە میسر خامەی نهێنی ئینگلیزی ماوەی پێنج رۆژ بروسکەکەی لە مەندوبی سامی بەریتانی شاردەوە، حکومەتی بەریتانی بە هەموو جۆرێك هەولی شاردنەوەی ئەم بروسکەیەی ئەدا، هەربۆیە داواشیان لە فاروقی نوێنەری حکومەتی حیجاز کرد لە قاهیرە کەوا بێدەنگ بێت و هەواڵەکە بلاو نەکاتەوە، دواتر حکومەتی بەریتانیا لە ١٠ کانوونی یەکەمی ١٩١٦ز هەلوێستی خۆی سەبارە بە پادشایەتی شەریف حسێن بەسەر هەموو نەتەوەی عەرەب بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا دەربڕی و رایگەیاند کە هەرچەندە ئەوان دان بەوە دەنێن کە شەریف حسێن سەرکردەی عەرەبە لە شۆرشەکەیدا لەدژی عوسمانیەکان، وە بەخۆشحالیەوە دان دەنێن بەوەی کەوا شەریف حسێن فەرمانرەوای داهاتووی حیجازە، بەلام ناتوانن دانبنێن بەو نازناوەی کەوا ئێوە خۆتان لەسەری رێکەوتوون کەوك پادشای عەرەب مامەڵەی لەگەڵدا بکەین ،

چونکە ئەو نازناوە ئەگەر لەو کاتەی ئێستادا بدرێت بە شەریف حسێن رەنگە لێکترازان لە نێوان عەرەب دروست بکات ، بەوجۆرەش ناتوانین کێشەکانی نیمچە دورگەی عەرەبی چارەسەر بکەین، لەبەرئەوەی ئەو کێشانە پێویستیان بە یەك دەنگی هەیە لە نێوان هەموو لایەنەکانەوە(٤٦). لە هەمان کاتدا حکومەتی بەریتانیا پێیان رادەگەیەنێت کە ئەو نازناوەی کەوا ئێوە هەڵتان گرتوە نازناوێکی نەتەوییە نەك نیشتمانی، بۆیە ئێوە دەبێت بزانن کەوا عەبدولعەزیز ئال سعود لە نەجد و محمد بن علی الادریسی* لە عەسیر رێگانادەن ئێوە دەست بخەنە ناو کاروباری ناوخۆیی ئەوانەوە لەو کاتەیدا کەوا ئەوان خاوەنی سیستەمێکی نیمچە سەربەخۆن و لەلایەن ئێمەوە بەرێکەوتنێکی پێش وەختەدا پارێزگارییان لێ دەکرێت، ئەم هەڵوێستەی بەریتانیا بووە هۆی دروست بوونی ناکۆکی لە نێوان هەردوولایەن ، هەرچەندە شەریف حسێن لەدوای گەیشتنی بروسکەی بەریتانیا پێداگری نەکرد لەسەر مافی پادشایەتی خۆی(٤٧).

لە ٣ کانوونی دووەمی ١٩١٧ز بورسکەیەکی تر لەلایەن هەردوو حکومەتی بەریتانیا و فەرەنسا گەیشت حیجازو رایانگەیاند کەوا هەردوو دەوڵەت دان دەنێن بە پادشایەتی شەریف حسێن لە سەر هەرێمی حیجاز بەتەنها، وەنازناوەکەی بریتی دەبێت لە (پادشای خاوەنشکۆی حیجان)، لەوەلآمدا شەریف حسێن هیچی بۆ نەمایەوەو لەتوانای دا نەبوو بەرهەڵستی هاوپەیمانان بکات بۆیە بەناچاری نازناوەکەی قبوڵکرد(٤٨).

دەکرێ بلێن هۆکاری دەربرینی ئەو هەڵوێستە خراپەی بەریتانیا دەگەرێتەوە بۆ ئامانج و مەبەستی کۆنالیزمی ئەو وولاتە ، چونکە تەنها چەند مانگێك تێنەپەری بوو لەسەر رێکەوتنامەی سایکس بیکۆ*ی نهێنی نێوان هەردوو حکومەتی بەریتانیا و فەرەنسا کە لە ٢ مایسی ١٩١٦ز بەسترابوو سەبارەت

بەدابەشکردنی ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی عەرەبی، فەرەنسا دەیزانی کەوا ئەم هەنگاوەی شەریف حسێن لەداهاتوو دەبێتە بەربەست لەبەردەم ئامانج و بەرژەوەندیەکانی لە شام ، بەریتانیاش ئاسایی بوو کەوا مەسەلەیەکی وەکو دیاریکردنی سنووری هەرێمی عەرەبی فەرامۆش بکات چونکە هەر لەسەرتای گفتوگۆکانی حسێن – مەکماهۆندا ئەو بابەتەی فەرامۆشکرد[٤٩].

لەنێو ئەو بارودۆخە ئالۆزەی رووی لە پەیوەندیەکانی نێوان بەریتانیا و حیجاز کردبوو ،لە هەمان کاتدا وەهابیەکان لە نەجد بەهۆی ئەوەی هەر لە کۆتایی سەدەی هەژدەمەوە پەیوەندیەکانیان بە توندی سەری هەڵدا بوولە گەڵ حیجاز، لە ئەنجامی رووبەڕووبوونەوەی هاشمیەکان بۆ بزوتنەوەی وەهابی ، لەو کاتەدا هەر لەسەر مەسەلەی ململانێ لەسەر دەسەلات و کێشەکانی سنووری هاوبەشی نێوانیان جارێکی تر پەیوەندیەکانی حیجازو نەجد بەرو ئالۆزی دەچێت، بۆیە عەبدولعەزیز ئال سعود هێرشدەکاتە سەرمیر عەبدوللای کوری حسێن و هەروەك لە پێشتریش ئامادەمان پێکردووە لەشەری تربە لە نزیك تائیف١٩ مایولەساڵی ١٩١٩ز سەردەکەوێت و گورزێکی گەورەی سەربازی لە شەریف حسێن دەوەشێنێت[٥٠].بەلام شەریف حسێن گرنگی بەو کێشە سەربازیانە نادات لەو کات و ساتەدا کە هاوپەیمانان لە پاریس خەریکی بەستنی کۆنگرەی ئاشتی بوون، هەر بەو ئومێدەوە بوو کۆنگرە داخوازیەکانی جێبەجێ بکات، بەلام شەریف حسێن لە پاریس نائومێد بوو ، ئەمجارە ئومێدەکانی خۆی بە رێکەوتنامەکانی ڤێرسای و سیڤر بەستەوە ، بەلام رەتکردنەوەی سیستەمی رژێمی ئینتداب لەلایەن شەریف حسێن هیچی بۆ دەستەبەرنەکرد تەنها ئەوەندە نەبێت کە بریاربدات بەشداری کۆنگرەی لۆزان نەکات[٥١].

دواتـر لـە ئـاداری ١٩٢١ کـۆنگرەی قـاهیرە بەسـترا بـۆ یـەکلایی کردنـەوەی مەسەڵەی عەرەبی،حکومـەتی بـەریتانیا هەسـتا بـە نـاردنی لـۆرنس بـۆ جـدە لـە کۆتایی مانگی ئابی ١٩٢١زبۆ بەستنی رێکەوتنێك لە گـەڵ حـسێن ، لـە راسـتیدا بەریتانیا ئامانجی بـوو کـەوا لـەو کاتـەدا وا لـە حـسێن بکـات کـە دان بنێـت بـەو ئینتدابـەی بەسـەر هەریـەك لـە سـوریاوعێراق سـەپاندبووی لـە کـۆنگرەی سـان ریمۆ[٥٢]. لەبەرمبەر هـەموو ئـەو کۆمەکیـە داراییانـەی کـەوا لەپێـشتر ئاماژەمـان پێکردبوو بە شەریف حسێنی دەبەخشی، لە هەمان کات لەبەرامبەر ئەو بەڵێنـەی کەپێدرابوو سەبارەت بە پاراستنی لە هەر هێرشێکی چاوەروانکراو،حسین نیـازی نەبوو بەو پێشنیارە رازی بێت، بۆیە گفتوگۆیەکان درێژەیان کێشا تاکوو هـاوینی ١٩٢٤ز، تـاکوو لـەدواکات دانوسـتانەکان شکـستیان هێنـا بـەهۆی رەتکردنـەوەی بابەتی ئینتداب لەسـەر فەلەستین، هەرچـەندە لاری نـەبوو لەسـەر پیـادەکردنی سیستەمی ئینتداب لەسەر عێراق و سوریا[٥٣].

لەو کاتەی کە تورکەکان توانیان سەربکەون بەسەر یۆنانیـەکان لـە ئـەنادۆل ، بریـاردرا لەسـەر بەسـتنی کۆنگرەیـەکی نێودەوڵـەتی لـە لـۆزان سـاڵی ١٩٢٢زبـۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی رۆژهـەلات، شـەریف حـسێن هەسـتا بـەناردنی نـاجی ئەسیل* کە نوێنەری بوو لە لەندن بۆ کۆنگرەکە بە نوێنەرایەتی خۆی بـۆ ئـەوەی نیازپاکی لە هاوپـەیمانانبخوازێت بەرامبـەر بـە مەسـەڵەی عـەرەبی،ناجی ئەسـیل لەگەڵ لۆرد کیرزنـی وەزیـری دەرەوەی بـەریتانیا کۆبوونـەوە و رێکـەوتن لەسـەر ئامـادەکردنی پرۆژەیـەکی رێکـەوتن کـەوا لـەنێوان شـەریف حـسێن و بـەریتانیا ببەسـترێت بـۆ سـاغکردنەوەی ئـەو بەڵێنانـەی لـە پێـشتر بـە حـسێن درابـوو وە رێکخستنی پەیوەندیـەکانی سیاسـی لـە نێـوان هـەردوولا لـە داهاتوو،لـە ١٩٢٣ ئەسیل گەرایەوە مەککە و پرۆژەکەی خستە بەردەم حسێن، هەردوولایەن لەسەر

ناوەرۆکی ڕێکەوتنەکە رازی بوون ، تەنها ئەوەندە نەبێت کەوا حسێن پێشنیاری هەندێك گۆرانکاری هەبوو لەسەر رێکەوتنەکە*،بەلام لە ١٦ یۆنیۆی ١٩٢٣ فەلەستینیەکان کۆنگرەی شەشەمی خۆیان بەست و رێکەوتنەکەیان رەتکردەوە، لەبەرئەوەی دژی ئامانجەکانی عەرەب و پێچەوانەی بەلێنەکانی بەریتانیا بوو بۆ عەرەب، بۆیە بریاریاندا کەوا لە ٢٥ یۆلیۆی ١٩٢٣ز شاندێك رەوانە بکەن بۆ لەندەن بۆ ئەوەی بەشداری کۆبوونەوەکانی هەردولا بکەن بە ناوی فەلەستین، بەو شێوەیەش فەلەستینەیەکان دەتوانن کاریگەری دروست بکەن لەسەر دوا بریاری حسێن بە جۆرێك ئەمجارە داوای سەربەخۆیی تەواوی بۆ فەلەستین کرد،هەربۆیە حسێن لە گوتارێکی دا لە وەرزی حەجی هەمان ساڵدا بۆ حاجیانی ماڵی خوا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە پێویستە فەلستین بەشداربێت لەو یەکێتیە عەرەبیەی کەوا بەریتانیا لە رابردوو بەلێنی بە عەرەب دابوو، وە ئەگەر حکومەتی بەریتانیا لە سەر پێشنیارەکەم رازی نەبێت ئەوا منیش ئەو رێکەوتنە رەتدەکەمەوە(٥٤).

دانوستانەکانی نێوان شەریف حسێن و حکومەتی بەریتانیا بەردەوام بوو تاکوو هاوینی ١٩٢٤ز ن بەلام لە کۆتاییدا کۆششەکانی هەردوولا هیچ ئەنجامێکیان نەبوو وە دانوستانەکانیش شکستیان هێنا بەهۆی رەتکردنەوەی شەریف حسێن بە دانپێدانان بە ئینتداب بەسەر فەلەستین .

دواتر شەریف حسێن خۆی وەکو خەلیفەی موسلمانان رادەگەیەنێت دوای نەمانی پۆستی خەلافەت لە دەولەتی عوسمانی لە پاش دوورکردنەوەی خەلیفەی عوسمانی عەبدولمەجیدی دووەم و هەلوەشاندنەوەی پۆستی خەلافەت لەسەر دەستی کەمالیەکان، بەلام سەرکەتوو نەبوو لە رازی کردنی سوریەکان بۆ ئەوەی دانبنێن بە پۆستە نوێیەکەی کە پۆستی خەلافەت بوو، شایانی باسە بنگهێشتنی

خەلافەت لـە لایـەن شـەریف حـسێنەوە بیـانووی دایـە دەسـت عەبدولعـەزیز ئـیبن سـعود بـۆ شـەرکردن لەگەلیـدا، بـەجۆرێك حـسێن پـەنای بـرد بـۆ بەریتانیـەکان بۆئـەوەی لەشـەرەکەیدا لـە بەرامبـەر عەبدولعـەزیز هاوکـاری بکـەن، بـەلام بەریتانیەکان ئامادەنەبوون هیچ هاوکاریەکی حسێن بکـەن، ئـەوەبوو وەهابیـەکان لە هەفتەی کۆتایی مانگی ئابی ١٩٢٤ز خزینە ناو تائیف و شمشێریان خستە سـەر ملی دانیشتوانەکانی، بۆیە لەو کاتـەدا خـەڵکی مەککە داوایـان لـە حـسـێن کـرد دەست لە دەسەلات هەڵبگرێت، دەسەلاتی گواستەوە بۆ عەلی کرە گەورەکەی، بـۆ خۆشی رایکردە عەقەبە، لە ٨ کانوونی دووەمی ١٩٢٦ز خۆی وەك پادشای حیجاز راگەیاند،کۆتایی بە دەسەلاتی ئەشرافەکان هێنـا لەسـەر[٥٥] دواتـر لـە حـوزەیرانی ساڵی ١٩٣١ز شەریف حسێن دەمرێت و لە بەیت مەقدس دەنێژرێت[٥٦].

شیاوی باسە عەبدولعـەزیزبن عەبـدولرەحمان ئـیبن سـعود هـەر لـە ١٥ مـایۆ ١٩١٤ز وە دانـی نـابوو بەدەسـەلاتی عوسمانیـەکان بەسـەر نەجـد و ئەحـساء، لەبەرامبـەردا عوسمانیـەکان عەبدولعـەزیز ئـیبن سـعودیان دامەزرانـد بـە والی و فـەرمانرەوای ناوچـەکە بـەجۆرێك بەدرێـژایی تەمـەنی حـوکمی ناوچـەکە بکـات بەشێوەیەکی پشتاوپشتی دەسـەلات بـۆ کورەکـانی و نـەوەکانی دەمێنێتـەوە، لەبـەرواری ٩-تـەمووزی-١٩١٤ز بەیاداشـتێك بـالیۆزی دەوڵـەتی عوسمـانی لـە لەنـدەن وەزارەتـی دەرەوەی بـەریتانیای لـە دامەزرانـدنی عەبدولعـەزیز ئـیبن سعود وەکو والی لەنجد ئاگادارکردەوە[٥٧].عەبدولعـەزیز ئـیبن سـعود لـە لایـەن بەپرسـانی بـەریتانی لـە هنـد پـشتگیری زۆری لێـدەکرا ، هـەر ئەمـەش بـووە هۆکاری ئەوەی حکومەتی بەریتانیا لە ئاستی کۆمـەکی و هاوکاریـەکانی دارایـی و سەربازی بۆ نەجد بەرزکردەو تـاوەکو مەسـەلە و کێـشەکانی نێـوان حیجـاز و نەجد کۆتایی پێبهێنێت.

## دەرەنجام

١- پەیوەندیەکانی شەریف حسێن و حکومەتی بەریتانیا هەرچەندە لەسەر بنەمای بەرژەوەندی هاوبەش بونیاد نرابوو، بەلام بەردەوام هەلکشان و داکشانی تێدابووە، بەتایبەتی لە ماوەی دوای کۆتایی شەڕی جیهانی یەکەم زۆر بەروونی هەست بە گۆرانی هەلوێستی حکومەتی بەریتانیا دەکرێت لە بەرامبەر شەریف حسێن .

٢- بوونی چەند هێزێکی هاوسەنگ لەتوانا و ئاستی سەربازی و ئابووری لەهەرێمی نیمچە دوورگەی عەرەبی رێگر بوو لەبەردەم حکومەتی بەریتانیا کەوا پەیوەندیەکانی تەنها لەگەڵ لایەنێك هەبێت و هێزەکانی تریش فەرامۆش بکات، لەبەرئەوەی حکومەتی بەریتانیا بەرژەوەندی ئابووری و سیاسی لە ناوچەکەدا هەبوو بۆیە پیویستی بە دۆستایەتی هەموو ئەو هێزانە هەبوو ، ئەم پانتاییە بەرفراوانە لە پەیوەندیە دیبلۆماسی و سیاسی و ئابوریەکانی بەریتانیا رەنگدانەوەی نێگەتیڤی هەبوو لەسەر پەیوەندیەکانی حیجاز و بەریتانیا، بەجۆرێك لە بایەخی ئەو پەیوەندیانەی لەگەڵ شەریف حسێن هەبوون کەمکردەوە.

٣- بەرهەڵستی کردنی بزوتنەوەی وەهابی لەلایەن هاشمیەکان و دواتر راگەیاندنی خەلافەت لەلایەن شەریف حسێن و کێشەکانی سنووری هاوبەشی نێوان حیجازو نەجد بوونە هۆکاری قین لە دڵ هەلگرتنی عەبدوالعەزیز ئیبن سعود لەشەریف حسێن ،هربۆیە شەڕی لەدژیدا رادەگەیەنێت و دواتریش کۆتایی بەدەسەلاتی دەهێنی.

٤- حکومەتی بەریتانیا لە پشتگیری کردنی کێشەی عەرەبی سیاسەتێکی دوو روویی هەبووە ، لەکاتێکدا پشتگیری لە مافی سەربەخۆیی عەرەب دەکرد لە ژێر

دەسەلاَتی عوسمانی، بەلاَم لە هەمان کاتدا چەندان ڕێکەوتنامەی وەکو سایکس بیکۆ لە ١٩١٦ز و پەیماننامەی بەلفۆر لە ١٩١٧ز تەنها ئامانجیان یەك نەگرتنی عەرەب و دانەمەزراندنی قەوارەیەکی عەرەبی یەککگرتوو بووە.

٥- هاوکاریکردن و کۆمەکردنی عەرەب لە پێناو لاوازکردنی دەوڵەتی عوسمانی و دەستگرتن بەسەر سەروەت و سامانی سروشتی و کانزاییەکانی ڕۆژهەلاَتی عەرەبی بووە.

٦- ڕاگەیاندنی پادشایەتی شەریف حسێن بەسەر هەموو نەتەوەی عەرەبی بە سەرەتای کۆتایی دەسەلاَتی شەریف حسێن دادەنرێت ، لەهەمان کاتدا بانگەشەکردنی شەریف حسێن وەکو خەلیفەی موسلمانان ئەمیش نارەزاییەکی توندی لێکەوتەوە لەلایەن بەشێك لە موسلمانەکان لەوانەش موسڵمانەکانی میسر و هند بەهۆی هەڵگەڕانەوەی شەریف حسێن لە دەوڵەتی عوسمانی و چوونە پاڵ هاوپەیمانان لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا.

## لیستی سەرچاوەکان

١) جورج انطونيوس،يقظة العرب. ترجمة الدكتور ناصر الدين الاسد، والدكتور احسان عباس، دار العلم للملايين. بيروت. الطبعة الثانية، ١٩٦٦.

٢) شهاب أحمد رحمن ، الشريف حسين بن علي و الثورة العربية الكبرى ١٩١٦-١٩١٨ز، گۆڤاری مێژوو، ژ٢٠،چ رۆژهەلآت، هەولێر،٢٠١١.

٣) محمود شاكر ، موسوعة تاريخ الخليج العربي، ج٢، دار أسامة للنشر والتوزيع ، عمان،الاردن،٢٠٠٣.

٤) سليمان موسى ، الحسين بن علي و الثورة العربية الكبرى، دار النشر و التوزيع، عمان ، ١٩٥٧.

٥) حسين خلف الشيخ خزعل، تأريخ الكويت السياسي، ج٣،دارو مكتبة الهلال،بيروت ، ١٩٦٢.

٦) يونان لبيب رزق، دراسات في التأريخ الحديث و المعاصر،تحرير لطيفة محمد سالم، مطبعة المجلس الاعلى للثقافة،مصر،٢٠٠٣.

٧) زين العابدين شمس الدين نجم، تاريخ العرب الحديث والمعاصر،دار المسيرة للنشر و التوزيع و الطباعة،عمان،الاردن،٢٠١١.

٨) محمد حسن العيدروس: تأريخ الخليج العربي الحديث والمعاصر، عين للدراسة والبحوث الانسانية و الاجتماعية ، ج. م . ع ،١٩٩٨.

٩) كارل بروكلمان، تأريخ الشعوب الاسلامية ، ترجمة : نبيه امين فارس،منير البعلبكي، بيروت،الطبعة الخامسة،١٩٥٣.

١٠) طالب محمد وهيم ، مملكة الحجاز(١٩١٦-١٩٢٥)،منشورات مركز دراسات الخليج العربي بجامعة البصرة، ١٩٨٢.

١١) قدرى قلعجى ، الثورة العربية الكبرى(١٩١٦-١٩٢٥) شركة المطبوعات للتوزيع والنشر ،بيروت ،لبنان،١٩٩٤.

١٢) أمين سعيد ، الثورة العربية الكبرى،مج١، مج ٣،مكتبة المدبولي للنشر،القاهرة، ١٩٥٨ .

١٣) أسماعيل أحمد ياغي ، تأريخ العالم العربي المعاصر، مكتبة العبيكان،الرياض،٢٠٠٠.

* حسين بن عامي بن محمد بن عون بن عبد المعين بن محسن بن عبد الله بن حسين بن عبدالله بن حسن بن ابي نمي (محمد) بن بركات بن حسن بن عجلان... علي بن ابي طالب. بروانه : خير الدين الزركلي. ما رأيت وما سمعت. المطبعة العربية. مصر ١٩٢٣، ص ١١١"جورج انطونيوس،يقظة العرب. ترجمة الدكتور ناصر الدين الاسد، والدكتور احسان عباس، دار العلم للملايين. بيروت. الطبعة الثانية، ١٩٦٦، ص ص ٢٣٢-٢٣٣.

[٢] - طالب محمد وهيم ، مملكة الحجاز(١٩١٦-١٩٢٥)،منشورات مركز دراسات الخليج العربي بجامعة البصرة، ١٩٨٢،ص١٤.

[٣] - م . ن ، ص١٦.

[٤] - طالب محمد وهيم ، م . س ، ص ١٩ .

[٥] - شهاب أحمد رحمن ، الشريف حسين بن علي و الثورة العربية الكبرى ١٩١٦-١٩١٨ز، گۆڤارى مێژوو، ژ٢٠،چ رۆژهەلات، هەولێر،٢٠١١،ل٢٦١.

[٦] - محمود شاكر ، موسوعة تاريخ الخليج العربي، ج٢، دار أسامة للنشر والتوزيع ، عمان،الاردن،٢٠٠٣،ص٥٧١.

٧ - جورج انطونيوس،يقظة العرب. ترجمة الدكتور ناصر الدين الاسد، والدكتور احسان عباس، دار العلم للملايين. بيروت. الطبعة الثانية، ١٩٦٦، ص١٧٨.

٨ - طالب محمد وهيم ، م . س ، ص٢١ .

* - سەعيد حەليم ، لە نەوەی مەحەمەد عەلی پاشای میسر بووە ، هاوسۆز بووە لەگەڵ شەریف حسێن، بەهۆی ئەو پەیوەندیەی کەوا لە نێوانیاندا بوو کە دەگەڕایەوە بۆ سەدەی ١٩،بەهۆی ئەو پشتیوانیەی کەوا بنەماڵەی حسێن (ئال عون) لەکاتی هەڵمەتی فەتح کردنی جەزیرە و سەرکوتکردنی وەهابیەکان لە مەحەمەد عەلی کردیان ، بگەڕێوە بۆ: سليمان موسى، الحركة العربية ١٩٠٨- ١٩٢٤. دار النهار - بيروت ١٩٧٠، ص٧٥.

[٩] - سليمان موسى ، الحسين بن علي و الثورة العربية الكبرى، دار النشر و التوزيع، عمان ، ١٩٥٧،ص٧٨.

* – میر عەبدوللا لە سەفەرەکەیدا بۆ ئەستانە پەیوەندی کرد بە لۆرد کتشنر ی مەندوبی سـامی بەریتانی لە قاهیرە ، گفتوگۆی لەگەڵداکرد سەبارەت بە ئیمکانیەتی هاوکاریکردنی بەریتانیا بۆ باوکی،ئەم بابەتەش لەلایەن حکومەتی بەریتانیا بە بایەخەوە لەبرەچاو گیرا.بۆ زانیاری زیاتر لەسەر میر عەبدوللای کوری شەریف حسین بگەڕێوە بۆ: جورج انطونیوس،م.س، ص٢٠٤.

١٠ – حسین خلف الشیخ خزعل، تأریخ الکویت السیاســـي، دارو مکتبة الهلال،ج٣،ص٤٧.

١١ – طالب محمد وهیم ، م . س ، ص٣٩.

١٢ – جورج انطونیوس،م.س، ص٢٠٦.

١٣ – یونان لبیب رزق، دراسات في التأریخ الحدیث و المعاصر،تحریر لطیفة محمد سالم، مطبعة المجلس الاعلی للثقافة،مصر،٢٠٠٣،ص٤٥٥.

١٤ – طالب محمد وهیم ، م . س ، ص٤٠.

١٥ – أمین سعید ، الثورة العربیة الکبری،مج١،مکتبة المدبولي للنشر،القاهرة، ١٩٥٨ ،،ص١٥.

١٦ – جورج انطونیوس،م.س، ص٢١٠.

١٧ – طالب محمد وهیم ، م . س ، ص٢٨.

١٨ – شهاب أحمد رحمن ، م . س ، ص٢٦٤.

١٩ – محمود شـاکر ، م . س ، ص٥٧٢.

٢٠ – جورج انطونیوس،م.س، ص٢١١.

٢١ – جورج انطونیوس،م.س، ص٢١٣.

٢٢ – محمود شـاکر ، م . س ، ص٥٧١.

٢٣ – زین العابدین شمس الدین نجم، تاریخ العرب الحدیث والمعاصـر،دار المسیرة للنـشر و التوزیع و الطباعة،عمان،الاردن،٢٠١١،ص١٧٨.

٢٤ – م . ن ، ص ١٨٣.

٢٥ – محمد حســن العیدروس: تأریخ الخلیج العربي الحدیث والمعاصر، عین للدراسة والبحوث الانسانیة و الاجتماعیة ، ج. م . ع ،١٩٩٨،ص٢٢٣.

٢٦ – زین العابدین شمس الدین نجم، م . س ، ص٢١٤.

٢٧ – محمد حسـن العیدروس: م .س ،ص ٢٢٥.

[٢٨] – قـدری قلعـچی ، الثـورة العربیـة الکـبری(١٩١٦–١٩٢٥) شـرکة المطبوعـات للتوزیـع والنشـر ،بیروت ،لبنان،١٩٩٤،ص١٩٢.

* – بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئـەم نامانـە بگـەرێوە بـۆ : جـورج انطونیـوس،م.س، ص٥٧١" ئـازاد میرخـان ، نامـە و نامـەکاریی نێـوان شـەریف حـسێن و ماکمـاهۆن (١٩١٥)، گۆڤـاری سـەنتەری لێکۆلینـەوەی سـتراتیجی کوردسـتان، ژمـارە ٣، سـالّی پانزدەهـەم، ٢٠٠٧، ل ل ٢٤٥–٢٦٥.

٢٩ – طالب محمد وهیم ، م . س ، ص٣٣.

٣٠ – محمود شـاکر ، م . س ، ص٥٨٩.

٣١ – حسین خلف، م . س ، ص ص ٥٠–٥١.

٣٢ – محمود شـاکر ، م . س ، ص٥٩٠.

٣٣ – شهاب أحمد رحمن ، م . س ، ص٢٦٧.

٣٤ – قدری قلعچی ، م . س ، ص٢٣٢.

٣٥ – امین سعید:م.س. ص٢٨٦.

٣٦ – طالب محمد وهیم ، م . س ، ص٥٨.

٣٧ – جورج انطونیوس،م.س، ص٣١١.

٣٨ – قدری قلعچی ، م . س ، ص ص٢٤٤–٢٥٦.

٣٩ – حسین خلف، م . س ، ص ٥٦.

[٤٠] - طالب محمد وهیم ، م . س ، ص ٥٩.

٤١ – طالب محمد وهیم ، م . س ، ص ٦١.

٤٢ – امین سعید:م.س. ص١٨٢.

٤٣ – طالب محمد وهیم ، م . س ، ص ٦٢.

٤٤ – م . ن، ص ٦٦.

٤٥ – امین سعید:م.س. ص٢٨٧.

٤٦ – طالب محمد وهيم ، م . س ، ص ٤٣.

* – دەرکەوتنی ئیدریسیەکان دەگەڕێتەوە بۆ احمد الادريسي کە لە بنەچەدا دەگەڕێتەوە بۆ مەغریب، دواتر لە قایمقامیەتی سابیا نیشتەجی بوو لەعسیر ـ لەو کاتەی کە لە مەککە نیشتەجێ بوو ـ هەرلە١٧٩٩ وەکو بانگەوازخوازێکی ئاینی تاکو مردنی لە ١٨٣٧، لەدوای خۆیدا سەروەت و سامانێکی زۆری بۆ منالەکانی بەجێهێشت، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی بنەماڵەکەی لەدوای ئەودا ناوباگێکی زۆریان هەبێت، وە محمد ئیدریسی لە نەوەی احمدبووە، لە ساڵی ١٨٧٦لەسابیا لەدایك بووە، خوێندنی لە ئەزهەر والكفره تەواوکردووە کەبارەگای سەنوسیەکان بوو لە برقە لە لیبیا، دواتر گەراوەتەوە بۆ صابیا لە ساڵی١٩٠٧ دوای ئەوەی پێگەیشت لەرووی جەستەیی و هزرییەوە. بۆ زیاتر زانیاری بگەڕێوە بۆ، جورج انطونیوس،م.س، ص ٢٠٢.

٤٧ – امين سعيد:الثورة،مج٣. ص١٣٣.

٤٨ – کارل بروکلمان، تأريخ الشعوب الاسلامية ، ترجمة : نبيه امين فارس،منير البعلبكي، بيروت،الطبعة الخامسة،١٩٥٣،ص ص ٧٤٨–٧٤٩.

* – چەند ناوێکی تر بەو رێکەوتنامەیە گوتراوە ، ئیدوارد جرای وەزیری دەرەوەی بەریتانیا بەو رێکەوتنامەی گوتووە رێکەوتنامەی نهێنی نێوان ئینگلیزو فەرەنسا و روسیا لەسەر ناوچەکانی هەژموونی روسیا لە ئاسیا، هەروەها ناسراوە بە رێکەوتنامەی قاهیرە بە هۆی ئەوەی هەندێك لە رێکارەکانی کە لە قاهیرە بەرێوە چووە،بۆ زیاتر زانیاری لەسەر رێکەوتنامەکە بگەڕێوە بۆ : زين العابدين شمس الدين نجم، م . س ، ص ص١٩٧–١٩٥.

٤٩ – امين سعيد:الثورة،مج ١ ، ص ١٨٢.

٥٠ – طالب محمد وهيم ، م . س ، ص ٢١٧ .

٥١ – کارل بروکلمان، م . س ، ص ٧٤٩.

٥٢ – بۆ زیاتر زانیاری لە سەر کۆبوونەوەکەی نێوان لۆرانسی راوێژکاری وەزارەتی داگیرگەکانی بەریتانی بۆ کاروباری عەرەبی لە گەڵ شەریف حسێن بگەڕێوە بۆ: أمين سعيد:الثورة،مج ٣، ص ص١٥٨–١٦٥.

٥٣ – کارل بروکلمان، م . س ، ص ٧٥٠.

* – ناجی ئەسیل ئەفسەرێکی سەربازی عێراقی بوو، خوێندنی لە کۆلێژی ئەمەریکی لە بیروت تەواو کردبوو،چۆتە ریزیسوپای عەرەبی لە کاتی شۆرش لە جەدە ساڵی ١٩٢٢ز، بۆ زیاتر زانیاری بگەڕێوە بۆ: أمين سعيد:الثورة،مج ٣،ص١٦٥.

* – بۆ زانیاری زیاتر لەسەربەندەکانی رێکەوتنەکە بگەڕێوە بۆ أمين سعيد:الثورة،مج ٣،ص١٧٠.

٥٤ – أمين سعيد: الثورة،مج ٣، ص١٧٢.

٥٥ – أسماعيل أحمد ياغي ، تأريخ العالم العربي المعاصر، مكتبة العبيكان،الرياض،٢٠٠٠،ص٣٦.

٥٦ – كارل بروكلمان، م . س ، ص ٧٥١.

٥٧ – محمد حســن العيدروس: م . س ، ص ٢٢٥.

# خوێندنەوەیەك بۆ كتێبی
# ( سەرەتاكانی فەلسەفە ) ی پۆلی یازدەهەمی ئامادەیی وێژەیی

ن: ئامانج نازم بیجان ـ ولاّتی ڕووسیای فیدراڵ
زانكۆی حكومی (كورسك) كۆلێجی مێژوو – (مێژووی ڕووسیا)

## پێشدەستی

فەلسەفە، وەك و هەر بابەتێكی تری كایەی ڕۆشنبیری، جێگەیەكی ئێجگار گەورە و، بەرفراوانی هەیە، بۆ هۆشیاری و، بەئاگابوونی مرۆڤ ، لە ژیانی ڕۆژانەی دا، وێڕای دەوڵەمەندی بابەتەكە، بەڵكو دەتوانین بڵێین: فەلسەفە بۆخۆشی، وەك و بابەتێك، خاوەن خەسڵەت و، تایبەتمەندی خۆیەتی، واتا گەلێك جیاكاری هەیە، لەگەڵ بابەتەكانی تری بواری ڕۆشنبیری و، هۆشیاری مرۆڤ دا.ڕەنگبێ هەر ئەمەش وای كردبێت، كەوا فەلسەفە وەك و بابەتێك، خۆی نیشان بدات و، بناسرێت، كە هەموو كەس ئارەزووی خوێندنەوەی نەكات، ڕاستە زۆر لق و، بابەت هەن، لە بابەتی نێوبراوودا، كە سەرەنج ڕاكێشن و، زۆرجاران وا لە مرۆڤ دەكات، بایەخی پێبدات، وەڵێ ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێت، كەوا هەموو كەسێك، لەگەڵ فەلسەفەدا هەڵبكات.چونكی مامەڵەكردن لەگەڵ بابەتی نێوبراوودا، ئارامی و، لێهاتوویی و، توانایی مرۆڤی پێویستە.ئەو كاتەی كە خوێندكاری زانكۆ بووم، زۆر ئارەزووی ئەوەم دەكرد، كەوا كتێبی هزری و، فەلسەفی بخوێنمەوە، وە بەرهەمێكی زۆرم لەو بارەیەوە تاوتوێ كرد، بەلاّم ئەمە مانای ئەوە نییە، شارەزاییەكی باشمان هەبێت، لەو بارەیەوە، چونكی بابەتی فیكری و،

فەلسەفی، زۆر قووڵن و، لە هەمان كاتیش دا، خوێندنەوە و، تێگەیشتنیان ئاسان و، سانا نییە، بەڵام وێڕای هەموو ئەمانەش، دەتوانین (قوول)، لە (فول) جوودا بكەینەوە ! یان بە واتایەكی تر، دەست و پەنجەمان لەگەڵ ئەلف و بێ ی، ئەو جۆرە بابەتانەدا، نەرم كردووە.وە هەمیشە ئارەزووی ئەوەمان كردووە، مامەڵە لەگەڵ خوێندنەوەی، ئەو جۆرە بابەتانەدا بكەین، كە لە میانەیەوە، مرۆڤ ، دەخاتە گوومانەوە، یان وای لێ دەكات، پرسیاری بۆ دروست بێت، وە یاخود ڕەخنە و، سەرەنجی هەبێت لەو بارەیەوە، یان هەر هیچ نەبێت، مرۆڤ بوروووژێنێ، بۆ بیركردنەوەی نوێ و، قسەی تایبەتی خۆیی هەبێت، لەو بارەیەوە.هەر ئەمەش، وای لێكردین، كە پاش دەرچوونمان لە زانكۆ و، دامەزراندنمان وەك و مامۆستا، ئارەزووی ئەوە بكەین، كەوا بابەتە هزری و، فەلسەفییەكان وەربگرین، ئیدی ئەوە بوو، لە ڕێكەوتی (١١-١١-٢٠٠٧) دا، كە یەكەم ڕۆژی مامۆستاییم بوو، ڕووم كردە، یەكێك لە ئامادەییەكان، وە یەكێك لەو بەشەوانانەی، كە بۆ منیان دانابوو، بابەت و، وانەی (فەلسەفە) بوو.زۆر بە پەرۆشەوە، تواناكانی خۆمم، خستە گەڕ بۆی، بەڵام هەر لە دەستپێكی وانە ووتنەوەم دا، هەستم بە كەم و كورتی و، لاوازی و، هەڵەی زەق دەكرد، لە نێو كتێبەكەدا، چونكی هەر ئەو كات، كتێبەكە بە شێوەیەك وەرگێڕدرا بوو، كە خوێندكاران، بە دەستییەوە دەیاننالاند، بەڵام ئێمە، هەر ئەو كاتەش، دركمان بەوە دەكرد، كەوا ئەم كتێبە، نە ئەوەیە ئێمە ڕازی بكات، وە نەخوێندكارانیش، سوودی لێوەردەگرن.ئاشكرایە، نووسین، بۆ مرۆڤ دەنووسرێت، وە مەبەستیش لێی، هۆشیاری و، ڕۆشنكردنەوەی بیر و، هزری مرۆڤە، وە هەر خوێنەرێكیش، كە نووسراوێك دەخوێنێتەوە، دواجار دەبێت بە خوێنەر و، بەشێك لەو نووسینە، چونكی پشكداری خوێنەر، وا دەكات، پەیڤ و، سەرەنجی تایبەتی خۆیی

هەبێت.وە كاتێكیش، ئەم هەستەمان لە لا دروست بوو، ڕاستەوەخۆ، خۆمان نەدا بەدەستەوە، وەك و زۆر لە مامۆستا بەڕێزەكان، كە هەمیشە و، بەردەوام شەڕیانە، لەسەری ئەوەی، كە (فەلسەفە)، قورس و، ووشكە، بۆیە وەری ناگرن ! كەچی ئێمە، هەمیشە شەڕی ئەوەمان دەكرد، كە بەو كەم و كورتییەوە، بابەتەكە وەربگرین ! هەر بۆیە، ئەو كاتەش، پابەند بووین بە كتێبەكەوە، بەڵام ڕۆژانە، چەندین سەرچاوەی زانستییمان، بۆی دەخوێندەوە و، تاوتوێمان دەكرد، ئەویش بە مەبەستی گەیاندنی پەیامی بابەتەكە و، پیشەكەمان، وە هەروەها ڕاستكردنەوەی چەندین هەڵە و، كەم و كورتی.ئەم ساڵیش – (٢٠١١)، دیسانەوە، هەر لە سەرەتای ساڵەوە، ئامادەیی خۆمانمان دەربڕی، بۆ ئەوەی، بابەتی (فەلسەفە) وەربگرین، كە بابەتەكەمان وەرگرت، زۆر دڵخۆش بووین، وە هەروەها ووتیشیان: هێشتا كتێبی تازەمان بۆ نەهاتووە، ئەمە، ئێمەی زیاتر خۆشحاڵ كرد، چونكی ئێمە، لای خۆمان، وامان دانابوو، كە كتێبەكە، دیارە جارێكی تر چاپكراوەتەوە و، پێداچوونەوەی بۆ كراوە و، بە هەڵە و، كەم و كورتییەكانییەوە چوونەتەوە، بەڵام نەمان زانی، بە هەمان شێوەی جارانی خۆی، جارێكی تر، چاپكراوەتەوە ! وە ئەمەش وای كرد، دووبارە تووشی ماندووبوونێك ببین، كە بە دەیان جار، لەوەی پێشوو، قوورستر بووبێت.وە هەر ئەو فاكتەرە سەرەكییەش بوو، وای كرد، كەوا ئەم سەرەنج و، تێبینییانە، تۆمار بكەین.ڕاستە ئەم كتێبەی، كە ئێمە دەمانهەوێت، قسەی لە بارەوە بكەین، وەرگێڕدراوە، وەڵێ هەنووكە، وەرگێڕە بەڕێزەكان خاوەنین.شیاووی باس لێوەكردنە، ئەم بابەتەی ئێمە، كە خوێندنەوەیەكە، بۆ كتێبی (سەرەتاكانی فەلسەفە) ی پۆلی یازدەهەمی ئامادەیی – بەشی وێژەیی، خۆی لە چەند تەوەرەیەك دا دەبینێتەوە، یان لە چەند كورتە باسێك، پێك هاتووە.جگە لە

(پێشدەستی) و، (پێشنیارەكان)، خۆی لە دوو تەوەرەی سەرەكی دەبینێتەوە.یەكەمیان: بە ناوی (چەند تێبینییەك دەربارەی وانەی فەلسەفە) وەیە، كە لە ئەم كورتە باسانە، پێك هاتووە: (یەكەم: كتێب و جیاوازی) — (دووەم: وەزارەتی پەروەردە و بەئاگابوون) — (سێهەم: وەرگێڕان و سەرەتاكانی فەلسەفە) — (چوارەم: خوێندكار و لە دایك بوونی فەلسەفە).وە دووەمیشیان: بە ناونیشانی (چاوگێڕانێك بە نێو كتێبی (سەرەتاكانی فەلسەفە)) وەیە، كە بە هەمان شێوە، لە شەش بەش، پێك هاتووە: بەشی یەكەم: (فەلسەفە و واتاكانی) — بەشی دووەم: (جۆرەكانی بیركردنەوە) — بەشی سێیەم: (بابەتە گشتییەكانی فەلسەفە) — بەشی چوارەم: (خستنەڕووی مێژووی فەلسەفە لە شارستانیە كۆنەكاندا) — بەشی پێنجەم: (مێژووی بیری (هزری) فەلسەفەی ئیسلامی (ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا) — بەشی شەشەم: (بیری نوێی ئەوروپا لە سەردەمی بوژانەوەی ئەوروپا و هەندێ ئاكارە فەلسەفیە نوێیەكانی).دیارە مەبەستیشمان، چاككردن و، باشكردنیەتی، وە لە هەمان كاتیش دا، ئاگاداركردنەوە و، هۆشیاری دان و، زەنگێكە، بۆ خەمخۆرانی بواری پەروەردە و فێربوون، وە هەروەها لاشمان وایە، كەوا سوودێكی زۆرباش، بە خوێندكاران و، خوێندەواران دەبەخشێ.وە هۆكار و، پاڵنەری سەرەكیش، بۆ ئەم كارەمان، زیاتر دەگەڕێتەوە، بۆ دوو خاڵی زۆر گرنگ، ئەویش یەكێكیان ئەوەیە، هەستمان دەكرد، هەتاوەك و ئێستاشی لەگەڵ دا بێت، هیچ بابەتێك لەو بارەیەوە نەنووسراوە، وە خاڵی دووەمیشیان، لەوێوە سەرچاوەی دەگرت، كە ئەم كردارە، زەرەر و، زیانەكانی، گەلێك فرەیە، چونكی ئەم پەرتووكەی، كە ئێمە دەمانهەوێت، قسەی لە بارەوە بكەین، هەر ئاوەها كتێبێكی سانا و، ئاسایی نییە، بەڵكو لە پڕۆگرامەكانی خوێندن دا، دەخوێندرێت و، چەندین

جارە، چاپ دەكرێتەوە، وە ئەوەی ئێستاش، لەبەر دەستمان دایە، لە ڕاستی دا، چاپی پێنجەمی كتێبەكەیە ! وە لە هەمان كاتیش دا، وای كردووە، كەوا فەلسەفە، وێنەیەكی شێواو و، خراپ نیشان بدات.وە هەر لەبەر ڕۆشنایی، ئەم باسانەی سەرەوەش دا، نەخشەڕێگەكەمان دارشتووە.دەبێت لە بیریشمان نەچێت، ئەم كارەی ئێمە، هەر ئاوەها لە پڕێك دا، نەهاتۆتە بەرهەم، بەڵكو جگە لە خوێندنەوە و، سەرەنجلێگرتن، ئاوەها بە دەیان ڕۆژ و، كاژێرمان بۆ تەرخان كردووە، وە بە دەیان جار، پەرتووكەكەمان خوێندۆتەوە، وە بەراوردمان كردووە، لەگەڵ دەیان سەرچاوەی زانستی تردا، وە هەندێ جاریش، سەرەنجی خوێندكارە بەڕێزەكانیش، بە هەند وەرگیراوە، بە تایبەتی لە كاتی وانە گووتنەوەدا، ئەوانیش كەم ئازار و، ماندووبونیان نەچەشت، لە بارەی كتێبەكە و، ئاستی تێگەیشتنیان ! ئومێدەوارم، ئەم سەرەنج و، تێبینییانەی كە دەیخەینەڕوو، دەرگایەكی ڕوون و، ڕۆشن، لە بەردەم خوێندكارە خۆشەویست و، ئازیزەكان دا، والا بكات، لەمەڕ بابەت و، وانەی فەلسەفەدا، وە هەروەها چاوڕۆشنی و، ئاگادارییەكیش بێت، بۆ بەرپرسان و، كاربەدەستانی ئەم پەرتووكە و، بواری پەروەردە و فێربوون.لە كۆتایش دا، ئاواتەخوازم، لە هەڵە و، كەم و كورتی و، ناتەواوییەكانم ببورن، هەرچەندە خۆمانیش، خودی كارەكەمان، دەربارەی هەڵە و، كەم و كورتییە، وەلێ بەختەوەر دەبین، ئەگەر بێت و، ڕێژەی هەڵەكانی ئێمە، بە بەراورد لەگەڵ هەڵەكانی نێو پەرتووكەكەدا، كەمتر و، ساناتر بێت و، زیانەكانیشی، سووك و، ئاسان و، سنووردارتر بێت.

## تەوەرەی یەکەم

## چەند تێبنییەك دەربارەی وانەی فەلسەفە

### یەکەم: کتێب و جیاوازی:

ئەو کەسەی، کە بڕیاری دا، خوێنەر بێت، بێ دوو دڵی، هەموو شتێك دەبینێت، لە نێو پەرتووك و، نووسراوەکانی نووسەران دا.هەر بۆیە، دەبێت هەموو نووسراوو و، نووسەرێك، بە پێ ی شوێن و، کات و، ئاستی نووسەرەکە، خوێندنەوە و، هەڵسەنگاندنی بۆ بکرێت، مەبەستیشمان ئەوەیە، جیاوازی هەیە، لە نێوان کتێبێك، بۆ پەرتووکێکی تر.بۆ وێنە: (تەورات – ئینجیل – قورئان) یش، هەر کتێبن، بەلاّم چ کتێبێکن و، نووسەرەکەی کێیە؟! ئاشکرایە، ئەو دووانەی یەکەمیان، لە کاتی خۆیان دا، گەورەترین کاریگەری بەسەر مرۆڤایەتی دا هێناوە، وە قورئانی پیرۆزیش، هەتا وەك و هەنووکە، تاکە کتێبێکە، کە کاریگەری زۆر باش و، چاکی بەسەر ژیانی مرۆڤایەتی دا هێنابێت، وە نووسینەکانیشی، ووتە و، پەیڤی خودای گەورەیە، بۆ بەندەکانی، ئەمە جگە لەوەی، کە لێوان لێوە، لە زانیاری و، نهێنی جیاجیا.وە دەبێت جیاوازیش بکەین، لە نێوان تەواوی نووسراوەکان دا، ئەویش بە پێ ی کات و، شوێن و، ئاستی نووسەرەکە، وە هەروەها دەبێت لە یادیشمان نەچێت، کتێبێك، کە نووسەرێك بینووسێت و، لە بازاڕەکان دا بفرۆشرێت، کە ئەوەی ئارەزووی کرد، دەیخوێنێتەوە و، ئەوەشی مەیلی لێ نەبوو، ناچی بە لایەوە، ئەمە لە کاتێك دایە، نووسەرەکەشی زۆری لە کەس نەکردووە، یاخود داوای لە هیچ خوێنەر و، خوێندەوارێکیش نەکردووە، کە کتێبەکەی بخوێننەوە، ئەگەرنا، زیانی پێدەگات !!! هەر بۆیە، بە سەدان و، دەیان کتێب دەبینرێت، کە لێوان لێوە، لە هەڵە و، کەم و کورتی زانستی، یان هەڵەی هونەری، یاخود هەڵەی چاپ، وەلێ خەڵکی،

زۆر مەبەستییان نییە، لە بارەیەوە بدوێن.یاخود بە واتایەكی تر، ڕەنگبێ كاریگەرییە خراپەكانی، زۆر نەبێت، چونكی خوێنەر، ئازاد و، سەرپشكە لەوەی، كە بیخوێنێتەوە، یان نەیخوێنێتەوە. بەڵام جیاوازی، ئەم كتێبانەی، كە باسمان لێوە كرد، گەلێك جوودایە، لەتەك پەرتووكێك، یاخود هەر نووسراوێكی تر بێت، كە لە بەرنامە و، پرۆگرامەكانی خوێندن دا، بەكاربهێنرێت و، بخوێندرێت، ئیدی لە وەزارەتی پەروەردە دا بێت، یان لە شوێن و، جێگەیەكی تردا بێت، هیچ جیاوازییەكی نییە.هەر بۆیە، ئەو كتێبەی، كە بە مەبەستی پرۆگرامی خوێندن، ئامادە دەكرێ، دەبێت زۆر لێزانانە، مامەڵەی لەگەڵ دا بكرێت، چونكی بابەتێك، كە لە بەرنامەی خوێندن دا دانرا، ئیدی تەواوی خوێندكارانی ئەو قۆناغە، مەرجە، پابەند بن پێیەوە، ئەگەر نا، ئەوە لە خوێندن دا دەرناچن و، دوادەكەون.وە ڕەنگبێ زۆربەمان، كتێبەكانی سەردەمی (حیزبی بەعس) مان، لە یاد بێت، كە یەكێك لە سیاسەتە چەوتەكانی، ئەوە بوو، كەوا مێژووی حیزبی نێوبراوو، بە نادروستییەكانییەوە، بخاتە نێو بەرنامەی خوێندنەوە، وە لە زۆربەی زۆری قۆناغ و، بابەتەكانیش دا، دەخوێندرا، ڕەنگبێ ئەمەش، لەوێوە سەرچاوەی گرتبێت، كە لە لایەك، دەبێت هەموو خوێندكارێك بیخوێنێت و، مەرج و، پێویستییەكە بۆ دەرچوون، لەو بابەت و، قۆناغەدا، وە لە لایەكی تریشەوە، مەبەست لێ ی، سیاسەتی ناساندنی خودی حیزبەكەیەتی و، ئاوێتەبوونیەتی لەتەك تاكەكانی كۆمەڵگادا.جا ئەم كتێبەش، كە ئێمە قسەی لە بارەوە دەكەین، بە هەزارەها خوێندكار، هەفتانە كۆششی تێدا دەكەن، وە سەرەڕای ئەو هەڵە و، كەم و كورتییانەی، كە تێیدایە، كەچی، هیچ كام لەو خوێندكارانە، مافی ئەوەیان نییە، دەستبەرداری بن و، بڵێن: (زیانەكانی ئەم پەرتووكە، گەلێك لە قازانجەكانی، زیاترە) ! جیاكاری و، جیاوازی كتێبی ئاسایی، لەگەڵ ئەو

كتێبەی، كە لە بەرنامە و، پرۆگرامی خوێندن دا، دەخوێندرێت، لەوەدایە، كە ئەوەی دووەمیان، خراپە و، هەڵە و، كەم و كورتی و، زیانەكانی، بۆ تەواوی خوێندكارانی ئەو قۆناغە دەبێت، بە هەموو شوێن و، جێگاكانییەوە، وە گومانێكیش، لە جێبەجێكردنی ئەو زەرەر و، زیانانەدا نییە ! چونكی ئەگەر خوێندكارێك، بە هۆی كەمتەرخەمییەوە، لە وانە و، بابەتێك دا دەرنەچێت، ئەمەیان دەگەڕێتەوە، بۆ خودی خوێندكارەكە خۆی، وەلێ ئەگەر هاتوو، هەڵە و، كەم و كورتی و، بابەتی نازانستی، لە كتێبێكی خوێندن دا هەبوو، ئەوە مەرگەسات دەخولقێنێ، چونكی دەرچوون و، دەرنەچوون و، فێربوون و، فێرنەبوونی خوێندكاران، ئەو كات، ئەرزشێكی نابێت.

## دووەم: وەزارەتی پەروەردە و بەئاگابوون:

لە ڕاستی دا، وەزارەتی پەروەردە، لە زۆر بوار و، لایەنی گرنگ دا، بێ ئاگا و، بێ باكی خۆی نیشان دەدات.بەشێ هەڵە و، كەم و كورتی و، ناتەواوییەكانی، (بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەكان) ی خوێندن، بابەتێكی بچووك بێت لەو بارەیەوە.ئەم ووتانەی ئێمە، ئەگەر بەراورد بكرێت، لەگەڵ بەرگی دەرەوە و، بەرگی ناوەوەی، كتێبی (سەرەتاكانی فەلسەفە) دا، ئەوە تووشی سەرسامیمان دەكات، وە لە لایەكی تریشەوە، ووتەكانمان، بە زیادەوە دەسەلمێنێ و، گەواهی ڕاستی و، دروستیمان بۆ دەدات.چونكی ئەم كتێبە، بۆ ماوەی چەند ساڵێكە، هەر چاپ دەكرێت و، بە تیراژی ئێجگار زۆرەوە، لە تەواوی ناوەندەكانی خوێندن دا، دەخوێندرێت ! لەگەڵ بوونی ئەوەش دا، هەر لە سەرەوەی كتێبەكەدا، نووسراوە: (بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەكان) ! ! ! بە باوەڕی ئێمە، ئەگەر وەزارەتی پەروەردە، لەم

پرسانەدا، بێ ئاگا بێت، ئەوە دەتوانرێت، ووشەگەلێكی وەك و: نادڵسۆزی و، ناپسپۆڕی بدرێتە پاڵی.خۆ ئەگەریش، بە ئاگابوونی خۆی نیشان بدات و، هەتاوەك و هەنووكەش، چارەسەری نەكردبێت، ئەوە دووجاران مەرگەسات و، ماڵوێرانی دروست دەكات، چونكی پشكدار دەبێت، بە شێوەیەكی ڕاستەوەخۆ، لە گاڵتەكردن و، وێرانكردن و، شێواندن و، سووكایەتیكردن، بە فەلسەفە و، خوێندكارانیش.

## سێهەم: وەرگێڕان و سەرەتاكانی فەلسەفە:

بە ڕاستی وەرگێڕان، كارێكی ئێجگار قورس و، ئاڵۆزە، وەلێ لە ناوەندی ڕۆشنبیری كوردی دا و، لە سەردەمی ئێستامان دا، بووە بە بابەتێكی زۆر ئاسان و، زۆر بەربلاوو، بەلام دەبێت لە یادیشمان نەچێت، زۆری و، بۆری پێوە دیارە ! ئێستاش لە یادمە، ئەو كاتەی كە لە (پۆلی پێنجەمی ئامادەیی) — بەشی وێژەیی دا بووین، كە خوێندنمان بە زمانی عەرەبیش بوو، لە بابەتی فەلسەفە دا، نزیكەی هەر هەموو كتێبەكەمان، تەواو كرد، وە سوودێكی زۆریشمان لێ بینی و، تووشی هیچ كێشە و، گرفتێك نەبووین، لەو بارەیەوە، بەڵكو زۆربەی زۆریشمان، لە بابەتی فەلسەفەدا، بەخشراین ! ئەوەی تۆزێك، تاقەتی خوێندنەوەی كتێبی فیكری و، فەلسەفی هەبێت، بێ گومان، ناو و، ناوبانگی، ئەو نووسەرانەی بیستووە، كە خاوەنی ئەم كتێبەن و، كاتی خۆی، پێكەوە نووسیوویانەتەوە، وێڕای ئەمەش، چەندین نووسین و، بەرهەمی بە پێزتریان هەیە لەم بارەیەوە، بە تایبەتی بە زمانی عەرەبی.ئێمە لێرەدا، زۆر ناچینە نێو بواری وەرگێڕان و، نووسەرانی ئەم كتێبەوە.بەڵكو گرنگە بپرسین: ئایە ئەو سێ وەرگێڕە بەڕێزانە، لە میانەی كارە وەرگێڕانەكەیانەوە، هەستیان بە سەركەوتوویی، كارەكەیان

كردووە؟! پێم خۆشە، وەرگێڕە بەڕێزەكان، یان خوێنەری هێژا، بە ئینساف و، ویژدانێكی زانستی و، مرۆڤدۆستییەوە، بەرسڤی ئەم پرسیارە گرنگ و، بێ وەلامەمان بدەنەوە ! بە داخەوە، ئێمە وەك و تاكی ڕۆژهەلاتی، بەشێوەیەكی گشتی و، بە تایبەتی ئێمەی تاكی كوردی، خۆمان لە هەموو كار و، كردارێك دەدەین، بێ ئەوەی، جارێك لە خۆمان بپرسین: ئاخۆ توانست و، لێهاتوویی ئێمە، شیاوو و، گونجاوە، بۆ ئەو كار و، شوێنە؟ وە زۆر بە كەمی، ئامرازی (نا)، یاخود ووشەی (نەخێر)، بەكار دەهێنین، لەو پرسیارانەی، كە ڕۆژانە ڕووبەڕوومان دەبێتەوە ! چونكی زۆرمان پێ شەرمە، ئەگەر بلێین: ئێمە، شیاووی ئەو شوێنە نین، یان ئەو كارە، لە توانای ئێمەدا نییە ! بەلكو ڕاستەوخۆ و، بێ بیركردنەوە، بە زەردەخەنەیەكەوە، (بەلێ) ی بۆ دەكەین و، بە خۆشحالییەوە، ئامادەیی خۆمانی، بۆ دەردەبڕین ! ئەبێ جگە لە سەرسوڕمان، چ شتێكی تر، لەو بالاتر و، زیاتر هەبێت؟! لە كاتێك دا، ئەم پەرتووكە، (پێداچوونەوەی زانستی) یشی بۆ كرابێت و، لەو لاشەوە، (سەرپەرشتی زانستی چاپ) و، (پێداچوونەوەی زمانەوانی) و، (نەخشەسازی و سەرپەرشتیاری هونەری چاپ و بەرگ) یش، ئامادەیی هەبووبێت !!! ئەگەر خوێنەر، سەرەنجێكی ووردی، وەرگێڕانی ئەم پەرتووكە بدات، زۆر جار، بیری بۆ ئەو جۆرە وەرگێڕانانە دەچێت، كە لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە، ئەنجام دەدرێت !

## چوارەم: خوێندكار و لە دایك بوونی فەلسەفە:

سەرەتا، دەبێت پێش هەموو شتێك، ئاگاداری ئەوە بین، كەوا لە كوردستان دا، پسپۆڕی بواری فەلسەفەمان زۆر كەمە، تا ئەو ڕادەیەی، كە لە زۆربەی شوێنەكان دا، لە نەبوونەوە نزیكە، ئەمەش، بە هۆی بایەخ نەدانی كۆمەلگەیە،

بە شێوەیەکی گشتی و، بەتایبەتی زانکۆکان، بۆ بوار و، بابەت و، پسپۆڕی فەلسەفە، وە ئەو مامۆستایانەش، کە وانە و، بابەتی فەلسەفە، بە خوێندکاران دەڵێنەوە، زۆربەی زۆریان، دەرچووی بەشەکانی وەك و: (مێژوو — جوگرافیا — ئابووری) ین.دەبێت لە یادیشمان نەچێت، خوێندنی بابەت و، وانەی فەلسەفە، چ وەك و کتێب و، پرۆگرامی خوێندنیش، تازە و، نوێیە، وە خودی بابەتەکەش، هەر بەناوەکەیەوە دیارە، کە بە ناونیشانی (سەرەتاکانی فەلسەفە) وەیە.هەر بۆیە، خوێندکارەکانیش، بۆ یەکەمین جارە، کەوا بابەتێك دەخوێنن، سەبارەت بە فەلسەفە، ئەویش لە پۆلی یازدەهەمی ئامادەیی — بەشی وێژەییە ! واتە ئەزموونێکی تازەیە و، لە هەمان کاتیش دا، هەستیار و، ناسکە، چونکی خوێندکار، هیچ پێشینەیەکی، لەو بارەیەوە نییە، وە زۆرجاریش، مامۆستاکەشیان، بارودۆخی لە خوێندکاران باشتر نییە ! هەر بۆیە، دەبێت چ مامۆستاکە و، چ کتێبەکەش، لە ئاستێك دا بێت، کەوا لە توانا و، ئاستی خوێندکاران، بەدەر نەبێت.وە هەروەها دەبێت، وا لە خوێندکار بکرێت، کە ئارەزووی خوێندن و، خوێندنەوەی بابەتە فیکری و، فەلسەفییەکان بکات، نەك بە نووسینێك، یاخود وەرگێڕانێك، هاوشێوەی ئەم کتێبە بێت، کە ئەوەندە خوێندکار دەتۆقێنێت، هێندە ئاشنای ناکات، بە بابەتی فەلسەفە ! وایان لە خوێندکاران کردووە، تەنانەت ڕقیان لە ووشەی فەلسەفەش هەبێت ! هەر بۆیە، دەبێت کەسانێك، هەستن بەم کارە، کە شارەزاییان هەبێت، لەو بارەیەوە.لە میانەی خوێندنەوەی ئەم کتێبەوە، زیاتر بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کە وێنەیەکی وەها، بۆ فەلسەفە نەخشێنراوە، کەوا خوێندکار، لێ ی هەڵبێت و، بە بیستنی ناوی فەلسەفە، ترسی لێبنیشێت ! ئێمە، سەرەتا وامان دەزانی، ئەم کێشەیە، هەر خوێندکارانی، خوێندنگەکەی خۆمانی گرتۆتەوە، ووتمان: نەبادا ئەم

ناوچەیەی ئێمە، بۆ فەلسەفە نەشێت !!! بەلآم دوایی، بۆمان ساغ بوویەوە، كە تەواوی شوێن و، جێگاكانی تریشی تەنیوەتەوە، وە فەلسەفە لە هەموو شوێنێك دا، شێوێنراوە.ڕۆژێكیان، لە یەكێك لە كتێبخانە گەورەكانی شاری سلێمانی بووم، بە مەبەستی كڕینی كتێب، سەردانم كرد، ئیدی كوڕێكی لێ بوو، لەسەر كورسییەك دانیشتبوو، كتێبێكیشی بە دەستەوە بوو، زۆرم حەز دەكرد، بزانم خاوەنی كتێبخانەكە، چ دەخوێنێتەوە، دوایی بۆم دەركەوت، كە خوێندكاری یازدەهەمی ئامادەییە و، بەشی وێژەییە، وە سەرقاڵی كۆششە، بۆ بابەتی فەلسەفە و، كتێبەكەی دەستیشی، (سەرەتاكانی فەلسەفە) بوو، ئیدی منیش لێم پرسی: ئەرێ بێ زەحمەت، هیچ لەو كتێبە تێدەگەیت؟ ئەویش گووتی: (نەوەلآ، هیچ شتێكی لێ تێناگەم) ! شیاووی باسە، ئەم درم و، پەتا و، نەخۆشییە كوشندەیە، هەر بە تەنها خوێندكارانی نەگرتۆتەوە، بەڵكو زۆر مامۆستاش هەن، هەمان گرفتی خوێندكارانیان هەیە، چونكی زۆربەی مامۆستایانیش، لێ ی دەترسن و، لێیان بووە، بە دێوەزمە ! هەر ئەم ساڵ بوو، كۆمەڵێك خوێندكاری قۆناغی چوارەم، هاتبوون، بە مەبەستی مەشق و، ڕاهێنان، لە بەشی دەروونناسی بوون، ئیدی پاش گفتوگۆ، ووتیان: (حەزمان لە بابەت و، وانەی فەلسەفەیە) ! منیش كورتەیەكم بۆ باس كردن، بەلآم هەر سوور بوون، لە بارەی وەرگرتنی بابەتی فەلسەفەوە، منیش بابەتەكەم پێدان، بەلآم هەر دوو ڕۆژی بەسەردا تێنەپەڕی، هاتن و، گووتیان: (مامۆستا گیان، داوای لێبووردن دەكەین، ناتوانین ئەم وانەیە وەربگرین) ! بە داخەوە، ئەوەشی ئەم بابەتەی وەرگرتووە و، دەنگ و، قسەیەكی نییە، گوومان لەوەدا نییە، كە بێ ئاگا و، ناشارەزایە، لەو بارەیەوە، چونكی ئەویش وا دەزانێت، فەلسەفە، هەر ئەوەیە، كە لەم كتێبەدا هاتووە ! یان ئەوەیە، كە مافی بابەتەكە نادات، وە هەوڵ

دەدات، نمرەیەکی زۆر هەڵڕێژێ، وە دڵی خوێندکاران ڕازی بکات، یان دەیکات، بە بابەت و، وانەیەك، هاوشێوەی وانەی (وەرزش) و، (هونەر)، کە دیسانەوە مەخابن، کەوتن تێیدا نییە، یاخود زۆر مەحاڵ و، دەگمەنە !!!

## تەوەرەی دووەم

## چاوگێڕانێك بە نێو کتێبی ( سەرەتاکانی فەلسەفە )

### دەستپێك

پێش ئەوەی ڕاستەوخۆ، دەست و پەنجە بخەینە سەر، هەندێ سەرەنج و، هەڵە و، کەم و کورتییەکانی، کتێبی (سەرەتاکانی فەلسەفە)، پێویستە خوێنەر، ئاگاداری ئەوە بێت، کەوا لێرە بە دواوە، ئێمە زیاتر، جەخت لەسەر هەڵەی چاپ و، زمانەوانی و، زانستی دەکەین.واتە، تا ڕادەیەکی زۆرباش، خۆمان بوورادووە، لە هەڵەی گەورەتر و، زەقتری وەك و، هەڵەی هونەری و، کەم و کورتی خاڵبەندی.ئەمە وێڕای ئەوەی، کەوا نەمانتوانی کتێبەکە، بە زمانی عەرەبی پەیدا بکەین و، دواجار بەراوردێکی هەردووکیانمان بکردایە.جا بۆیە، هەوڵ دەدەین، ئەوەی لە کتێبەکەدا هاتووە، وە بە لای ئێمەوە، جێگەی سەرەنج و، ڕەخنەلێگرتنە، ئەوە هەڵوەستەمان لەسەری کردووە و، بە گوێرەی توانا، ڕاستی و، دروستییمان خستۆتە ڕوو، لەو بارەیەوە.وە دەبێت لە بیریشمان نەچێت، ئێمە لەم کارەمان دا، هێندە بە تەماحەوە، نەمانڕوانیووەتە هەڵە و، کەم و کورتی و، بابەتە نازانستییەکانی، ئەم پەرتووکە، بەڵکو بەشی کەسی تریشمان جێهێشتۆتەوە، ئەگەر تاقەتی هەبێت و، بگەڕێت، ئەوە شتی زۆرتر دەدۆزێتەوە ! ئێمە هاتووین، ئەوەی بە لامانەوە، جێگەی هەڵوەستە لەسەرکردنە، چۆن لە کتێبەکەدا هاتووە، هەر بەو چەشنەش، دووبارە

نووسیوومانەتەوە و، خستوومانەتە نێو دوو كەوانەوە، وە هەروەها هێڵیشمان بە ژێری دا هێناوە، وە لە هەمان كاتیش دا، ئەو ڕستەیە، یان ئەو كۆپلەیەی، كە قسەمان هەبووە، لە بارەیەوە، نێوی بابەتەكەشمان لەگەڵی دا نووسیووە، وە هەروەها ژمارەی لاپەڕەكەشی، لە (پەراوێز و ژێدەرەكان) دا، تۆمارمان كردووە.وە هەر بەشێك، بە جیا و، پلە بە پلە، مامەڵەمان لەگەڵ دا كردووە، وە هەروەها بە پێ ی هەڵە و، كەم و كورتییەكان، كارمان لە بارەیەوە كردووە، واتە تەنها ڕاستی و، دروستییمان نووسیوەتەوە و، زیادەڕەوییمان تێدا نەكردووە و، خۆمان لە دوور و، درێژی زانیارییەكانیش، بەدوور گرتووە.وە هەندێك ڕستە و، كۆپلە هەیە، هیچمان لە بارەیەوە نە نووسیووە، چونكی بۆ خوێنەرمان بەجێهێشتووە، كە سەرەنج و، بڕیاری خۆیی لە بارەوە بداتن ! وە دەكرێت سەرەنج و، تێبینییەكانمان، هەر لە بەرگی كتێبەكەوە، دەست پێبكەین، چونكی لە بەرگی پێشەوە و، پاشەوەی پەرتووكەكە، دوو وێنە هەیە، بەلام ڕوونكردنەوەی لە بارەوە نەدراوە ! دەبێ بۆ چی، ئاماژە بەم وێنانە نەكرابێت؟ كە ئایە وێنەی چ كەسێكە و، خاوەنەكەی كێیە؟ چونكی بێ گومان، خوێندكار، زۆرینەی جار، ئارەزووی ئەوە دەكاتن، بزانێت ئەم وێنەیە، هین كێیە، یان كێ كێشاویەتی و، دروستی كردووە، یاخود گوزارشت لە چ دەكات؟ ئەگەر پرسیاری، لەم جۆرە كرا، كێ وەلامی پێویست و، دروستیان، دەداتەوە؟

## بەشی یەكەم:- (فەلسەفە و واتاكانی)

هەر لە سەرەتای بەشی یەكەم دا و، لە باسی (فەلسەفە و واتاكانی) دا، هاتووە: (فەلسەفە وشەیەكی (چەمكێكی) یۆنانییە ...)، پاشان هاتووە: (كەواتە دەتوانین بڵێین فەلسەفە، چالاكییەكی بەرنامەڕێژە تێدەكۆشێت لە ڕاستی

زانیارییەكان (حەقیقەتەكان) دیاردە جۆراوجۆرەكان، بگات ...) [1]. باشە، ئێمە دەپرسین: ئایە (ووشە)، لەگەڵ (چەمك) دا یەكن، یان جوودان؟ ئایا (زانیارییەكان) و، (حەقیقەتەكان)، یەك واتە دەبەخشن؟ ئەگەر نا، بۆچی هەر یەكەیان، بە دوای ئەوی تردا هاتووە؟ پاشان، چۆن دەبێت، (زانیارییەكان — حەقیقەتەكان — دیاردە جۆراوجۆرەكان)، هەموویان، بە دوای یەكدی دا بێت؟!

وە لە لاپەڕەی دواتردا، نووسراوە: (لەبەر ئەوە، دەتوانرێت بوترێت كە فەلسەفە خۆی نییە، بەڵكو فەلسەفەی هەیە، ئەمەش بۆ ئەوەیە لە ساتمە و گرفتەكانی ناساندنەكەی بە دوور بین، هەروەها چونكە فەلسەفە كردەیەكە، یان چالاكییەكە، هەردەمیش ناساندنی چالاكی بە ئەركتر و ئاڵۆزترە لە ناساندنی شتی دیاریكراو) [2]. كێ دەتوانێ، ئەم كۆپلەیە، جارێكی تر، دایڕێژێتەوە و، خوێنەر لێی تێبگات؟ پاشان ووشەی (ساتمە)، بۆ خوێندكار و، تەنانەت بۆ مامۆستاش، تا ڕادەیەك ئاڵۆزە.ئێمە نازانین، مەبەست لەم ڕستەیە چییە؟ كە نووسراوە: (جیاوازییەكانی نێوان فەلسەفە كاری ئاسایی و پوخت (ڕێك و پێك)) [3]. پاشان لە بابەتی (هزر (بیرۆكە)) دا هاتووە: (ئەو بیر و هزرانەی كە لە فەلسەفە میللییەكاندا، دا هەیە بە ڕێكوپێكیان تێدا بەدی ناكرێ، دەبینین لە هزر و بیری فەلسەفەی شارەزایاندا ئاشكرا و ڕوونە.فەلسەفە لە بیركردنەوەی ئاساییدا، فەلسەفەیێكی ناتەواوە و لە دەوری یان شێوەی سەرەتایدا دا دەژی، كەچی بیركردنەوە لە فەلسەفە ڕێكوپێكەكاندا ئەندامێكی تەواو و پتەوە و پێڕەوێكی ڕوون و ئاشكرای هەیە). لێرەدا، ئاڵۆزییەكی زۆر، بەدی دەكرێت، لە تێگەیشتنی ئەو كۆپلەیەی سەرەوەدا.وە هەروەها لە بابەتی (كێشەی ڕێكخستن و گونجان) دا، هاتووە: (ئەو بیروڕایانەی لە ئاستی میللی، یان ئاسایدان، ڕێكی و پوختی و گونجانیان تێدا نییە، كەچی لە لە پێڕەوی فەلسەفی شارەزایانە و

تایبەتمەنـدا و بەشـێوەیەكی گـشتی گونجـان و تـەبایی و پێوەلكـانێكی بـەهێز دەبینین.ئەم جۆرە ڕێبازە فەلسەفییە بونیادێكی پتـەوی هەیـە).ئـەبێ خوێنـەر، لەو ڕستانەی سەرەوەدا، شتێك تێبگات؟! وە لە بابەتی (پچڕان و بەردەوامێتی) دا، هـاتووە: ((فەلـسەفەكایی ئاسـایی ...))[٤]. باشـە، (فەلـسەفەكایی ئاسـایی)، واتای چ دەبەخشێت؟ وە هەروەها لە بابـەتی (ڕوونـی وشـیاری و لێلیەكـەی) دا، هاتووە: (...وەك هـەر چـالاكییەك ئامـانجی ڕازیكردنـی ئارەزوویـەك بێـت، ئـەوە چالاكییەكی كردارییە، ئەو دەمە گەڕان و بەتوێژینەوە بـە دوای تێگەیـشتن، یـان زانیاریـدا، لـە ئـارەزووی ئاگالێبوونـەوە سـەرهەڵدەدات و بەجۆشـتین ئـارەزوو دادەنـزێ لـەو ئارەزووانـەی كـە لـە مرۆڤـدا جـێگیرە)[٥]. جگـە لـەو هەڵانـەی كـە تێیدایـە، وەك و (دادەنـزێ)، بـەڵام ئێمـە، دەپرسـین: كـێ دەتوانێـت، پـاش خوێندنەوەی بە چەند جارێكیش، لەم كۆپلەیـەدا، شـتێكمان بـۆ بخاتـە ڕوو، كـە جێگەی تێگەیشتن بێت؟ لە ڕاستی دا، ئێمە لە ووشەی (بە جۆشتین)، تێناگـەین ! دواتریش، لە بابەتی (پیداویستییە فەلسەفیەكان) دا، هاتووە: (لەو هەموو ئەو شتانەی گوترا...).باشتر وایە، بنووسرێت: (لەو هەموو شتانەی گـووترا...)، یـان (هەموو ئەو شتانەی گووترا...).وە لە بابەتی (گومان و تاقیكردنـەوەی زانیـاری) دا، هـاتووە: (...یـان تایبەتمەندیێتیـەكی ژیرێتـی مرۆڤـە).ئێمـە هـیچ لەمـە تێناگـەین، كـە مەبەسـتی چییە؟! وە هـەروەها لـە هـەمان بابـەت دا، هـاتووە: (...هەست بە تامی ئاو نەكردنی لە كاتی داگرتنی لـەرزوتادا...)[٦]. باشـتر وایـە، بنووسـرێت: (هەسـت نـەكردن، بـە تـامی ئـاو، لـە كـاتی داگرتنـی لـەرز و تـادا)، هەڵبەت ئەمە لە كاتێك دا دەبێـت، ئەگـەر ئـاو تـامی هـەبێت ! پاشـان هـاتووە: (...كـە لەوانەیـە بـآ بنـچینە بێـت...).وە هـەروەها لـە شـوێنێكی تـریش دا، نووسراوە: (زانیارییە بێگومانەكانـدا) [٧]. وە لـە بابـەتی (بوارەكـانی فەلـسەفە و

ئامانجەکانی بە درێژایی چاخەکان) دا، هاتووە: (...باسەکان سەبارەت بە گەردوون مرۆڤ ...).ئەبێ (گەردوون مرۆڤ)، چی بێت؟ پاشان نووسراوە: (زانستی لۆژیك – (منطقی)) ! ئەمەش ئەبووایە، بنووسرێت: (زانستی لۆژیك – علم المنطق)، نەك (منطقی).پاشتر هاتووە: (...لە پێناوەی گۆڕانی جیهاندا، بە واتاییکی دی، بیر بە کارکردنەوەوە بەسترا...) [٨]. ئەمەش، دەبوو بنووسرێت: (...لە پێناوی گۆڕانی جیهاندا...).وە لە لاپەڕەی پرسیارەکانی بەشی یەکەمیش دا، چەند هەڵەیەکی تری تێدایە، وەك و لە پرسیاری پێنجەم دا، هاتووە: (پ٥– تێبکۆشە پێنج بیرۆکەی سەرەکی لە ناساندنە جیاجیاکانی ڕوونبکەوە، کە هەموویان پێکەوە کۆبکاتەوە) ! زۆر باشە، ئێمەش دەپرسین: ئەرێ خوێندکاری داماو، لە بارەی چییەوە تێبکۆشێت و، چ بنووسێت؟ پێنج بیرۆکەی سەرەکی، لە ناساندنە جیاجیاکانی، کێ ڕوون بکاتەوە، کە دواجار، پێکەوە هەموویان کۆ بکاتەوە؟! وە پرسیاری هەشتەمیش، بەم شێوەیە نووسراوە: (پ٨– ئامانج لە فەلسەفەی گشتی و ئامانجی فەلسەفە لە سەردەمی یۆنانیەکان و موسڵمانەکان یەکان و تازەکی (نوێ) ڕوونبکەوە؟)[٩]. لێرەدا، دەبێت خوێنەر، ئاگاداری ئەوە بێت، کە ئێمە، مەبەستمان، هەڵبژاردنی ڕستەیەك نییە، بە تەنها، لە نێو کۆمەڵە ڕستەیەکی تردا، کە مانا نەبەخشێت، یان ماناکەی بگۆڕێ.بە واتایەکی تر، ئێمە نەهاتووین (يَأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا لَاتَقرَبُوا ٱلصَّلَوٰةَ) یان لەگەڵ دا بکەین، بەڵکو (وَأَنتُم سُكَرَى)ش دەخوێنین[١٠]. ئەگەر خوێندکار، هەر لە سەرەتاوە، لە میانەی مامەڵەکردنی لەتەك فەلسەفەدا، بەو هەموو هەڵە و، کەم و کورتییانەوە، ئاشنا بێت، ئیدی چۆن زەندەقی ناچێت؟!

## بەشی دووەم:- ( جۆرەكانی بیركردنەوە )

لەم بەشەش دا، بێ گوومان، چەندین هەڵە و، كەم و كورتی، تێدا بەدی دەكرێت، ئەوەتا، هەر لە بابەتی (بیركردنەوەی ئەفسانەیی كۆن (داستانی)) دا، هاتووە: (...لە كۆمەڵگەكەماندا چەندان كۆمەڵگەی دیكەی جیهاندا بە جۆرێك لە جۆرەكانی هەن و دەبینرێن ...)[11]. باشە ئەگەر گریمان، ئەم ڕستەیە تەواو بێت، لە ڕووی زمانەوانییەوە، ئەی چۆن دەكرێت، لە كۆمەڵگایەك دا، كۆمەڵگایەكی تری تێدا هەبێت ! وە هەروەها لە بابەتی (نزمی ئاستی بیركردنەوە) دا هاتووە: (...بەم شێوەیە ئەویش هێندە هێندە هێزی كارتێكردن و پەسەندێتی و فەرمان ڕەوایی بەهێزە نادیارەكان دەدات...).دواتر لە بابەتی (زیندوێتی مادە (بوونەوەر)) دا، هاتووە: (...بوونەوەرە مادەیەكاندا ...)[12]. باشتر وایە، بنووسرێت: (بوونەوەرە ماددییەكان).دواتر هاتووە: (...واتا گیان بوونەوەرێكە و تەنە زیندووەكەیەتی، یان لێی جیایە ...)[13]. ئێمە شتێك لەم ڕستەیە، تێنەگەیشتین ! هەروەها لە بابەتی (بیركردنەوەی ئایینیانە) دا هاتووە: (یەكەم: لێكدانەوەی مێژوویی هۆشمەندانە (مرۆڤیانە).دووەمیان: لێكدانەوەی ئایینیانە (یەزدانییانە)).پاشان نووسراوە: (١- لێكدانەوەی هۆشمەندانەیی پوخت (مرۆڤیانە)).باشە (مرۆڤیانە – یەزدانییانە – هۆشمەندانەیی)، چ جۆرە ووشەیەكن؟ پاشان هاتووە: (...مرۆڤی سەرەتایی دوایدا شمەكی لەو ژیانە جیاكردەوە كە تێیدایەتی و شمەكەكانی دایە پاڵ گیان و هێزە شاراوەكان بەمە ترسێكی دی خستە سەر مەترسیەكانی دیكەی لە سروشت...) [14]. تێناگەین، (مرۆڤی سەرەتایی دوایدا)، گوزارشت لە چ دەكات؟ پاشان هاتووە: (...لەبەر ئەوەی مرۆڤی سەرەتایی لە نێو جەنگەڵەكاندا خەریكی ڕاوشكار بوو، ترسی ئاژەڵە دڕەندەكان ناچاری كرد دەست بداتە ئاژەڵ و ڕووەك

پەرستی، لەمەوە ئایینی تەوتەمێتی (Toteism) سەری هەڵدا، تەوتەمی كردە هێمایەكی خێلەكەی و بۆ بڕوا پیرۆزەكەی و بەمەش هێزە لە ڕادەبەدەرەكانی پێ بەرجەستە دەكرد: كە بیرۆكەی (خواوەند) یان (هێزە مەزنەكە) ی دەنواند هەروەكو لەوبەریش زانیمان لەم تەومێتیەوە چەمكی جۆراوجۆری حەرامكردن و قەدەغەكردن و ناپەسەندێتی و پیرۆزی هاتنە ئاراوە كە بە (تاپۆ) ناومان بردن و ئەمەش ڕووكەشی كۆمەڵایەتییانەی هەموو ئاینێكە) [١٥]. سەیرە، كوا، لە كوێ باسمان لێوە كردووە، هەتاوەك و بیزانین ! پاشان نەك (لەوبەر)، بەڵكو لەم بەریش، باسمان نەكردووە ! دواتر ئەم ووشە قوورسانە، واتەی چی دەگەیەنێت؟ وەك و: (تەوتەمێتی) و، (تاپۆ)؟ كە هیچ شیكردنەوەیەكی بۆ نەكراوە.لە هەمووشیان سەیرتر، ئەوەیە، (تەوتەمێتی) و، (تەوتەمی) و، دواتریش بە (تەومێتی)، ناوی هاتووە !!! پاشان هاتووە: (...ئەوەیان خوای پیتۆفەر بوو...هتد).نێوی خوداوەندی (پیتۆفەر) هاتووە، بەڵام كەس، هیچی لە بارەوە نازانێت.دواتریش هاتووە: (سەرچاوەی ترس و لەرزی مرۆڤی سەرەتایی هەر ئاژەڵ و نەهامەتییە سروشتییەكان نەبوو، بەڵكو ئەوەش بوو كە هەمیشە لە تەكیدا بوو، خەونەكانیشی بوو بە تایبەتی ئەو خەونانەی بە مردووەكانیەوە دەیبینن لەمەشیانەوە (مردووپەرستی) سەری هەڵدا لە میسر و ڕۆما مەكسیك و پیرۆدا پاشا وەك خوا دەپەرسترا هەتا لە دوای مردنیش) [١٦]. پێم خۆشە، خوێنەر خۆی، ئەم ڕستەیە، بە باشی بخوێنێتەوە.دواتر لە بابەتی (ئاین هی خودایە لەڕێی سرووشەوە (وەحیەوە) هاتۆتە خوارەوە) دا، هاتووە: (...و ئاین كە ڕاگەیاندن و سروشتی خواهانە و دەنێرێت...) [١٧]. پاشان هاتووە: (...و ئەوانەی چاكن بۆ بەهشت و بەدكارەكانیش بۆ ئازاری نێو دۆزەخ وەك (ئایینی ئیسلام و كریستیان (مەسیحی) و جولەكە).باشە، دەپرسین: چی وەك و ئەمانە؟

باوەڕهێنانیان، یاخود لێپرسینەوەیان؟ پاشان لە بابەتی (زانست لە كۆندا)، هاتووە: (...ئەم ڕاستیە شارستانێتی و ژیاری دۆڵی دوو ڕووبارەكە (میترۆپۆتامیا) و میسری كۆن دەیسەلمێنی...) [۱۸]. ئەی هاوار، ووشەی (میترۆپۆتامیا)، كەی واتەی دوو ڕووبارەكە دەدات؟! بەڵكو ئەوە (میسۆپۆتامیا)، یان (میزۆپۆتامیا) یە.پاشان، باس لە شارستانییەتی عێراقی كۆن و، میسری كۆن دەكات، كەچی وانیشان دراوە، كە خوێنەر، واتە من دەیسەلمێنم، چونكە نووسراوە (دەیسەلمێنی) ! پاشان هاتووە: (...هەر خۆش خاوەنی دۆزینەوەكانی هێزە سروشتییەكانە وەك ئاگر و باو و ئاو...).ئێمە دەپرسین: (هەر خۆش)، یانی چی؟ پاشان لە هەمان بابەت دا، هاتووە: (...ئەو زایارییاریيە كەڵەكەبووانە...).هەروەها لە بابەتی (زانستی یۆنانی) دا، هاتووە: (...ودەیسەلمێنی ئەوەی یۆنان لە مەیدانەكانی زانستدا لە كەڵەكەبوونی ئەو زانستانەوە هاتوونە دی كە بەر لەو هەبوون...) [۱۹]. لێرەش دا، دیسانەوە، خوێنەر دەیسەلمێنێ، واتە ئێمە سەلمێنەرین، نەك كەس و، لایەن و، بابەتی تر ! پاشان دەووترێت: (بەر لەو هەبوون)، (ئەو)، كێ یە؟! وە هەر لە هەمان باس دا، هاتووە: (...و فەیلەسوفەكانی یۆنان وەك تالیس و ئیفلاتون هیرودوت و گەواهین و...).باشە، لێرەدا، (ئیفلاتوون)، لكێنراوە بە (هیرودوت) ە وە، پاشان (گەواهین)، وەك و نێوی فەیلەسووف هاتووە، وە دراوەتە پاڵ ئەوان.پاشان هاتووە: (...لەمەش گرنگتر ئەوەیە، كە مێژوونوسەكانی زانست، وەك (سارتون) و چەندانی دیكە بەشێكیان لە زانستی میسریەكان و عێراقی كۆن زۆر، یان كەم وەرگرتووە...).ئێمە، لێرەدا نازانین، بەشێك لەمێژوونووسان، یاخود لە زانستەكانیان وەرگرتووە؟! وە لە شوێنێكی تردا، هاتووە: (...دەستووری حسابكردنی ڕووبەری سێكۆشە و لاكێشە و بازنەنیان زانیوە) [۲۰]. باشە

(بارنەنیان)، چی دەگەیەنێت؟! وە لە بابەتی (زانستی یۆنانی کۆن) دا، وە لە خاڵی دووەم دا، هاتووە: (ئەم بەتەنگەوە هاتنەیان بۆ زانینی گشتێتی و یاساپەتییەکانی شتەکان مۆرکی (بیردۆزی) یانەی بە زانستەکەیان بەخشی ئەمەش ئەو تایبەتمەندەیە گەورەیەیە کە مێژووی بیرنووسانی خۆرئاوایی بە سنووری جیاکەرەوەی نێوان بیری یۆنانی و گشت بیرکردنەوەیەکی بەر لەوانی دادەنێت) [٢١]. با خوێنەر خۆی، بڕیاری لەبارەوە بدات.وە هەروەها لە بابەتی (زانست لە سەژەکانی ناوەڕاستی خۆرئاوا) دا، هاتووە: (...ئەوجا ملکەچی کلێسا و ئەرستۆش بوو پێکەوە، هەموو دەرچوون و لادانێك لێیان دەرچوون و لادان بوو لە پیرۆزی ئایینییەکەی...) [٢٢]. باشە، کلێسا و، (ئەرستۆ)، مانای چی یە؟! ئەگەر مەبەستیش، ئەرستۆی فەیلەسووفە، خۆ دەبێ ئاماژەی پێبکات، یاخود ساڵی لە دایك بوونی، یاخود مردنی بنووسێت، چونکی ڕوون نییە.وە لە بابەتی (زانست لە سەردەمی نوێدا)، وە لە خاڵی چوارەم دا، هاتووە: (...ئەرکی زاناکان توێژینەوەی دیاردە دەست نیشکراوەکانە و، لە ڕاستیەکی بچوکەوە، چوون بۆ یەکێکی دی...) [٢٣]. ئێمە تێناگەین، (دەست نیشکراوەکان)، یانی چی؟ وە هەروەها لە بابەتی (کەڵەکەبوونێتی) دا هاتووە: (زانست یەکبینە تەلاری خۆی بەرز دەکاتەوە، بەرەو ئەفسانە ناگەڕێتەوە، ئەمەشیان واتای سێیەمی ڕەهایی ڕاستیەکی زانستیانەیە.دەستی پێکرد، ئێستا وا کەیشتۆتەوە توێژینەوەی مرۆڤ بە بەرنامە و نەخشەوە، ئەمەیش بوارەکانی کۆمەڵناسی و دەروونناسی دەگرێتەوە) [٢٤]. باشە (کەیشتۆتەوە) یانی چی؟ پاشان لە ڕووی ڕێزمان و، زمانەوانییەوە، کێ لەم کۆپلەیە تێدەگات؟ دواتر، لە بابەتی (سەراپاگیرێتی و بابەتخوازی) دا، هاتووە: (...بەم جۆرە (ناکەسێتی) دەبێتە شەقڵی ڕاستی زانستییانە، بە واتایەکی دی: بێگومانێتی – (یەقین) لە زانستدا

پابەندی شەقڵی (سەراپاگیری) یە، كە لە (بێگومانێتی) خودی جیاوازە و، ئەمەیان هەست پێكردنی ناخی ئەو كەسەیە كە لە خۆیەوە لە شتێك (بێگومان)ە، كە دوایی مۆركی كەسێتی وەردەگرێت و لە یەكێكەوە بۆ یەكێكی دی جیاوازە، چونكە (خودی) یە نەك (بابەتی))[٢٥]. پێمان خۆشە، خوێنەری هێژا، چەند جارێك بیخوێنێتەوە، بزانە، چ سحرێكی لێكراوە، بۆ تێگەیشتن !!!

پاشان، لە بابەتی (فەلسەفە پرسە، یاخود پرسێكی گەورەترە) دا، هاتووە: (...بتوانێت پرسكە بە بار و شێوەیەكی گونجاوتر دابڕێژێتەوە.جا لەبەر ئەوە فەلسەفە بڕوای بە بڕیار و هۆشمەندان هەیە كە مافی دەربڕینی رایان هەبێت.گرینگترین تایبەمەندی فەلسەفەكاری و پرسەی فەلسەفییانە ئەوەیە لە سنووری چاودێریكردن...).لەم چەند دێڕەدا، چەندین هەڵەی تێدا بەدی دەكرێت، وەك و: (پرسكە) و، (تایبەمەندی) و، (پرسەی).ئەگەر هەڵەش نییە، ئەی واتاكانی چین؟ ڕەنگبێ ڕاستیش بێت، ئەم بارودۆخە، هەر لە پرسە و، مەرگی فەلسەفە دەچێت ! دواتر هاتووە: (...ئا بەم جۆرە فەلسەفە لەمەڕ دیاردە مادییەكان دەگاتە چەمكی (سروشت) و، سەبارەت بە بوونەوەرە ژیرەكانیش دەگاتە چەمكە (مرۆڤانەیی) و پێزانین و ویستەكان، هەروەها دەگاتە چەمكەكانی پێكەوە بەستنی هۆكارێتی و پێڕەو و ئامانج و گەشەسەندن سەبارەت گشت دیاردە و بوونەوەران)[٢٦]. ئەبێ (چەمكە مرۆڤانەیی)، چی بێت؟ ئەی تێگەیشتن لێی، بۆ چی هێندە سەختە؟ پاشان، لە بابەتی (فەلسەفە ڕەخنە و شیكردنەوەیە) دا، هاتووە: (...ژیری و زانیارییە ژیریكایەكان (عقلیە)...)[٢٧]. ئەی (ژیریكایەكان)، یانی چی؟ دواتر، هەر لە هەمان بابەت دا، هاتووە: (هەروەها ئەركی ڕەخنەیی شیكارانەی فەلسەفی، واتای (تۆژینەوەی بەرنامەكان) دەبەخشێت كە زانستە جۆراوجۆرەكان دروستیان دەكەن، وەك

بیركاری و سروشتكاری، لە پێناوی دۆزینەوەی ئەو بنەمایانەدا كە لەسەری ڕاگیربوون بە پێی بەرنامەیەكی سەربەخۆ و یەك گرتوو)[٢٨]. وە هەروەها لە بابەتی (فەلسەفە، پێكهێنان و دروستكردنی باوەڕەكانە و، ڕامانە) دا هاتووە: (...فەیلەسوف بە دوای گشتیانەترین...).وە هەروەها هاتووە: (...واتا گەیشتن و دۆزینەوەی تێڕوانینێكی كۆی گشتانەیە...)[٢٩]. باشە دەپرسین: باشتر نەبوو، كە بنووسرێت: (فەلسەفە، پێكهێنان و، دروستكردنی باوەڕ و، ڕامانەكانە)؟ ئەی (گشتیانەترین) و، (كۆی گشتانەیە)، واتای چ دەبەخشێت؟! ئایە چ جۆرە یاسا و ڕێسایەكی ڕێزمانی و، زمانەوانی تێیدا بەكار هاتووە؟ ڕەنگە ئەمە فۆرمێكی تری نوێ بێت، لە ڕێزمانی زمانی كوردی و، ئێمە لێی بێ ئاگا بین !!!

## بەشی سێیەم:- (بابەتە گشتییەكانی فەلسەفە)

هەر لە باسی (بابەتە گشتییەكانی فەلسەفە) دا و، لە خاڵی یەكەم دا، هاتووە: (...سروشتناسی لە تایبەتەكانی تەن دەكۆڵێتەوە بێ تەماشاكردنی توخمەكانی)[٣٠]. باشە (تایبەتەكانی تەن)، یانی چی؟! وە هەروەها لە بابەتی (میتافیزیك) (چیەتی پاش سروشت) دا، هاتووە: (أ- مەبەستی میتافیزیك: جیهان و گەردوونی دەوروبەرمان تەنانەت مرۆڤ و زیندەوەرانیش، ئەم هەموو شتانە هەمەچەشنی و هەمەجۆری بێ سنوور دەنوێنن)[٣١]. جارێ پێش هەموو شتێك، ئەگەر میتافیزیك، وەك و خۆی بهێڵرێتەوە، باشترە، لەوەی بكرێت بە (چییەتی پاش سرووشت)، یاخود هەر بكرێت، بە (ئەودیوی سروشت)، چاكترە.پاشان ئێمە تێناگەین، مەبەستی میتافیزیك، ئەمەیە؟! پاشان لە باسی بابەتی (چاوگێڕانێك بە نێو پەیوەندی نێوان خۆیەتی و بابەتی بوون (الزاتیە والموچوعیە) دا، هاتووە: (...شتە خۆدەرەكیانەوە...)، یان هاتووە: (بینۆیەكی

دیکە بۆ ئەم لێکۆڵینەوەی ئەوەیە کە هەر زانستێك پەسەند و سەرەتا بەکار دەهێنرێت...).وە لە لاپەڕەی دواتر دا، هاتووە: (...یاسایەکی (هۆیەکیەتی) و (بێ پێچەوانەیی)...) [٣٢]. باشە، (خۆدەرەکیانەوە) و، (بینۆیەك) و، (هۆیەکیەتی) و، (بێ پێچەوانەیی)، چ دەبەخشێت؟ وە هەروەها لە باسی بابەتی (بیردۆزی زانیاری (ئیپیستیمۆلۆجی) دا، هاتووە: (...جیاکردنەو خۆیەکی و بابەتەکی لە زانیاریدا.سەرچاوەکانی زانیاری چین و چۆن پێزانین بەشتی پێزانراوەوە پێوەندیی دەبەستێت، بۆ نموونە چۆن دەزانم ئەمە ئەسکەمبیلە و یەو پشیلە نی یە.).هەڵەکانیشی ئەمانەن: (جیاکردنە)، (ئەسکەمبیلە)، (یەوپشیلە)، یانی چی؟ دواتر هاتووە: (...ئەم خووە مسۆگەر هەیە، ئایا کەسێك دەیبینی یان نەی دەبینی).ئەی (ئەم خووە مسۆگەر هەیە)، مەبەست لێی چییە؟ پاشان هاتووە: (...کەوا دەیبنێت (شتان لە خۆیاندا) و (پێزانینی شتان)).لێرەدا، لە بری (شتان)، (شتەکان)، بەکار بهێنرێت، گونجاوترە.یان هاتووە: (...وەك داکەوتیەکان دەیڵێن،...).(داکەوتییەکان)، کێن و، واتای چ دەبەخشێت؟ پاشان نووسراوە: (بنچیەکەیەتی).ئێمە نازانین، ئەم ووشەیە، کوردییە، یان نا؟ ئەمەش لەم ڕستەیەوە، هاتووە: (...(هەستییەکان): وتوویانە تاقیکردنەوە سەرچاوەی زانیارییە یان بە لای کەمی بنچیەکەیەتی...).پاشان لە لاپەڕەی دوایی دا، هاتووە: (...لێرەدا سێ ڕێباوەڕمان هەیە: ڕێباوەڕی هەیە کە توانای زانینی شتانمان هەیە.بەرامبەر بەم ڕێباوەڕی دووەم و سێیەم هەن هەرچی دووەمە ڕێباوەڕی گومانە و خاوەنی دان بە شیانی زانیاری و توانای مرۆڤ بەسەریا نانێن و...)[٣٣]. باشە، ئەم هەموو هەڵانە، لە پای چی دەکرێت؟! پاشان لە باسی (هەستزانی) دا، هاتووە: (...دەبێ هەر بگەڕێنەوە سەر بنەڕەت و سەرەتایان لەمیان تاقیکاری هەستەکی)[٣٤]. جگە لە هەڵە، ئەمە وا پێدەچێت،

شتی تر بێت بە دوایدا، کەچی بە خاڵ، کۆتایی پێهێنراوە ! پاشان لە بابەتی (هۆشزانی) — (ژیرایەتی) دا، هاتووە: (هەندێ لە فەیلەسوفان دەڵێن ژیری هاوبەشی نێوان خەلکییە و بە زور کاری هەمەچەشن هەڵدەستێ و بەبێ ئەو زانیاری بەردەست نابێ).پاشان هاتووە: (...ئەنجامیش لە پێشەکییەکانی هەندێ لە بابەت و زانیارییەکان دەردەهێنێت دەکات...).دواتر هاتووە: (...بۆ نموونە کۆمەڵزان کۆمەڵێ جیاجیا لە ڕێگەی تاقیکاری تێبینی و ژیان بە نێویاندا دەست دەکات بە لێکۆڵینەوەکانی...).ئێمە شتێکی ئەوتۆ، لەم دێڕانە، تێناگەین، ئیدی نازانین، خوێنەر چۆن لێی دەڕوانێت؟! پاشان هاتووە: (فەیلەسوفان هەن دەڵێن...).پاشان لە بابەتی (سووسەزانی (الحدس)) دا، هاتووە: (...هۆکارزانیش پشت بە بلأوەی...).دواتر نووسراوە: (...ڕڕستەوخۆ وەیان بە هی کاتەکی ڕاستەقینە دەبەستێ لە هەستکردنی بە جوانی دەچێ...)[٣٥]. هەروەها لە بابەتی (ڕادە و سنووری زانین) دا، هاتووە: (...زۆر ئاسانترە نەگەر هاتو...).(نەگەر) چییە بو خاتری خوا؟ پاشان لە بابەتی سێیەم (بابەتی بەهاکان یان فەلسەفەی بەهاکان (ئەکسیۆلۆژی) دا هاتووە: (...بەرامبەر بە بەهای دەرەکی دوور دەخرێتە).پاشان لە (فەلسەفەی ڕەوشت) دا، هاتووە: (...لە کۆتاییدا بەشێوەیەکی بیروباوەڕی ڕەوشتەکی چەسپاو دارشتراوە...)[٣٦]. وە هەروەها لە بابەتی (فەلسەفەی یاسا) ش، کۆمەڵێك هەڵەی تێدایە، وەك و هاتووە: (کەچی دادوەری یاساییان لە فەلسەفەی یاسادا کۆمەڵێك یاسان کە دەوڵەت بەسەر نیشتەنییانیدا دەیسەپێنێت).ئەمە چ خوێندکارێك، لێ ی دەگات؟! پاشان هاتووە: (دەکرێت کێشەکانی فسەلەفەییاسا بەم شێوەیە کورت بکرێتەوە:).پاشان هاتووە: (ویستە) و (خاوەنی)، ئەمانە یانی چی؟ پاشان لە لاپەڕەی دوایی دا و، لە بیردۆزی دووەم دا، هاتووە:

(...ڕێساكانی ڕەفتار پەرەسەندنەكێن و ژێری یان پوخت سەرچاوەیی نین...)[37]. وە هەروەها لە بابەتی (جوانی و بەهاكانی جوانی) یش دا، بەهەمان شێوە، چەندین هەڵەی تێدا بەدی دەكرێت، بۆ نموونە هاتووە: (لە خاڵی ب- (مادیە) و لە خاڵی پ- (دەربڕینە)) ! ئەمانە، مانای چی دەبەخشێت؟! هەر لە خاڵی (پ) دا، هاتووە: (...نمونە ئەوا شێوەیەكی یەكەی لە كێشەكەیدا خۆی دەنوێنێ كەچی لایەنی مادد وتەكانی بەر گوێچكە و خوێنراوە دەگەیەنێ...)[38]. پاشان هاتووە: (جوانی ناسی تاقیكردنەوەی جوانی بەهرەی هونەرمەندان دەگرێتەوە و ئەم شاكارانەش تەنها هەر وێژە و هونەر بگرێتەوە...)[39]. پاشان هەر لە هەمان بابەت دا، هاتووە: (...بەلكو ئەو هێزانەی دەباتەوە كە پێی دەزانن بە لایەوە جوانی واتایەكی ژیریە و خووی بۆ شتەكی نییە كە لە شتی جواندا ببێت و سەربەخۆ لە هەموو پێزانینێكەوە.یەكەم خوێندنگە جوانی بە ڕەها دادەنێت)[40]. پاشان لە خاڵی یەكەم دا و، لە بابەتی (پێوەرەكانی جوانی) دا، هاتووە: (...بێجگە لە جیاوازی نێوان كەسەكان لە ڕووی سروشت و پەروەردە و نەریتەوە).پاشان لە خاڵی دووەم دا، هاتووە: (: بۆ چ ژێژ وەرگرتن لە جوانی دەبەینەوە...).(ژێژ) ئەبێ چ بێت؟ پاشان هاتووە: (خوێندنگەی ژیری و یاساكان بە پێویستی دادەنێت.هەرچی خوێندنگە برێسا ژیریەكان و یاساكان بە پێویستی بۆ چ توانایەكمان دەگەڕێتەوە)[41]. پاشان هاتووە: (...ڕێسایان بۆ (دروستكردنی هونەری بلیمەتانە) نانێت...)[42]. وە هەروەها لە بابەتی (هونەر و ڕەوشتناسی) دا، هاتووە: (...هیچی دیكە لە دواوە نییە گرنگ جوانی شێوەی هونەرەكەیە، یان (شێوەكە) یە، هەرچی بابەتە هەر شتێك بێت قەیناكە، با خراپە یان تاوان یاخود چاكە بێت !).پاشان هاتووە: (...ئایا پوخت و چاولێكەر و لاسایكەروە كەرەوە و...)[43]. وە هەروەها لە بابەتی (ڕێباوەڕی سروشت) دا،

هـــاتووە: (ڕێبـــاوەڕی سروشـــتی بـــاوەڕی بـــە بابەتەكیـــەتی جـــوانیی سروشـتـە...).(بابەتەكیـەتی) چییە؟ وە لـە بابـەتی (ڕێبـاوەڕی (ڕۆمانـسی) دا، هاتووە: (...بە لایـەوە هونەرمەنـد پێویـستە بەسەربەسـتیكردن تـەواو دەربـڕین هەبێت...).وە لـە بابـەتی (لۆژیـك (المنگق) دا، هـاتووە: (...هـەر چـییەك بێـت بابـەتی بیرەكـە)[٤٤]. وە پاشـان هـاتووە: (...واتـا لێكۆڵینەوەیـە كـە دەربـارەی بیركردنــەوەی دروســت دەبێــت چــۆن بێــت...)[٤٥]. وە هــەروەها لــە بابــەتی (پەسندكردن یـان سـەپاندنی بـوونی بـیرە) دا، هـاتووە: (...بیرسـا بووەتـە بـە ئەوەی كە واتای ئەم سیّ بەشانە ببەخشێت:)[٤٦]. باشە ئێمە دەپرسین: (بیرە)، یان (بیرەكە)، یانی چی؟ دواتر (بیرسا)، لە ئەم كاتە دا تازەیە، چونكی پێشتر، شـینەكراوەتەوە.وە لـە بابـەتی (بەڵگەهێنانـەوە) دا، وە لـە خـاڵی سـێیەم دا، هــاتووە: (لۆژیــك جــۆرێكی زانیارییــە پێوانەییــەیان بــە هایــە...)[٤٧]. وە لــە (پرســیارەكانی بەشــی ســێیەم) دا هــاتووە: (پ٨– ئــەو بیردۆزانــە چــین كــە لێكۆڵینەوەی شاكاری هەنەرییـە)[٤٨]. باشـە، ئێمـە دەپرسـین: (هەنـەری)، یـانی چی؟

## بەشی چوارەم:- ( ختسنەڕووی مێژووی فەلسەفە لە شارستانیە كۆنەكاندا ):

هەر لە (پێشەكی) دا و، لـە بابـەتی (گرنگـی مێـژووی فەلـسەفە) دا، چـەندین ڕسـتـەی ناتــەواو نووســراوە·وەك و هــاتووە: (یــەك لــە بیركارەكــان دەڵێــت : (بیركردنــەوەی بــیردۆزی تایبــەتی سروشــتیە···)، وە هــەروەها هــاتووە: (···و هۆیەكانی هەڵە بیردۆزیەكانی بیركارانی ڕابـردوو···)، دواتـر هـاتووە: (···هیـوا و بــاوەڕ بــەهێزی ژێــری مرۆڤایــەتی و تواناكــەی لــە دەروونــی مرۆڤــدا پەیــدا دەكات···)·پاشان هاتووە: (···بۆ وەدیهێنانی تایبەتـە سـەركییەكەی خـۆی كـە

بـیر و خۆشویـستنی زانیاریەییـەك لـە مێژوونووسـانی فەلـسەفەكاری مێـژووی فەلسەفە نووسراوە پیرۆزەكان دەچوێنێت گوێ نەدان بە ڕابـردووی بیركردنـەوە لە زانستدا دەكرێت...)[49]. جگە لە هەڵەكان، ئایا كـێ لـەم ڕسـتانە دەگـات؟ وە هـەروەها لـە بابـەتی (قۆناغـەكانی یـان دابەشـكردنە سـەرەكیەكانی مێـژووی فەلسەفە) دا، وە لە خاڵی (٤) چوارەم دا، هاتووە: (...بوژانەوەی ئـەورەپا...). وە دواتر لە خاڵی یەكەم دا، هاتووە: (...لە زۆر كۆنەوە شارستـانیەتی ڕەسـەنی بەخۆیەوە دیوە...)[50]. وێڕای هـەموو ئەمانـەش، كەچـی دواجـار، خـاڵی دووەم، دیار نامێنێت و، بزر دەبێت !!! وە هەروەها لە بابەتی (ڕێبازەكانی كانی بـیری و فەلسەفیەكان لە دۆڵی دووڕووبار) دا، ئەم ووشانەی تێدا هاتووە: (سواڵەت) و، (ئەكـەدییكان)، كـە نازانرێـت یـانی چـی؟ پاشـان هـاتووە: (...ئـەو شـوێنەوارە كۆنانەی كە لە ناوچەرگەی زەویدا دۆزراونەتەوە، هەموویان ئەو بیرە فەلسەفیانە دەخەینـە ڕوو...).ئـەی هـاوار، (هـەموویان ئـەو بـیرە فەلـسەفییانە دەخەینـە ڕوو...)، چ واتایەك دەبەخشێت، ئەبێ مامۆسـتایەكی زمانـەوانی، چـۆن بڕوانێتـە ئەم ڕستەیە؟! پاشان هاتووە: (ئێمـە دەتـوانین ئـەم بیروڕایانـە بكـەین بـە سـێ شەوە) [51]. ئەی ناتوانین، بیكەین بە (هەزار و یەك شەوە)؟!!! وە هەروەها لە بابەتی (بیرە فەلسەفەی گـەردوونی سروشـتیی) دا، كـە چـەند هەڵەیـەكمان تێـدا دۆزیوەتەوە، وەك و هاتووە: (...لە شێوەكانی هۆشیاری كۆمەڵایەتی مرۆڤایەتی هێشتا دەرنەكەوتبوو...).بریـا بمزانیبایـە، لـەم وەرگێڕانـەدا، ڕەچـاوی چ شـێوە زارێك كراوە، یاخود پشتی بە چی یاسایەكی زمانەوانی و، ڕێزمانی بەسـتووە، وە چ جـۆرە وەرگێڕانێكـی تێـدا بـەكار هێنـراوە؟ پاشـان هـاتووە: (...و بـە ئـاوات كـوێرەوەری و بینینـەكانی مرۆڤـەوە هەیـە) [52]. ئـەبێ (ئـاوات كـوێرەوەری)، مەبەسـت لێـی چ بێـت؟! دواتـر هـاتووە: (...كـە چـۆن گلگـامێش بـە مردنـی (ئەنكیدو) ی هاوڕێی، پەرێشان بـووە و حەپەسـاوە و بـە دوای ئـەوەدا گـەڕاوە،

چـۆن زینـدوی بكاتـەوە، مەرهـەمێ دابهێنـی، یـان بدۆزیتـەوە···)[٥٣]. باشـە گلگامێش، دەبێ مەرهەمێ بۆی دابهێنێ، وە یان بیدۆزێتەوە، كەچی ئـەم كـارە، دەدرێتە پاڵ خودی خوێنەرەكە !!! وە هەروەها لە بابەتی (ئەم بیر و هزرانـە، تێكۆشـاون وەڵامـی ئـەم پرسیارانە بدەنـەوە): بنـچینەی بـوون چـییە و هـۆی پەیـدابوونی چـییە، چـۆن بونـەوەرەكان دۆزراوەنەتـەوە؟ دا، دیسانەوە، چـەند هەڵەیـەكی تێـدا بـەدی دەكرێـت، وەك و هـاتووە: (··هەرچـی بوونـەوەرە هەیـە···)[٥٤]. ئەبووایـە بنووسـرێت: (هەرچـی بوونـەوەر هەیـە)·وە هـەروەها ئەمانـەش، بـە هەڵـە نووسـراوون: (سـورەتی الانبیـا) و، (لـە دەقـە كۆنـەدا) و، (ناخەكانی دەریـا)·پاشـان هـاتووە: (···(نیـوەی خـوارووی گـۆی زەوی، بـوونی تەواوە) و دەگەڕێتەوە بۆ هۆیەكانی بوونی لە ئاسماندا (نیوەی سەرووی گۆ)···) و، (···شـێوەكانی ئەنـدازەی···)·پاشـان هـاتووە: (···و چـۆن یـەكن و لـە یەكدییـەوە ماوەیـەكی وەك یـەك دوورن (تیرەكـان و نیـوە تیرەكـان) ی ئەندازەیین)[٥٥]. وە هەروەها لە بابەتی (بیروهزرە ڕەوشتیی و كۆمەڵایەتییـەكان) دا، چەندین هەڵەی تری تێدایە، وەك و لە خـاڵی دووەم دا، هـاتووە: (دەگـوترێ، مرۆڤ چاكە لـە سروشـتیدا هەیـە چـونكە لـە قـوڕێكی جـوان دروسـتكراوە، بـەڵام خراپـەكاری ژینگـە كۆمەڵایەتیەكەیـدا···)·دواتـر هـاتووە: (···ئەزمونەكاتیان···)·وە پاشـان (···پلـەی شارسـتان···)[٥٦]. باشـە ئەمانـە چ دەگەیەنن، بۆ چ ئەو هەموو هەڵەیە بكرێت و، كەسێكیش، نـە هەسـتی پێبكـات، وە نە بە دوای چارەسـەریش دا بگـەڕێت؟! وە هەنـدێ ووشـەی تـریش هـاتووە، وەك و: (···یاسـاش دانـراو···) و، (تاكـە تاكـەكانی كۆمـەڵ) و، (ئـازادی = یاكسانی) و دەدوێ) و، (دارڕژاوی)[٥٧]. پاشان هاتووە: (– ئەوە دانـا و هۆشمەنـد بـە هـەموو شـتێ···) و، (نمایـشەكانی و كوێرەوەرییـەكانی مـرۆڤ ···) و، (دادپەوەری)[٥٨]. وە هەروەها نووسراوە: (···حامورابی ت ١٧٥٠پ·ن)، باشە ئەو

(ت) ە، واتای چییە، ساڵی لە دایك بوونییەتی، یاخود كۆچی دواییەتی؟ پاشان لە بابەتی (ئارەزووە فەلسەفی و زانستییەكان لە دۆڵی نیلدا) دا، هاتووە: (··چوارەم هەزارەی پ·ز···)، راستییەكەی، دەبێت بنووسرێت: (هەزارەی چوارەمی پێش زایین)·پاشان هاتووە: (···بەڵكو ڕەفتار و ڕەوشت پاكی ژیانیشەوە بەندن بە (نەمر) و (جیا) لە لەشی دانا بوو·درووستكردنی قوچكەكان و خۆشی كردنی تەرمی مردوان···)·باشە، (خۆشی كردنی)، بۆ یاری و، شادی بەكار دێ·پاشان هاتووە: (···لە شیش بەرامبەر بە دەروونی مرۆڤ)[٥٩]· ئەمە وا نووسراوە، كە لە شیش و، ئاگر و، كەباب ئەچێت ! كاتی خۆی، یەكێك لە قوتابییەكانم، ووتی: مامۆستا ئەمە شیشی كەباب نییە؟! لە هەمان بابەت دا، كارەساتێكی تر، بە دیار دەكەوێت، ئەویش ئەوەیە، كەوا لە خودی نووسینەوەی ئایەتی قورئانی و، تەنانەت لە ژمارەی سورەتەكەش دا، هەڵە كراوە·چونكی بەم شێوەیە نووسراوە: (انما قلنا لشيء اذا اردناة ان نقول له كن فيكون) (النحل — ٤)·ڕاستییەكەشی، بەم شێوەیەیە: (إِنَّمَا قَوۡلُنَا لِشَيۡءٍ إِذَآ أَرَدۡنَٰهُ أَن نَّقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ — (النحل) — (٤٠))·پاشان هاتووە: (···دەربارە ئافەریدە···)[٦٠]· وە هەروەها لە هەمان بابەت دا، چەند هەڵە و، كەم و كورتییەكی تر بەدی دەكرێت، وەك و هاتووە: (···و جەماوەر خۆی پێوە دەبەستی و ڕێزی لێ دەگرێ و دەی پارێزی)·نازانم جەماوەر قسان دەكات و، منیش دەیبەستم و، دەیپارێزم ! پاشان هاتووە: (ژیانی ووەم)·پاشان هاتووە: (··هەتا شا (ئەختاتوون = ئەمنوفسی چوارەم)···)·پاشان جارێكی تر، هاتووە: (···(ئەختاتون) لەتەك مەرامەكانی ئیبراهیم خەلیل — ی (س) لە یەكبووندا كە لە تاكە خوایەكی گەورە و مەزن زیاتر لە زەوی بابلدا نیە···)[٦١]· ئێمە نامانەوێ، زۆر لەو بارەیەوە بدوێین و، دواجار ئێرە جێگەی، فرە ووتنی نییە، بەلآم دەبێت بزانین، ناوە ڕاستەقینەكەی، (ئەختاتون) نییە، بەڵكو ناوی (ئەخناتون) ە، پاشان

(ئەمنوفسی چوارەم) یش نییە، بەڵكو بەم شێوەیەیە: (ئەمنحۆتبی چوارەم)ە [٦٢]. پاشان لە سەرووی هەموو ئەمانەشەوە، ئێمە هەرگیز، لەم بەراودكارییەدا تێناگەین؟! پاشان لە بابەتی (فەلسەفەی یۆنانی) و، لە خاڵی (٢) دووەم دا، نووسراوە: (...دوورگەی مەلاَتایە...)، وە هەر لە هەمان لاپەڕەدا، وێنەیەك دانراوە، وە لە خوارەوەی وێنەكە دا، نووسراوە: (فەلسەفەی یۆنانی كۆن)[٦٣]. ئەمە لە كاتێك دایە، نە خاوەنی وێنەكە و، نە شوێن و، نە مەبەستەكەشی، ڕوون نەكراوەتەوە ! ئەم وێنەیە، هەروەك و لە زۆر سەرچاوە و، شوێن و جێگادا، بەرچاو دەكەوێت، وە لە هەندێ سەرچاوە، ئاوەهای لە بارەوە نووسراوە : (قوتابخانەی ئەسینا، بەرهەمی رافائێل، دەرخەری گۆڕانی هونەرییە، بەرەو بابەتە نامەزهەبییەكان، لە سەردەمی ڕێنسانسدا)[٦٤]. وە لە سەرچاوەی تریش دا، لە خوارەوەی ئەم وێنەیەدا، نووسراوە: (یەكێك لە گەورەترین بەرهەمەكانی رافاییل، فێرگەی ئاتێنایە، كە حەزی وی لە فەرهەنگی كلاسیك پیشان دەدات.ئەم دیوارنووسە، زانایان و، فەیلەسووفەكانی یوونانی كێشاوە) [٦٥]. وە هەر لە بابەتی (فەلسەفەی یۆنانی) دا و، لە خاڵی چوارەم دا، چەندین كەم و كورتی تێدایە، وەك و: (..چونكی هیچ فەلسەفەیێكی ناوەندی نەبووە بسەپێنی بەسەر بیرمەندەكاندا...).دواتر هاتووە: (...بە هەر ڕەنگ و شێوەی بێت...).دواتر بەرامبەر، بە ووشەی (الملاحە)، نووسراوە: (دەریاگەڕان)[٦٦]. وە لە بابەتی (فەیلەسوفەكان لە جیهانی دەرەوە دەكۆڵنەوە) دا، چەندین هەڵە و، كەم و كورتی تێدایە، وەك و: (...و گۆڕانی شتان داناوە)، یان هاتووە: (: چۆن شتان هەمەجۆر و زۆرن...).یان هاتووە: (...و هەمەجۆران و زۆری...)[٦٦]. بە بۆچوونی ئێمە، لێرەدا كۆكردنەوەیان، بە (شتەكان) و، (هەمەجۆرییان)، یان (هەمەجۆرەكان)، گەلێك باشتر دەبوو.كەچی لە لاپەڕەی دوایدا، هەر دووبارە دەبێتەوە.پاشان هاتووە: (...ئەم دوو خوێندنگەیەی سەرەوە، خوێندنگەییەكی

پێ دەووترێت) ! ! ! ئەمە یانی چی؟! پاشان هاتووە: (...لە هەردوو بارەكەشدا شتەكان لە چوار توخم پێكهاتبن یان لە گەردیلە، لە بەشی جیاوازی ئەو نەژادە پێكهاتوون (لەو توخمانە یان لەو گەردیلانە)·پاشان نووسراووە: (خوێندنگەی فیتاگۆرسی)[٦٨]·پاشان هاتووە: (...واتا باوەڕیان بە پێكهاتنە كەرەستەیییەكەی شتەكان)[٦٩]· پاشان هاتووە: (...هەروەك (فیساگۆرسی) وتەنی كە لە خوارووی ئیتالیا پاش مردنی فیساگرۆس پێكهاتبوو)·پاشان هاتووە: (...دژایەتی دیموكراسی ئەتنی كردووە)[٧٠]· جارێك بە (فیتاگۆرس) و، جارێك بە (فیساگۆرس) و، كەڕەتێكیش بە (فیساگرۆس) هاتووە ! ! ! پاشان كێ دەزانێ (ئەتنی)، یانی چی؟! وە هەروەها لە بابەتی (ئەو فەیلەسووفانەی ڕوویان كردە لێكۆڵینەوەی مرۆڤ) دا، هاتووە: (...واتای سۆمتایی لە سەرەتادا...)·باشە، (سۆمتایی) یانی چی؟ پاشان لە باسی (سۆكرات) دا، چەندین هەڵەی زەقی تێدا بەدی دەكرێت، وەك و هاتووە: (سۆكرات كە لە ساڵی (٣٣٩) پ·ز دەركەوت لەگەڵ ئاراستەكانی سۆفسەتاییەكان نەیار بوو...)[٧١]· پێش هەموو شتێك، جارێ ساڵی (٣٣٩) ی پێش زایین دەركەوت، وەك و واتای زمانەوانی، هیچ نابەخشێ، باشە ئەمە چەنێكە، كاك سوكرات، لە كوێ خۆی حەشار داوە؟ وا ئێستا دەركەوتووە ! پاشان، ئەگەر مەبەست لەو ساڵەدا، لەدایك بوونی بێت، ئەوە هەڵەیە، چونكی نێوبراوو، ساڵی (٤٧١) ی پێش زایین، لە دایك بووە، وە لە ساڵی (٣٩٩) ی پێش زایینیش، ژیانی بەجێ هێشتووە [٧٢]· وە دەبێت لە یادیشمان نەچێت، (سۆفسەتاییەكان) نییە ! ! ! كەچی لە لاپەڕەی دواییدا، چەند جارێكی تر، هەر بە (سۆفسەتایی یەكان)، ناو دەبرێت[٧٣]· بەلام ڕاستییەكەی، (السوفسطائیون) ە، وە بە ئینگلیزیش، بەم شێوەیە (Sophists)، وە بە كوردییەكەشی، دەبێت بە (سۆفستاییەكان)[٧٤]· هەر لە بارەی سوكراتەوە، چەند ڕستەیەك، دەخەینە ڕوو، وە پێمان خۆشە، خوێنەر

خۆی، بڕیاری لە بارەوە بدات·كە هاتووە: (···واتا دانانی ناساندنی چەسپاو بۆ شتان···)·پاشان هاتووە: (···بە تاوانی تێكدانی لاوان و باسكردنی خواكانی بڕیاری كوشتنی درا···)·باشە (خواكان) ی كێ؟ ڕوون نەكراوەتەوە ! پاشان هاتووە: (ئەم فەیلەسووفە دوای دانایی كەوتبوو، هەمیشە و بەبەردەوامی لەتەك خۆیدا دەگوتەوە، ئەم داناییەش ئەمەیە ئەی مرۆڤ (خۆت بناسە) هەتا بتوانێت ئەم دەربڕینەی كە لە زەیدانەكانەوە ڕۆژێ لە ڕۆژان بیستبووی بە گوێی دا هەڵ دراو ئەی سۆكرات تۆ لە نێوان هەموو ئەسینییەكان داناتر و بەدادتری)·ئێمە لێرەدا، لە ڕووی هەڵەی زمان و، تایپەوە، لێیان دەبوورین، بەلاّم (زەیدانەكان)، كێن؟ ڕوون نەكراوەتەوە ! پاشان هاتووە: (···هەر چەند سۆفسەتاییەكان بەرەنگاری ڕێی لێگرتن و لە پێناوی ڕاستی و ڕاستیكاریدا، سەر شۆڕی نەنواندووە و سوور بووە لەسەر بیروباوەڕەكەی)[٧٥]· باشە ڕستەكە، وەك و خوێنەر، لێی دەگات، باس لە سۆفستاییەكان دەكات، كە (كۆ) یە، بەلاّم لە پاشان دا، دەبن بە تاك !!! پاشان لە (هەنگاوی دووەم) — هەنگاوی بوژانەوەی فەلسەفی یۆنانی (بوون و ڕەوشت) دا وە لە بابەتی (ئیفلاتون و ئەرستۆ) دا، چەندین هەڵەی تێدایە·وەك و هەر لە سەرەتاوە، هاتووە: (بە لە سێدارەدانی سۆكرات···)[٧٦]· باشە، ئێمە دەپرسین: چما ئەو كاتە، سێدارە و، دووداره و، یەكدارە، هەبووە؟! ئەی ئەگەر هەشبووبێت، كێشەیەكمان نییە، كە سوكرات، لە سێدارە دراوە.باشە، ئێمە پێشتر، ڕامانگەیاندبوو، كە (···بڕیاری كوشتنی درا·بە بڕیاری دادگە لە بەندیخانەدا ژەهری خواردەوە)؟[٧٧]· وێڕای هەموو ئەمانەش، ئێمە، هەتاوەك و هەنووكەش، نەماندیووە و، نەمانبیستووە، كە سوكرات، لە سێدارە درابێت !!! پاشان لە باسی (ئیفلاتون) دا، چەند هەڵەیەكی ترمان بە دیار خستووە، وەك لە پاڵ ناوەكەی دا، ساڵی (٧٤٣) پ·ز، تۆمار كراوە[٧٨]· پێش هەموو شتێك، خوێنەر تێناگات، ئەم ساڵە، ساڵی لە دایك

بوونییەتی، یاخود ئەو ساڵەیە، كە تێیدا، كۆچی دوایی كردووە؟! وە لە هەمووشی كارەسات تر، ئەوەیە، كە لەم باسەدا، هەست بەوە نەكراوە، كەوا مامەڵەكردن و، بەكارهێنانی ساڵی پێش زایین، هەتاوەك و بەرەو پێشەوە برۆین، ساڵەكانی كەم دەبێتەوە، چونكی ئێمە، ساڵانی پێش زایین، تێدەپەڕێنین و، بەجێیدەهێڵین، وە دواجار، ڕوو لە نزیكبوونەوەی، ساڵی زایینی دەكەین، هەر لەبەر ئەمەشە، كەم دەكات.بە هەر حاڵ، (ئیفلاتون) – (افلاطون)، لە ساڵی (٤٢٧) ی پێش زایین، لە دایك بووە، وە لە ساڵی (٣٤٧) ی پێش زایین، كۆچی دوایی كردووە [٧٩]. وە هەر لە باسی ئیفلاتون دا، چەند هەڵەیەكی ترمان، بەرچاو دەكەوێت.كە بە داخەوە، جارێكی تر هاتووە: (...بە لە سێدارەدانی سۆكرات زۆر دڵگیر و پەست بووە) !!! ئەم باسەم، جارێك لەگەڵ یەكێك لە مامۆستاكانی برادەرم دا باس كرد، كە تاڕادەیەكی زۆرباش، شارەزایی هەیە، لە بارەی بابەتی فەلسەفەوە، وە چەندین سەرچاوەی ڕەسەنی، بە زمانی ئینگلیزی و، فارسی خوێندۆتەوە.ئیدی ئەو گووتی: (هەر باشە، نەیان نووسیووە، دراوەتە بەر تەماتە) !!! وە دەبێت لە یادیشمان نەچێت، لە هەندێ شوێن و، ناوچە دا، ووشەی (دڵگیر)، وەك و شادی و، خۆشی و، كامەرانی مرۆڤ ، بەكار دەهێنرێت، هەتاوەك و چەند جارێك، خوێندكارانیش، هەستیان بەم دژبەیەكە كردووە.پاشان هاتووە: (...وەك: كاروان و پیرۆت و شاسوار كەی لەم بابەتە)[٨٠]. جگە لە نادروستی ڕستەكە، باشە (پیرۆت)، واتای چی دەبەخشێ؟ پاشان ڕستەیەكی ئێجگار ئاڵۆزیشە ! پاشان لە لاپەڕەی دوایی دا، هاتووە: (...ناوەرۆكەكانی زەوی لە وێنەی و بەهاكان خاڵی بوون.هەروەكو كارویاری دەروونی لە جەستەدا.ڕوحی (وێنەیەكی نموونەیی) ئاسمانییە خراوەتە جەستەی سروشتی زەوییەوەیەوە، بۆیە دەروون تێدەكۆشێ بۆ جیابوونەوە لە لەش و گەڕانەوە بۆ ئاسمان لە ڕێی مردنەوە، یان گیان گۆزەكییەوە (تناسخ الارواح).پاشان هاتووە:

(...لەبەر ئەوە ئەم فەیلەسوفە هەرچی زانستی بوونە گشتییەكان، گەوهەرەكان و ماهییەتەكان و نموونە بیرییەكان هەیە زانیارییەكی ڕاستن و دەشێت لەم بوارەدا شوێنی پێی مامۆستاكان بكەون، چونكە مامۆستاكانی فەلسەفە پشت بە هەستكردن و گومان و دیاردە گۆڕاوگۆڕەكان نابەستن)·پاشان هاتووە: (...كە لە زیاتر لە یەك نەژادی هاوبەشدا دەگیرسێنەوە...) [٨١]· وە هەروەها لە لاپەڕەی دواتردا، هاتووە: (...ژیرییەكان لە خەڵك ئەوانەن كە ڕۆحیان، واتە مێشكی بگۆیان...)·(ژیرییەكان لە خەڵك) و، (مێشكی بگۆیان)، یانی چی؟! پاشان هاتووە: (ئەمە ئەو بەختیارییەیە، كە كەس هەستی پێ ناكات جگە لەوانەش (فەلسەفەی میتافیزیكی) دەزانن·(كە خۆڵ بە دەوری جیهانی ئەودیو سروشتدا، دەدەن·زانینی ڕاست و ڕەوا ئەو زانیارییەیە، كە بابەتەكانی خوا دنیای نموونەیی و ئاسمان و چاكەكانن)[٨٢]· باشە، (خۆڵ بە دەوری جیهانی ئەودیو سروشتدا دەدەن)، یانی چی؟ ئێمە، تەنها (خۆڵكردنە چاوی خەڵكمان)، بیستووە، باشە، ئەی (خوا دنیای نموونەیی) یە، واتای چی یە؟ وە هەروەها لە باسی (ئەرستۆ) ش دا، بە هەمان شێوە، چەندین هەڵە و، كەم و كورتی هەیە·سەرەتا، لە پاڵ نێوی ئەرستۆ، نووسراوە (ت٣٢٢) پ·ز [٨٣]· پێش هەموو شتێك، ئێمە دەپرسین: ئەم ساڵەی كە نووسراوە، واتای چی دەگەیەنێت؟ دەبێ بزانین، ئەم ساڵە، ئەگەر لە دایك بوونی بێت، یاخود مردنی، هەر هەڵەیە·چونكی ئەرستۆ، لە ساڵی (٣٨٤) ی پێش زایین، لە دایك بووە، وە لە ساڵی (٣٢٢) ی پێش زایین، كۆچی دوایی كردووە[٨٤]· پاشان هاتووە: (...و دەڵێن ئەم، توێژینەوەی فەلسەفەی گەیاندۆتە لوتكە·ئەم و فێركارەكانی پێیان دەگوتن (ڕۆبشتیارەكان= المشائین))·دوو جار (ئەم) هاتووە، (ئەم) كێیە؟! جگە لە ناتەواوی ڕستەكە، ئەی (ڕۆبشتیارەكان)، كە بەرامبەری ووشەی (المشائین) نووسراوە، یانی چی؟ پاشان هاتووە: (...ئەرستۆ – مامۆستای ئەسكەندەری مەكدۆنیش بووە لە

كۆشكی شاهانەیدا...)[85]. باشە، كۆشكی شاهانەی، كێ؟ ڕوون نییە ! وە هەروەها لە باسی (بەرنامەكەی) دا، چەندین هەڵەی تێدایە.وەك و هاتووە: (...و ئینجا ڕووی دەكردە كەم و كوڕییە و ئاڵۆزییەكان...). پاشان هاتووە: ((زانستێكی بەڵگەدار واتە: بەڵگەنەویست) دابمەزرێنی).باشە، ئەمە چۆن دەبێت؟! دواتر من دایدەمەزرێنم !!! پاشان هاتووە: (...بیروباوەڕ سەرەتاییەكان...).(ببەستێ بۆ یاساكانی).دواتر هاتووە: (...و لەسەر بناغەیەكی پتەوی پشت بە زانیاری و هۆ و ئەنجامەكەی دامەزرابوو...)[86]. ئەمەیە، یاسای ڕێنووس و، ڕێزمان و، زمانی شیرینی كوردی !!! هەر لە هەمان بابەت و، لە لاپەڕەی دوایدا، هاتووە: (...لەسەر (ئاستی بوونی سرووشتی) گۆڕاوكار لە یەكتری لە نێو جوڵەیەكی بەردەوام لە (پەیدابوون و لە ناوچوون) و گۆڕان دەكەن).باشە، ئەمە چی دەبەخشێ؟! پاشان هاتووە: (فەلسەفەی (میتافیزیكی) (جێ یەكی پاش سروشت)).(جێ یەكی)، یانی چی؟ دواتر (چیەتی پاش سروشت) هاتووە و، دواتر (میتافیزیفیا).هەر باشە، نەبووە بە (فاسۆڵیا) !!! وە هەروەها هاتووە: (لەوەی كە هۆشی ئەستێرەكارلێكەرەكان..كاریگەری جیهانی سەر زەمینن.كەچی فەلسەفەكەی ئەرستۆ سەبارەت ڕەوشتەوە بابەتەكانی، مرۆڤ و خێر و خۆشی و كرداری چاك بە پێی تێڕوانینێكی پەروەردەیی دەگرێتەوە)[87]. هەر لە هەمان بابەت دا، هاتووە: (...(هێزە هۆشمەندەكان) (القویالعاقلە)).پاشان هاتووە: (بۆ نمونە ئازایەتی ناوەندێكی مام ناوەندی نێوان (ترسنۆكایەتی)...).پاشان هاتووە: (– لێرەدا ئەرستۆ سەبارەت بە فەلسەفەكەی ڕەوشت و ڕامیاری و كۆمەڵایەتییەكە...).دواتر هاتووە: (لەدواییدا دەماگیری بۆ ئەسینا هەبوو بە (ئەسینی) ناونرا پاش سۆكرات پەكیش بە فەلسەفەكەی ئەرستۆ بخات).باشە ئەمە كێیە و، پاش كێ، پەك بە فەلسەفە بخات؟! دواتر هاتووە: (...كاتێ كە دووچاری پیلانەكانی

هاوچەشنی پیلانەكانی پێشوو بووە وبەوەی كە (ئەرستۆ بێگانەیە و خەڵكی ئەسینا نییە) ئەرستۆش هەر بە شەو ئەسینای جێ هێشتوە و دەی گوت (نامەوێ جارێكی دیكە خەڵكی ئەسینا زەفەر بە فەلسەفە) بیەن)٠ئەوەی لێ ی تێدەگات، پێمان خۆشە، دواتر بۆمانی باس بكات ! دواتر هاتووە: (لە ساڵی ٣٢٢ پێش ٠ ز ئەرستۆ كۆچی دوایكرد٠٠٠) [88]٠ ئەمەش دیسانەوە هەڵەیە، چونكی ئەرستۆ وەك و گووتمان، ساڵی (٣٢٢) ی پێش زایین، ساڵی مردن و، كۆچكردنییەتی[89]٠ پاشان هاتووە: (٠٠٠ئەمەی دواییش لە ژووریی بابل و لە ناوچەی ئەسكەندەریە لە ساڵی (٣١٨) پێش پ٠ز نێژرا)٠باشە ئەمە كێ نێژرا؟! ! ![90]٠ وە هەروەها لە بابەتی قۆناغی سێیەم (فەلسەفەی یۆنانی پاش ئەرستۆ (گومانكاران) ئەپیكۆرسییەكان، هەیوانییەكان قوتابخانەكەی ئەلئەسكەندەریە) دا، چەند هەڵەیەكی تری تێدا بەدی دەكرێت٠لە باسی (گومانكاران): (الشكاك) دا، هاتووە: (٠٠٠بەلاَم چەشنی لە بێ برپاریان هێمنی و شادی و بەختەوەریان دەستكەوتە٠٠٠)[91]٠ سەرەتا دەبێت بزانین، (الشكاك)، واتەی (گومانگەرایی) دەگەیەنێ، وە لە زمانی ئینگلیزیش دا، وەها هاتووە: (Sceptics)[92]٠ ئەگەر مەبەستیش لێ ی، (مزهب الشك) بێت، ئەوە دەبێتە (رێبازی گومان) و، لە ئینگلیزیش دا، ئاوەهایە (Scepticism)[93]٠ وە لە بابەتی دوایش دا، نووسراوە: ((ئەبیكۆرسییەكان) (الابیقوریە)، وە نووسراوە: (ئەم رێباوەرە (رێبازە گەردیلەییەكان) یۆنانییە٠٠٠)[94]٠ لە راستی دا، خۆی لە بنەڕەت دا، بەم شێوەیە: (الابیقوریە)، واتە (ئەبیكوریەت) — (Epicureanism)، یاخود (ألابیقوریون)، دەبێتە (ئەبیكورییەكان) — (Epicureans) [95]٠یان دەكرێ، بەم شێوەیەش بنووسرێت٠وە پاشان، ئێمە تێناگەین، لە ئەوەی نووسراوە: (ئەم رێباوەرە (رێبازە گەردیلەییەكان) یۆنانییە) ! ! ! پاشان هاتووە: (٠٠٠ئەم تێروانینە ساكارانەی ئەوە دەسەلمێنی٠٠٠)[96]٠

دیسانەوە، تێڕوانینی ئەو ساکارانەیە و، کەچی من دەیسەلمێنم ! پاشان هاتووە: (لە بارەی ڕەوشتەوەش دووپاتی ئەوەی دەکردە ئەو مرۆڤەیە کە بڕوای بە دواڕۆژ نی یە)٠ وە لە باسی (هەیوانی یەتی) یش دا، چەندین ڕستە و، ووشە دەخەینە ڕوو، کە بە لامانەوە، جێگەی هەڵوەستە لەسەرکردنە٠وەك و: (٠٠٠کەلەیسەر زانستی سروشتی و٠٠٠)٠ئەمە، یەکێك لە خوێندکارەکانم، ووتی: (مامۆستا، ئەوە (کەلەی سەر) نییە)؟!!! پاشان هاتووە: (٠٠٠خاکە پێتدارەکەیەتی) و، (لۆژیك و پەرژێنێتی) و، (٠٠٠خواو جیهانی کەرەستەییان بەیەك داناوە) و، (٠٠٠جیهان یەك تۆکمە و پڕە٠٠٠) و، (٠٠٠بە پێی، نەخشەیەك یان (هات) یکی٠٠٠) و، (مەبەسەکی) و، (٠٠٠و ئامانج وەرپێچراوە کردەوەکانی کەسان ملکەچی پێویستییە لێی ڕزگار نابن)[97]٠ باشە هەیوانی یەتی، یانی چی؟ وە لە پەراوێزەکەیەوە، لە خوارەوە، نووسراوە: (فەلسەفەکە ناوی هەیوانەتی لێنراوە، چونکە خاوەنانی لە هەیوان یەکیان دەگرتەوە)[98]٠ سەیر لەوەدایە، لە پەراوێزدا، بووە بە (هەیوانەتی) !!! پاشان خاوەنانی، کە لە هەیوان یەکیان دەگرتەوە، مەبەست لە هەیوان، شوێنە لە ماڵ؟ وەك و (بەرتارمە) و، (دیوەخان)، یان شوێن و جێگایەکی ترە؟ وە پێمان خۆشە، خوێنەر خۆی تەماشای ڕستە و، ووشەکانی سەرەوە بکات٠وە هەروەها لە (خوێندنگەی ئەسکەندەرییە) ش دا، دیسانەوە چەند هەڵەیەکی تێدا بەدی دەکرێت، وەك و هاتووە: (٠٠٠شێوەکاری ئایینی)، کە نازانین واتەی چییە؟ پاشان هاتووە: ((ئەفلاتون) (٣٠٢ – ٣٧٠) ز٠٠٠)[99]٠ وا بزانم ئاشکرایە، لە فەلسەفەی هەموو دونیادا، هەر (ئیفلاتوون) یَك هەیە٠وە نە لەم ساڵەدا ژیاوە و، نە کۆچی دواییشی کردووە٠پاشان لە لاپەڕەی دوایدا، هاتووە: (٠٠٠یەکێك لە خوێندکارەکانی نووسینەکانی لەبەرگێکدا کۆکردۆتەوە بە ناوی (نوێییەکان) ٠٠٠)٠پاشان هاتووە: (٠٠٠ئەفلاتون وای بینیوە٠٠٠)[100]٠ ئەم هەڵە و، کەم و کورتییانە، خوێنەر، زۆر

ئەستەمە، بتوانێت بە ئاسانی ڕاستییان بكاتەوە، چونكی وەها شێوێندراوە، مەگەر كەسێك شارەزایی و، ئاگاییەكی باشی هەبێت، لەو بارەیەوە، بۆ ئەوەی ڕاستی و، دروستی بابەتەكان، بدۆزێتەوە٠بە بۆچوون و، باوەڕی ئێمە، وێڕای ئەم هەموو هەڵە و، كاولكارییە زانستییەدا، ئێمە وای بۆ دەچین، كەوا ئەم نێوە، كە بە (ئەفلاتوون) تۆمار كراوە، هەڵەیە، بەڵكو ڕاستییەكەی (افلوطین) ە، وە هەروەها ساڵەكەش، هەر هەڵەیە، چونكی ماوەی ساڵانی (٢٠٢) یان (٢٠٤) ی زایینی، لە دایك بووە، وە لە ساڵی (٢٧٠) زایینیش، كۆچی دوایی كردووە[١٠١]٠ وە دەبێت لە یادیشمان نەچێت، ناونیشانەكەشی، كە بە (نوێیەكان) هاتووە، هەڵەیە و، پێدەچێت وەرگێڕابێت، بۆ (نۆییەكان)، كە ئەمەش ناونیشانی (التاسوعات) بێت، كە هینی (افلوطین)ە[١٠٢]٠ هەروەها لە كۆتاییش دا، هاتووە: (٠٠٠ڕێگەی ڕزگاربوون لە جیهانی مادەی كە لە جیهانی هەستپێكراوەكانەوە دەست پێدەكات و بەرز دەبێتەوە بەرەو خوا دوای خۆڕاهێنان وەڕەنجی گیانی)[١٠٣]٠ من هیچ شتێك تێنەگەیشتم، ئەگەر ئێوە شتێك لەو بابەتە گەشتن !

**بەشی پێنجەم:- (مێژووی بیری (هزری) فەلسەفەی ئیسلامی (ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا)):**

لە بابەتی (خوێندنگەی ئەسكەندەرییە و دەوری بیری فەلسەفیانەی) دا، چەندین هەڵە و، كەم و كورتی، تێدا بەدی دەكرێت٠وەك و هاتووە: (٠٠٠بە هۆی پەڕاندنی نێوان كەلەپووری فەلسەفە و ئایین٠٠٠)٠یان وەك و هاتووە: (٠٠٠خاوەنی ئەم هەموو زانست و زانیاریانەی خەڵكی دانیشتوانی ناوچەی ڕۆژهەلات بوونە٠٠٠)٠پاشان هاتووە: (٠٠٠ئیفلاتونی میسری (٢٧٠ز) دایهێناوە لە نێو كتێبی نۆیەكان (التاسوعات)٠٠٠)٠دواتر هاتووە: (هۆكار و پەیوەندی ڕەهای نێوان (هۆكار و ئەنجام) لەو ماوەیەدا لە ژێر بیروباوەڕی (لەدایك بوونەكان)

هاتۆتە دامەزراندن...)[104]. لە ڕاستی دا، ئەوەی لەمەوپێش، لە باسكردن و، ڕاستكردنەوەی دا، گوومانمان هەبوو و، هەندێ جاریش، ترس بە بڕیارەكانمانەوە دیار بوو، كەچی لێرەدا، بێ یەك و دوو، ڕاستی و، دروستی نووسین و، بڕیارەكانمان، نیشان دەدرێت !!! ئەوەتا سالّی (٢٧٠) ی زایینی هاتووە، وە هەروەها كتێبەكەی (التاسوعات)، كە ئێمە لەمەوبەر باسمان لێوە كردووە.پاشان لە لاپەڕەیەی دوایدا، هاتووە: (...لە خوای گەورە گوایە ڕژاونەتەوە..). باشە ئەمەیان، یانی چی، (لە خوای گەورە گوایە ڕژاونەتەوە)؟!!! ئەمە چ جۆرە گوزارشتێكە؟ دواتر هاتووە: (...بە ڕێگەیەكی نزیك لە بیرۆكەی هۆی دوابەدوا هەروەكو چۆن لە چوارچێوەی (لەدایك بوونەكان) ناسراوە...).وە هەروەها لە بابەتی (فەلسەفە دوایی هاتنی حەزرەتی (مەسیح) سلاّوی خوای لێبێت) دا.چەند كەم و كورتییەكی تری تێدایە، وەك و هاتووە: (...تاوەكو وەلاّمدانەوەی هاوتای بە تێڕوانینی تەواو كاربداتە دەستەوە...).وە هاتووە: (...ئەم دانایانە لە گەردوون و ژیان داڕمان و بە چاوێكی پڕ لە لێكۆڵینەوە لە چارەسەری سەرتاپاگیر دەگەڕان و گوایە مرۆڤ بەمە نەبێت هەرگیز ڕانەپەڕێ و سەنگی ژیان و كەسانی لە پەیوەندییەكانی مرۆڤدا لە دوای لە باربوون ناگەڕێتەوە سەربار بە گەڕاندنەوەی پێوەرەكاری لە ناوچوون پێوانەكانی ڕەوشتەكی كە بە هۆی لە خۆبایی بوون و توندی ستەم و زۆرداری دێتە كایەوە)[105]. با خوێنەر خۆی بیخوێنێتەوە و، پاش وچانێك، وەلاّممان بداتەوە !!! وە هەروەها لە بابەتی سێیەم: (فەیلەسوفانی موسلّمان لە ڕۆژهەلاّت و ڕۆژئاوا) دا، دیسانەوە، چەندین هەڵە و، كەم و كورتی، تێدا بەدی دەكرێت.وەك و هاتووە: (...و سەرچاوەی زانست و زانیارییەكانی چەرخەكانی دوابەدواشدا.بۆمان هەیە بەرهەمەمەكانی چالاكیەكانی...).پاشان هاتووە:

(···(قوتابخانەی بەغدادی فەلسەفەی)···)·وە لـە بابـەتی فـارابی (ئـەبو نەسـری كوڕی موحەممەد ٥٣٩ك — ٥٩٠ز): یـش دا، هەڵـەی تێـدا دەبینرێـت·پـێش هـەموو شتێك، دەبێ خوێنەریش، ئاگاداری ئـەوە بێـت، كـەوا ئەگـەر بێـت و بمانـەوێت، نێوی هەر كەسێك، بنووسین و، مەبەستمان لێی، ئاگاداركردنەوەی خوێنەر بێـت، لە بارەی تەمـەن و، سـەردەمەكەیەوە·ئـەوە دەبێت، سـاڵەكەی لـە تەنیشتەوە بنووسرێت، ئیدی بە ساڵی زایینی بێت، یاخود كۆچی، هـیچ فـەرق ناكـات·وە لـە پاڵ ئەوەش دا، ئەگەر هاتوو، یەك سـاڵمان نووسـی، ئـەوە دەبێـت و، مەرجیـشە بنووسرێت و، ئاماژە بەوە بدرێت، كە ئایە ساڵی لە دایك بوونییـەتی، یـان سـاڵی كۆچكردنییەتی؟ ئەوەی ئێمە تێبینیمان كردبێت، لە مێژوودا، زیاتر ساڵی مردن، دەنووسرێت·وە ئەگەر هەردوو ساڵی كۆچی و، زایینییمان پێكەوە نووسی، ئـەوە دەبێت، هەردوو ساڵەكە گوزارشت لە یەك كات و، سەردەم بكەن.بە واتایەكی تر، واتە دەبێت هەردوو ساڵەكە، هاوتای یەكدی بن، بـەڵام بـە سـاڵی زایینـی، سـاڵی (ئەوەندە)، لە دایـك بـووە، وە بـە گـوێرەی سـاڵی كۆچـیش، سـاڵی (ئەوەنـدە)، كۆچی دوایی كردووە·مەخابن، ئەوەی لێـرەدا دەبینرێـت، نـەك هـەر هیـچی تێـدا بەدی ناكرێت، بەڵكو بە هەڵەش نووسراوە، چونكی جارێ نەنووسـراوە، ئـەم دوو ساڵە، تێیدا لە دایك بووە، یاخود كۆچی دوایی كردووە؟ باشە، ئەم دوو سـاڵەی، كە بـە كۆچـی و، زایینـی نووسـراوە، ئایـە هاوتـای یـەكن؟ لـە وەڵام دا دەڵـێین: بێگوومان نەخێر·سـەرەڕای هـەموو ئەمانـەش، هـەر خـودی هـەردوو سـاڵەكەش، هەڵەن·چونكی (ابو نصر محمد بـن محمـد بـن طرحـان بـن اوزلـغ)، كـە لـە شـاری (فاراب)، لە دایك بـووە، كـە دواتـر بـە (فـارابی) دەناسـرێت·لـە سـاڵی (٨٧٠) ی زایینی لە دایك بووە، وە لە ساڵی (٩٥٠) ی زایینیش، كۆچی دوایـی كـردووە[١٠٦]. كە دەكاتە نزیكەی، وە بەرامبەر بە ساڵی (٢٥٩) ی كۆچی، لە دایك بووە، وە لـە

ساڵی (٣٣٩) ی كۆچیش، فارابی كۆچی دوایی كردووە [١٠٧]. پاشان نووسراوە: (...ئەرستۆ لەم بارەویەوە...)[١٠٨]. پاشان لە لاپەڕەی دوایدا هاتووە: (...(تاكەی و هزر)...)[١٠٩]. وە هەروەها لە باسی (غەزالی (ئەبو حامد كوڕی موحەمەد) دا، چەندین هەڵەی تری تێدایە، وەك و: (لە خاڵی (أ) دا هاتووە: ئەم فەیلەسوفە توێژینەوەكانی ئایینی و قسەزانییەوە چۆتەسەر (زانستی لۆژیك) و (فەلسەفە)).پاشان هاتووە: (...كتێبی (ڕزگاركەری سەرلێشیوان) (المنقذ من الضلال) [١١٠]. ڕەنگە هیچ پێویست نەكات، كە نێوی كتێبەكان، وەربگێڕین بو سەر، زمانی كوردی.ئێمە دونیایەك كێشەی گەورەترمان لەبەردەم دایە !!!

دواتر لە لاپەڕەی تردا، هاتووە: (...هەروەكو چۆن فەیلەسوفان بۆی دەچوون نەبووە لە گەڵیاندا سەبارەت بە (گەڕاندنەوەی گیان) (المعاد الروحانی)).پاشان هاتووە: (...پەرۆشی فەیلەسوفان (تهافت الفلاسفة)...).لێرەشدا، دیسانەوە دووبارە بووەتەوە.دواتر نووسراوە: (...و دور وتووێژ و ڕاوبۆچوونی فەیلەسوفەكان ئەوانەی سەبارەت پێیەوە و ------------------

--)[١١١]. باشە سەرەڕای بوونی، ئەو هەموو كەم و كورتییانەی، كە تێدا بەدی دەكرێت، ئەی ئەم بۆشاییە، چی دێ بە دوایدا؟!!! وە هەروەها لە باسی بابەتی (دووەم: فەیلەسوفانی ڕۆژئاوای ئیسلامی) ش دا، بە هەمان شێوە، هەڵەیەكی تێدا بەدی دەكردێت.كە هاتووە: (دیارترین ڕووكەشی پێشكەوتنی شارستانیەت لە لە ئەندەلوسدا لە (٣٦٦ك /٩٧١ز) سەری هەڵداوە...).بە بۆچوون و، زانینی ئێمە، ئەم ساڵە، ئەگەر بێت و، ساڵە كۆچییەكەشی، ڕاست بێت، ئەوە ئەو ساڵە زایینییەی، كە بەرامبەری هاتووە، هەڵەیە، كە دەكاتە نزیكەی (٩٧٧) ی زایینی.بۆ نموونە: ئەگەر بپرسین، ئەی چۆن دەبێت؟ لە وەڵام دا دەكرێت، نموونەی ساڵی (٦٥٦) كۆچی بهێنینەوە، كە ساڵی كۆتایهێنانە، بە

سەردەمی خەلافەتی عەباسی، لە لایەن مەغۆلەكانەوە، كە چۆن دەكاتە، ساڵی (١٢٥٨) ی زایینی؟ پێش هەموو شتێك، دەبێت ئەوە بزانین، كەوا هەموو ساڵێكی كۆچی، دابەشی (٣٣) سی و سێ ی دەكەین، واتە ئەگەر (٦٥٦) ی كۆچی، دابەشی (٣٣) ی بكەین، ئەوە دەكاتە (١٩٨٧٨٧٨٨)، چونكە زیاترە، بە (٢٠) هەژماری دەكەیەن، پاشان بە پێی ئەم ژمارەیە، ئەوەندەی لێ دەردەكەین، واتە (٢٠)، لە (٦٥٦) دەردەكەین، كە دەكاتە (٦٣٦)، پاشان (٦٢٢) یشی بۆ زیاد دەكەین، لەبەر چی؟ چونكی ئەو كاتەی، كە ساڵی (٦٢٢) ی زایینی بووە، تازە ساڵی (١) ی كۆچی بووە، كەواتە (٦٣٦) لەگەڵ (٦٢٢) كۆیان بكەینەوە، ئەوە دەكاتە (١٢٥٨) ی زایینی.وە ئەگەر ساڵی ئێستای كۆچیش وەربگرین، ڕەنگبێ زیاتر مەبەستەكەمان، بۆ ڕوون بێتەوە، ئێستا (١٤٣٣) كۆچییە، كە دەبێت بەرانبەر بە ساڵی (٢٠١٢) ی زایینی بێت، وە بە پێی ئەو هاوكێشەیەش بێت، وەك و گووتمان.(٤٣٤٢٤٢٤٢) كە هەر (٤٣) دەكات، (٤٣) لە (١٤٣٣) ی كۆچی دەربكەین، دەكاتە (١٣٩٠)، پاشان (٦٢٢) ی زایینی، بۆ زیاد دەكەین، كە بێگوومان دەكاتە (٢٠١٢) ی زایینی.شیاووی باس لێوەكردنە، ڕێگای تریش هەیە، بۆ ئەم مەبەستە !!! پاشان لە باسی ئیبن روشد (ئەبو ئەلوەلید كوڕی ئەحمەدە) دا، هاتووە: (...(بە لوتكەی خوێندنگە ئەندەلووس) ناویان دەبرد...).وە لە باسی بابەتی (كاریگەریەكەی) دا، هاتووە: (...لە میانینەوە)[١١٢]. وە هەروەها هاتووە: (ئیبن ڕووشد سەبارەت بە ئایینزانی و فەلسەفە و دۆزینەوەی بەرنامەی بەڵگەكان جیاكردنەوەی ڕاپۆرتەكەی پەند و شەریعەت نووسیویەتی وەك ڕەتدانەوەیەك بەرامبەر بە كتێبەكەی (فەیلوسەفەكان) ی غەزالی).لە ڕاستی دا، ئەم كۆپلەیە، زۆر ناڕوونە.دواجار من نازانم، مەبەست لە كتێبی (فەیلەسووفەكان) ی غەزالی، چییە؟ وە هەروەها لە

(بەرنامەكەی) دا، هاتووە: (...موسڵمانان پەسەند و پەیڕەوە دەكرا...)·پاشان هاتووە: (...ئیبن ڕوشد بە ڕووی دژانی فەلسەفە دەوەستێ و دەڵێ (ژیرەكان) لە داناییدا باشترین گەر هەڵەش بكەن)...)[113]· وە لە بابەتی (فەلسەفەكەی) دا، هاتووە: (هەر بۆیەش ئیبن ڕوشد بەرگری لە فەیلەسوفانی دەركرد و...)[114]· وە هەروەها لە باسی (ئیبن خەلدون) وەلیەدینی كوری عەبدولڕەحمانی كوری موحەمەدی تونسییە) دا، چەند هەڵەیەكی تێدا بەدی دەكرێت، وەك و لە (فەلسەفەكەی) دا، هاتووە: (...و كاتێ كە توێژینەوەكانی تەنگانەكەی كەوتن (میحنەت ئەلسقوت)...)[115]· جارێكی تریش، نێوی پەرتووك، وەرگێڕدراوە، بەلاَم زۆر ناڕوونە !!! وە پاشان، لە لاپەڕەی دواتردا، هاتووە: (...و بە هۆیەكانی دوورە نزیك و...)·پاشان لە خوارەوەی خاڵی (پ) دا، هاتووە: (...و گۆڕانكاریەكانی لەمەوسالانەی...)·دواتر هاتووە: (...یاساكەی تەناداریی...)[116]· وە پاشان، لە لاپەڕەی دوایدا، هاتووە: (...ئیبن خەلدون سەبارەت بە ستەم و زۆرداری و كلكایەتی بێگانە و...)[117]· باشە، ئەبێ (كلكایەتی بێگانە)، مەبەست لێی چ بێت؟! یاخود نەدەبوو، ووشەیەكی گوونجاووتری، بۆ بدۆزرێتەوە؟!

## بەشی شەشەم:- (بیری نوێی ئەوروپا لە سەردەمی بوژانەوەی ئەوروپا و هەندێ ئاكارە فەلسەفیە نوێیەكانی):

بێگومان، لەم بەشەش دا، چەند هەڵەیەكی تێدا بەدی دەكرێت·بۆ نموونە هاتووە: (...هەروەها بەهاكانی ڕەوشت و جوانی دەخستە ڕووی هەروەها...)·پاشان هاتووە: (...لەو ساتەدا مێژووناسانی ڕۆژئاوای چەرخی ناوەڕاست ئەو سەردەمەیان ناو نابوو لە سەدەمی پێنجەمەوە تا سەدەی

چواردەهەم درێژەی هەبووە و بەسەر دوو ماوەدا دابەش کرابو:)·پاشان هاتووە: (···لایەنی باڵی بەسەردا کێشابوو···)[١١٨]· وە لە لاپەڕەی دوایدا، هاتووە: (···بزوتنەوەی چاککردنی ئایینی و،···)·پاشان هاتووە: (···پرۆتیستاتس) و، (دانای قازانج) و، (···ڕێباوەڕی (دەست هەڵگرتنی ژیان) ی کڵێسەی کاپولیك) و، (ناوییەکان) و، (فرەنسیسکانەکانی···)[١١٩]· وە لە لاپەڕەی دواتریش دا، هاتووە: (بای خۆ)·پاشان هاتووە: (···داوای لێکۆڵینەوەی شتەکانی سروشت بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ نەك تەنیا لە نووسراوەکان···)·پاشان هاتووە: (···و بازرگانی و کۆمەڵایەتی گۆڕان···)[١٢٠]. لە بری (بزوتنەوەی چاککردنی ئایینی)، وا باشە، بنووسرێت: (بزووتنەوەی چاکسازی ئایینی)، دواتر (پرۆتیستاتس)، هەڵەیە، ڕاستییەکەشی ئاوەهایە: Protestantism)، کە دەکاتە (پرۆتستانتیزم)، واتە (البروتستانتية)[١٢١]. وە هەروەها (کاپولیك) یش، هەڵەیە، ڕاستییەکەیشی ئەمەیە: (Catholicsme، کە بەرانبەر بە (کاتولیکیە) — (کاتۆلیکییەت)ە[١٢٢]. وە هەروەها لە باسی (خەسڵەت و دەرئەنجامەکانی ئەم پێشکەوتنانە لەسەر زانستی نوێ و فەلسەفەی نوێ:) ش دا، چەندین هەڵەی زەقی تێدا بەدی دەکرێت·وەك و لە خاڵی یەکەم دا، هاتووە: (···گریمانەی ئەوتۆ دادەمەزراوە···) و، (···سەردەمە ناوەنییەکان)·وە لە خاڵی دووەم دا، هاتووە: ((ڕووداوی نمونە))·پاشان لە خاڵی چوارەم دا، هاتووە: (···چونکە ڕانەبردووی زۆر لە پێش تا بزانرێت···). وە هەروەها لە خاڵی پێنجەم دا، هاتووە: (···و بایەخی بە مرۆڤ بدا و دانی توناداری هۆش و تاقیکەرییەکانی مرۆڤ بۆ زانین دەربارەی جیهان)·پاشان لە خاڵی شەشەم دا، هاتووە: (···و لێی ڕزگار نابێت لە ژیانی سەرزەوی هەبووە···)[١٢٣]. پاشان لە لاپەڕەی دوایدا، هاتووە: (···ئەو توخمەی کە پێڕۆ و یاساکان پشت دیاردەکان دەردەخات···)·وە هەروەها

هاتووە: (مژدەی فەلسەفەی ڕۆشنكردنەوەی گەشبین یان وای لێهات...)·وە هەروەها دواتر، نووسراوە: (...ژیری مرۆڤ و تاوانەكەی...)·پاشان هاتووە: (...(شیانی زانینی شتان)...) و، (...و سنووری زانیمان چییە؟)·وە هەروەها هاتووە: (...لێكۆڵینەوەی شیانی زانیاری...)[١٢٤]. وە لە باسی یەكەم: (ڕێباوەری ژیری) دا، هاتووە: (ئەم ڕێباوەرە لەو بڕوایەدایە كە هەندێ بیروباوەڕ لە هۆشدا لە خۆیانەوە بەر لە تاقیكردنەوە هەن لەو سەربەخۆن و زۆر گرنگ و بەجێن باوەڕی (گشت لە بەش گەورەترە)...)·وە هەروەها لە باسی (دیكارت) یش دا، چەند هەڵەیەكی تری تێدا بەدی دەكرێت·وەك و هاتووە: (فەیلەسوف و زانایەكی فەرەنسی زۆر گرنگی بە زانیارییەكانی سەردەمی خۆی دابوو بە تایبەتی بیركاری بە شێوەیەكی سەرەكی بایەخیشی بە زانیاری لەش و فیزیا و زانستەكانی دیكە)[١٢٥]. باشە ئەمە، یانی چی؟! وە لە لاپەڕەی دوایدا، هاتووە: (...چونكە جار هەیە هەستەكان خەڵتێنن، دەبێ هەردەم دەمانخەڵتێنن و...)·پاشان هاتووە: (...ئەم گومانەی بە (گومانی بەرنامەیی) ناونرا...)·دواتر هاتووە: (...هێزە لە ئاسی بەدەرەكانمان...)·پاشان هاتووە: ((دیكارت) وای تێبینی كردبوو كە چەند بازنەیی گومانەكان بكێشێت...)[١٢٦]. وە هەروەها لە باسی (فرەنسیس بەیكۆن) دا، چەند هەڵەیەكمان بەدی كردووە، وەك و هاتووە: (...ناوی نووسراوە كە (ئۆرگانۆنی نوێ) یە یان (ئامرازە نوێیەكەی) كە ئەم واتایە دەبەخشێت واتای نەیاریە بە مەبەستەكەی...)[١٢٧]. لە ڕاستی دا، ئەم كتێبە، كە نێوە ئینگلیزییەكەیەتی – (Novum organum·وە وەرگێڕانە ووشە بە ووشەكەشی، دەبێت بە (الاداة الجديدة)، بەو پێیەی كە (Organum، واتای (الاداة) دەگەیەنێت·بەڵام ئەم كتێبە، زیاتر بە (المنطق الجديد)، ناوبانگی ڕۆیشتووە (١٢٨)·وە لە لاپەڕەی دوایش دا، هاتووە: (...كە داكەوتێكیان گشت

یان بە لای کەمییەوە...)·وە لە خوارەوەش، وە لە خاڵی یەکەم دا، نووسراوە: (١- بە هەڵەچوونەکانی (آوهام) هۆز)[129]. باشە، ئێمە تێناگەین، ئەوەی ناو کەوانەکە - (آوهام) ە، بۆچی و، لەبەر چ هۆیەك، بە عەرەبی نووسراوە؟ ئەی بۆ چ (هۆز) ی لە پاڵ دا، نووسراوە؟ مەگەر بەس خوا، خۆی بزانێت !!! وە هەروەها لە بابەتی دووەم: (فەلسەفەی ڕۆژئاوای هاوچەرخ) دا، چەند هەڵەیەکی تێدا بەدی دەکرێت، وەك و هاتووە: (...لە دەوڵەتانی سەرمایە دارداو تالآن کردنەکان و سامان کەرەستەی خاوی نێودەوڵەتانی داگیرکراو...)·پاشان نووسراوە: (...فەرەنسابیەکان هێنایایەکایەوە...)·پاشان هاتووە: (...زانای ئابووری (ئادەم سمیپ)...)[130]. لە ڕاستی دا، ئەم ناوە هەڵەیە، چونکی (ئادەم سمیپ) ە·وە لەخاڵی دووەم دا، وە لە لاپەڕەی دوایدا، ئاوەها نووسراوە: (ئاکارەکانی بیر و فەلسەفەکەی سەدەی نۆزدەمە بە کورتی بەم شێوەیە بووە)·ئەم ڕستەیە، بابەتێکم بیر دەخاتەوە، ئێمە وەك و هەموو جارێك، لە کۆرسەکانی خوێندن دا، هەوڵ دەدەین، چالاکی بە خوێندکاران بکەین، هەر بۆیە، لەو بارەیەوە، ڕاپۆرت و، لێکۆڵینەوەی بچووك و، دیاریکراو، ئامادە دەکەن، جگە لە کەم و کورتییەکانی، بەلآم بە شێوەیەك لە شێوەکان، سوود و، قازانجی خۆی دەبێت، لە دوا ڕۆژدا، ئەگەر زۆر بچووکیش بێت·ئیدی یەکێك، لەو ڕاپۆرتانە، زۆر سەرەنجی ڕاکێشام، چونکی ناونیشانەکەی، بەم شێوەیە نووسیبوو: (ناپلیۆن هێرشی کردە سەر میسر) !!! با بێینەوە، سەر باس و، خواسەکانی خۆمان و، سەرەنج و، پەیڤەکانمان بنووسینەوە، لەو بارەیەوە·وە هەروەها لە خوارەوە هاتووە: (عەمانۆئیل کانت کۆچی دوایی کردووە فەلسەفەکەی بە خاڵێکی گۆڕانکاری لە مێژووی فەلسەفە دەژمێردرێت هەروەك (ئەفلاتون و ئەرستۆ) کارتێکردنیان بەسەر مێژووی فەلسەفەی

یۆنانییەكان...)·باشە ئێمە تێناگەین، ئەم كابرایە هەژارە، هێشتا لە دایك نەبووە، واتە ئێمە، بە خوێنەر و، خوێندكارانمان نەناساندووە، كە ئەم برادەرە، ساحیرە یان جنۆكەیە ! دیارە هەر لە دایك نەبووە و، ڕاستەوخۆ كۆچی دوایی كردووە !!! چونكە لە دەستپێكی باسەكەدا، نووسراوە (كۆچی دوایی كردووە) !!! پاشان هاتووە: (ئەمەشی بەش لێك دەداتەوە:)· پاشان هاتووە: (...وە ئەمەی دوای مادە یاساكانی بەرپێش لە گیان دەزانا...)[131]. وە هەروەها لە لاپەڕەی دواتریش دا، هاتووە: (...هەندا لە دەوڵەتان پەیڕەویان دەكرد)·ئەم جۆرە نووسینانە، لە نووسینی (مێخی) دەچێت ! پاشان هاتووە: (سۆشیالیستەكان هەوڵیاندا كە بۆچوونەكانیان لەمیان دامەزراند كۆمەڵ و گوند و دێهاتەكان و بونیاد و چۆنیەتی ڕكخستنیان جێبەجا بكەن...)·پێش هەموو شتێك، دەبێ ووشەی (سۆشیال) مان بۆ ڕوون بكرێتەوە، چونكی بۆ خوێندكار و، تەنانەت بۆ مامۆستاش، زەحمەتە·ئێمە لێرەدا، دەتوانین بە بێ دوو دڵی بڵێین: ئەم جۆرە نووسین و، وەرگێڕانە، شێوازێكی ترە، لە نووسین و، وەرگێڕان !!! وە هەروەها دووجار نووسراوە: (ئۆكست كۆمت)·پاشان هاتووە: (...وادەبینا...)·دواتر هاتووە: (...و تێورەكەی بە هەرسێ شێوەی بیر و باوەڕە سیاسی بەم جۆرە لێكدەدەنەوە)[132]· پاشان لە لاپەڕەی دوایدا، نووسراوە: (...لە خاڵی (پ)...گەلێ زیندەوەرانی دیكە وەستانی بەڕووی سروشت چاكترینیان بەرگە دەگرێ دەمێنێتەوە)·وە هەروەها نووسراوە: (...فەیلەسوفانی ڕەوشتە...)·وە هەروەها هاتووە: (جا پێویستە لەسەرمان پێش ئەوەی كۆتایی بە خستنەڕووی ئەم بیر و هزرانە كاریگەریانەی سەدەی نۆزدەهەمە بێنین...)·وە هەروەها نووسراوە: (...وەك سیجموند فرۆید كارل یونغ و...)·ئەم ناوەش، بە زمانی عەرەبی، وەها دەنووسرێت ! وە پاشان

نووسـراوە: (...لـە هەوڵـدانی تێگەیـشتنی دەروونـی ئـادەمیزادی و...)[١٣٣]. وە هەروەها لە بابەتی (فەلسەفەی هاوچەرخی سەدەی بیستەم) یش دا، بـە هـەمان شێوە، چەند هەڵەیەكمان تێدا بەدی كـردووە.وەك و هـاتووە: (لـەو ڕۆژهـەڵاتیش پاش كۆتایی جەنگی جیهانی یەكەم و...)[١٣٤]. وە لە لاپـەڕەی دوایـدا، هـاتووە: (...و هەنـدێ جـار ئـەم شـیكردنەوانەش یـان زاراوەی بوونـە یـاخودیش بـە شێوەیەكی لۆژیكی وە یان فەلسەفی،...).پاشان هاتووە: (...لایەنە چەوتەكانی و شـاراوەكانی وتـەكانی فەلـسەفەی هەڵدەداتـەوە).وە دواتـر نووسـراوە: (...و زانیارییەك بە ناوی (سیمیوتیقا) هاتە دامەزراندن) [١٣٥]. ئەگەر ئێمەش بە هەڵەدا نەچین، ئەوە ئەم ناوە هەڵەیـە، بـەڵكو ڕاسـتییەكەی، ئـا بـەم چەشـنەیە: The sementies) – (سیمانطیقا) – (سیمانتیكا) یە.هەر وەك و ئاوەهـا، باسـیشی لێـوە كـراوە: (یەكێكـە لـە لقـەكانی زانـستی زمـان و، لـە ئامـاژەی گوتـەكان و، پەرەسەندنی ئەو ئاماژانە، دەكۆڵێتەوە)[١٣٦]. پاشان هاتووە: (: دەبـێ پێوەرێـك بـۆ ئـەو ڕاسـتییەی دابنـێین كـە پێیـەوە وەرگێڕانـی زانیارییـەكانی فەلـسەفە و وەرگێڕدراون...)[١٣٧]. وە هەروەها لە بابەتی كۆتایش دا، وە لە (ج)– (واتەكانی ئەم كارە قووڵ و گرنگن) دا، چەند هەڵەیەكی ترمان، تێدا تۆمار كـردووە، وەك و هـاتووە: (...ئـەم ڕێبـازە گۆڕانكـاری بەسـەرهات تـا ئـەو ڕادەیـەی كـە لـە بەرژەوەنـدی خۆیـەتی زیـاتر ڕەچـاوی نـەدەكرد...).دواتـر هـاتووە: (لەوێـدا دیاردەكی تر بـە نـاوی تـر...).پاشـان هـاتووە: (ئـەم دیاردەیـە بـوونی جیهـانی دەرەكی دەسەلمێنن و دەڵێت بیر و هۆش و خۆیەتی پلەی یەكەمیان نـەبووە لـە زانیاری بۆیە هەر شتێك بیانویستایە لێی تێبگەین ئەوا بە پێـی ژینگـە و دوور لـە شیكردنەوەكانی نموونەیی و ڕۆحی لێكیان دەدایەوە فەیلەسـووفانی ڕێباوەرەكـە (مذهب) كە ناویان بە فەلـسەفەی (واقیعـەت) نـراوە)[١٣٨]. پـێم خۆشـە، خوێنـەر

تەنها دیقەتی، ڕاناو و، ئامرازەكان بدات ! وە دەپرسین: چ دێت لە كۆتایی دا؟ وە هەر لە هەمان بابەت دا، وە لە لاپەڕەی دواتردا، هاتووە: (لە كۆتاییدا ئاماژە بۆ گرنگترین گۆڕانكاریەكانی مێژووی فەلسەفە دەكەین پاش لە شەستەكان···)[١٣٩]. ئەمەیان، ئەگەر كابرایەكی عەرەب، یاخود هەر بیانییەكی تریش، كە تازە فێری زمانی شیرینی كوردی بێت، وەهای نانووسێت ! ! ! وە هەروەها لە كۆتایش دا، هەر بێبەش نەبووین، لە كەم و كورتی، وا پێدەچێت، ئەم كتێبە، ویستوویەتی هەتاوەك و دوا ساتەكانی تەمەنی، لەگەلی دا بین ! ئەوەتا لە (پرسیارەكانی بەشی شەشەم) دا، هاتووە: (پ٤/ مەبەست لە: أ- ئێباوەری ژیری ب- ڕێباوەری تاقی كاری···)[١٤٠]. لە كۆتایش دا، ئەو پرسیارەمان بە بیردا هات، كە بپرسین: باشە، ئەگەر ئەمە سەرەنج و، تێبینی ئێمە بێت، لە بارەی ئەم پەرتووكەوە، ئەی ئەبێ كەسایەتییەكی وەك و بەڕێز: (حەمەی مەلا كەریم)، چۆن تەماشای بكات و، چ بێژێت؟! ئەوان زۆر جار، بۆ ماوەیەكی دوور و درێژ، سەرقالی (ڕاناو) ێك، یان (زاراوە) یەك دەبن، بۆ ڕێكخستنی زوبانی شیرینی كوردی ! وێڕای هەموو ئەمانەش، ئەی ئەگەر ئەم بابەتەمان، بۆ خوودی نووسەرانی كتێبەكە بگێڕینەوە، چمان پێ دەڵێن؟ دوور نییە، هەر نووسینەكانی خۆیان، نەناسنەوە و، سوێند بخۆن و، نكۆڵیشی لێبكەن لەو بارەیەوە ! شیاووی باس لێوەكردنە، لە پێشەكی كتێبی (هیگلْ و فەلسەفەی تازەگەری) دا، (د·موحەممەد شێخ)، ووتەی دوو كەڵەنووسەری هێناوەتەوە، كە بووە بە جێگەی سەرەنج و، تێبینی ئێمە، بە تایبەتی بۆ ئەم بابەتەمان·كە هاتووە: (من تێبینیی ئەوەم كردووە، ئەو ڕۆژەی كەسێ كتێبێك دەنووسێت، بۆ ڕۆژی دواتر، دەڵێت: ئەگەر ئەمەی بگۆڕم باشترە و، ئەگەر ئەوەی بخەمە سەر، جوانترە·ئەمە جوانترین پەندە···و، بەڵگەیە بۆ ئەوەی

کــەموکورتی، بەســەر گــشت ئادەمزادەکانــدا، بــالآ دەســتە)·(عیمــادی ئەسفەهانی)·وە هەروەها هـاتووە: (یەکـەم شـت لاوازیـی ئـادەمزاد دەردەخـات، ئەوەیە، کاتێ کتێبێك دەنووسێت و، شـەوێك لای دەمێنێتـەوە، بـۆ ڕۆژی دواتـر، حەز دەکات کەم و، زیادی تیادا بکات·ئەمە لـە شـەوێکدا، ئینجـا وەرە دەبـێ لـە چەند ساڵێکدا، چی بکات)؟ (سەعالیبی)[141]· بریا، ئەم کتێبەی کە ئێمە قسەمان لـە بـارەوە کـرد، خـۆی لـە نێـو ووتـەی، ئـەم دوو نووسـەرەی سـەرەوەدا، ببینێتەوە·بەلآم بە داخ و، پەژارەیەکی زۆرەوە، هەتاوەك و ئەو شوێن و، ساتەی کە ئێمە ئاگادار بین، ئەم کتێبە، وەك و لەمەوپێش، ئاماژەمان بۆی کـرد، چـاپی پێنجەمیەتی ! کەچی هەروەك و خۆیەتی و، بە هەڵەکانی دا نەچـوونەتەوە !!! من داوا لە هیچ نووسەرێك ناکەم، کـە نووسـینێك بنووسـێت، یـاخود وەرگێڕانێـك بکات، کـە بـەدەر بێـت، لـە هەڵـە و، کـەم و کـورتی ! چـونکی هـیچ نووسـین و، کردارێکی مرۆیی نییە، کە لە دەرەوەی چوارچێوەی کەم و کورتی بێت.هـەروەك و لای هەمووان ئاشکرایە، تواناکانی مرۆڤیش، سنووردارە.بەلآم نـەك نووسـین و، وەرگێڕانێکیش، هاوشێوەی ئەم پەرتووکە !

## پێشنیارەکان

*یەکەم: پێمان باشە، بۆ ڕاسـتی و، دروسـتی ئـەم بابەتـەی ئێمـە، وە ڕق و، کینـە و، کێـشەی قوتابییـان و، مامۆسـتایان و، مەرگەسـاتەکانی ئـەم وانـە و، کتێبەدا، ڕاپرسییەك، ئەنجام بدرێ لەو بارەیەوە، ئەوجا، بۆیان دەردەکەوێت، چ بابــەتێك دەخوێنــدرێت، لــە پرۆگرامــەکانی خوێنــدن دا، وە دواجــاریش، ڕا و بۆچوونی خویندکاران و، مامۆستایانیش بە دروستی دەزانن لەو بارەیەوە !!!

*دووەم:- پێویستە، ئاماژە بەوە بكرێت، ئەگەر ئەم كتێبە، كورتكراوەتـەوە، یـان وەرگێڕدراوە، ئەوە نێوی سەرچاوە و، پەراوێزەكانی بنووسرێت و، ئاماژەی پێبكرێت.

*سێیەم:- وا بـە بـاش دەزانرێـت، تـەواوی كتێبـە عەرەبییەكـە، لـە لایـەن كەسـانی پـسپۆڕ و، شـارەزا و، زمانزانانـەوە وەربگێڕدرێـت، یـاخود ئەگـەر ئەمەشیان پێ نەكرا، ئەوە تەواوی ئەم كەم و كوڕییانـە، بنبڕ بكرێـت.وە ئەگـەر ئەمـەش نـەكرا، ئـەوە چـەندین مامۆسـتا و، دكتـۆری بـە توانـا و، كارامـا و، لێهاتوومان هەیە، ڕەنگبێ لە لای ئێمە، كەسێكی وەك و: (د.حەمید عـەزیز)، لـە بـەرایی ئـەو كەسـانە بێـت، لـەو بارەیـەوە، كـە یـەكێكن لـەو قەڵەمـە دیـار و، بەرچاوانەی بواری فیكر و، فەلسەفە، وە شارەزاییەكی باشیان هەیـە، لـە بـارەی زمانەوە.بە تایبەتی ئەو زمانانـەی، كـە ڕاسـتەوەخۆ فەلـسەفەی پـێ نووسـراوە، وەك و: (زمـانی ئـەڵمانی).یـاخود بـەڕێز (ڕێبـوار سـیوەیلی) هتـد...كـە ئێمـە بۆخۆمان، تا ڕادەیەكی زۆرباش، ئاگاداری نووسینەكانیانین.

*چوارەم:- دەبێت لیژنەیەك لە وەزارەتی پەروەردە دابنرێت، بەڵام كەسانی پـسپۆڕ و، شـارەزا و، لێهـاتوو و، خـاوەن ئـەزموون بـن، لـە هـەر بابـەتێك كـە دەینووسن، یاخود وەریدەگێڕن، چـونكی سـاڵانە، بـە سـەدان كـەس، بڕوانامـەی بەرز دەبەخشرێت، بـەڵام نـاتوانین نووسـین و، وەرگێڕانێكـی بـاش، بخەینـە بـەر دەست و، چاوی خوێندكاران ! خـۆ ئێمـە لـە تـەواوی وەزارەتـەكانی حكومـەتی هەرێمی كوردستان دا، بودجەیەكی باش تەرخان دەكرێت، بە تایبـەتی بـۆ چـاپ و، چاپەمەنی كتێب.

*پێنجەم:- زۆر گرنگە، هەر كـار و، كردارێـك كـە ئـەنجام دەدرێـت، سـەرەتا لەگـەڵ سروشـت و، ئاسـت و، بـارودۆخ و، هەلومـەرجی شـوێن و، كاتەكـەدا بگونجێ.نەك هەر خەیاڵی بەرز فڕینمان هەبێت و، كەچی هەر لە زەویدا بین !!!

*شەشەم:- پێویستە، چیتر پەرتووكەكان دوانەكەون و، لە پێش كردنەوەی دەوامی فەرمی، ئامادە بكرێت.نەوەك و مانگێك، یاخود زیاتر، بەسەر دەوام دا، بەسەر دەچێت، پاشان كتێبەكان دەگات ! ! !

*حەوتەم:- زۆر گرنگە، بەرنامە و، پرۆگرامەكانی خوێندن، لە كوردستان دا، نووسەری كورد، نووسەری بێت، نەك نووسەر و، وەرگێڕانی دەرەوە، یان هاوشێوەی ئەم كتێبەی لەبەر دەستمان دایە.

### پەراوێز و ژێدەرەكان

(١)- الالوسی، حسام الدین واخرون: (سەرەتاكانی فەلسەفە) - بۆ پۆلی یازدەهەمی ئامادەیی وێژەیی، و: نوری علی امین و ئەوانی تر، چاپخانەی (المستقبل)، لوبنان، چاپی پێنجەم، ٢٠١١، ل٣.

(٢)- الالوسی، حسام الدین واخرون: سەرچاوەی پێشوو، ل٤-٥.

(٣)- الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٥.

(٤)- الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٦.

(٥)- الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٧.

(٦)- الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٨.

(٧)- الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٩.

(٨)- الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل١٠.

(٩)- الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل١١.

(١٠)- بڕوانە: قورئانی پیرۆز، سورەتی (النساو)- الایە (٤٣).

(١١)- الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل١٢.

(١٢)- الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل١٣.

(١٣)- الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل١٤.

(١٤)- الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل١٥.

(١٥)- الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل١٥-١٦.زۆر سەیرە، باسی (تەوتمی) و، (تاپۆ)، پێشتر نەكراوە، لەوانەشە، لە كتێبە عەرەبییەكەدا هەبێت و، بەلآم لەم وەرگێڕانە دا قرتابێت!

(١٦)- الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل١٦.

(١٧)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل١٦.
(١٨)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل١٧.
(١٩)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل١٨.
(٢٠)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل١٩.
(٢١)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٢٠.
(٢٢)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٢١–٢٢.
(٢٣)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٢٣.
(٢٤)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٢٤.
(٢٥)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٢٥.
(٢٦)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٢٧.
(٢٧)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٢٨.
(٢٨)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٢٩.
(٢٩)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٢٩.
(٣٠)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٣١.
(٣١)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٣٣.
(٣٢)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٣٤–٣٥.
(٣٣)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٣٦–٣٧.
(٣٤)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٣٨.
(٣٥)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٣٩.
(٣٦)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل ٤٠–٤١.
(٣٧)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٤٢–٤٣.
(٣٨)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٤٣.
(٣٩)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٤٤.
(٤٠)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٤٥.
(٤١)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٤٥.
(٤٢)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٤٦.
(٤٣)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٤٦.
(٤٤)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٤٧.
(٤٥)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٤٨.

(٤٦)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٤٩·

(٤٧)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٥٠·

(٤٨)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٥٤·

(٤٩)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٥٥·

(٥٠)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٥٦·

(٥١)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٥٧·

(٥٢)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٥٨·

(٥٣)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٥٩·

(٥٤)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٥٩·

(٥٥)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٦٠·

(٥٦)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٦١·

(٥٧)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٦٢·

(٥٨) الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٦٣·

(٥٩)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٦٤·

(٦٠)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٦٥·دەربارەی، بڕوانە قورئانی پیرۆز: سورەتی (النحل) – الایە (٤٠)·

(٦١)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٦٦·

(٦٢)–جەمیل، كەلسومە: مێژووی دێرینی میسر، چاپخانەی (ڕۆژهەلآت)، هەولێر، چاپی یەكەم، ٢٠١٢، ل٩٠–٩١·

(٦٣)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٦٧·

(٦٤)– كوریك، جەیمز ئەی·: ڕێنسانس، و: هەژار ڕەحیمی، چاپخانەی (وەزارەتی ڕۆشنبیری)، هەولێر، چاپی یەكەم، سالّی چاپی نییە، ل٨٢·

(٦٥)– ئۆسمەن، كارێن: ڕێنسانسی ئیتالّیا، و: مەهدی خوون دلّ، چاپخانەی (وەزارەتی ڕۆشنبیری)، هەولێر، چاپی یەكەم، سالّی چاپی نییە، ل١١٠· دەربارەی ژیانی (روفائیل) – (١٤٨٣ – ١٥٢٠)، دەكرێ خوێنەر، بگەڕێتەوە بۆ كتێبەكەی، أحمد، كمال مظهر: النهضة، دار الحریة للطباعة، بغداد، ١٩٧٩، ص١١٦–١١٩·

(٦٦)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٦٨·

(٦٧)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٦٩·

(٦٨)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٧٠·

(٦٩)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٧٠–٧١.

(٧٠)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٧١.

(٧١)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٧١

(٧٢)– عمر، معن خلیل: تاریخ الفكر الاجتماعي، جامعة الموصل، ١٩٨٥، ص٥٦.

(٧٣)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٧٢.

(٧٤)–چیا، محەمەد (ئامادەكردن): (فەرهەنگی فەلسەفی) – لەگەڵ شیكاریی (٥٠٠) چەمكی فەلسەفیدا، چاپخانەی (مەهارت)، تاران، چاپی سێیەم، ٢٠٠٥، ل٢٢٤.

(٧٥)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٧٢.

(٧٦)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٧٣.

(٧٧)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٧٢.

(٧٨)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٧٣.

(٧٩)– عبدالجبار، نبیل عبدالحمید: الفلسفة لمن یرید، مطبعة (الحاج هاشم)، اربیل، ٢٠٠٤، ص٦٧.

(٨٠)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٧٤.

(٨١)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٧٥.

(٨٢)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٧٦.

(٨٣)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٧٦.

(٨٤)– عبدالجبار، نبیل عبدالحمید: تاریخ الفكر الاجتماعي، مطبعة وزارة التربیة، اربیل، ٢٠٠٥، ص٥٨.

(٨٥)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٧٦.

(٨٦)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٧٧.

(٨٧)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٧٨.

(٨٨)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٧٩.

(٨٩)– شارەزا، كەریم: ژیاننامە و بەرهەمەكانی ناودارانی جیهان، چاپخانەی (شڤان)، سلێمانی، چاپی یەكەم، ٢٠٠٧، ل٢٢.

(٩٠)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٧٩.

(٩١)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٨٠.

(٩٢)– چیا، محەمەد: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧٠.

(٩٣)– چیا، محەمەد، هەمان سەرچاوە، ل٢٧٥.

(٩٤)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٨٠.

(٩٥)– چیا، محەمەد، هەمان سەرچاوە، ل٢٦٥.

(٩٦)– الالوسی، حسام الدين واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٨٠.

(٩٧)– الالوسی، حسام الدين واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٨١.

(٩٨)– الالوسی، حسام الدين واخرون: هەمان سەرچاوە، پەراوێزی ل٨١.

(٩٩)– الالوسی، حسام الدين واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٨١.

(١٠٠)– الالوسی، حسام الدين واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٨٢.

(١٠١)– تاسوعات افلوطين، ت: فريد جبر، مراجعة: جيرار جهامي – سميح دغيم، بيروت، الطبعة الاولى، ١٩٩٧، ص (ط – ی).شیاووی باس لێوەكردنە، ئەم كتێبە، لە دەقی ڕەسەنەوە وەرگێڕدراوە، واتە لە خودی زمانی یۆنانییەوە.كە بێ گومان، وەرگێڕ ماوەیەكی زۆر پێیەوە، سەرقاڵ بووە.وە بۆ ئەوەی لای خوێنەرانیش، ڕوون بێتەوە، ئەوەی كە لە بری لاپەڕە، لە كتێبەكەدا، وە بە تایبەتی لە سەرەتاوە، ژمارە نەنووسراوە، بەڵكو بە تیپ، ئاماژەی بۆ كراوە، هەر بۆیە، ئێمەش، زانیارییەكانمان، لە لاپەڕەی (ط – ی) وەرگرتووە.بەڵام دواتر ژمارە دەست پێدەكات.وە ئێمە ئەم كتێبەمان هەیە و، چەند جارێكیش، سوودمان لێوەرگرتووە.

(١٠٢)– لەم بارەیەوە دەڕوانرێتە: كتێبی (تاسوعات افلوطين).

(١٠٣)– الالوسی، حسام الدين واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٨٢.

(١٠٤)– الالوسی، حسام الدين واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٨٤.

(١٠٥)– الالوسی، حسام الدين واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٨٥.

(١٠٦)– عمر، معن خليل: المصدر السابق، ص٩٠.

(١٠٧)– عبدالجبار، نبيل عبدالحميد: تاريخ الفكر الاجتماعي، ص١٢٣.

(١٠٨)– الالوسی، حسام الدين واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٨٧.

(١٠٩)– الالوسی، حسام الدين واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٨٨.

(١١٠)– الالوسی، حسام الدين واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٨٨.

(١١١)– الالوسی، حسام الدين واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٨٩.

(١١٢)– الالوسی، حسام الدين واخرون: هەمان سەرچاوە،ل٩٠.

(١١٣)– الالوسی، حسام الدين واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٩١.

(١١٤)– الالوسی، حسام الدين واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٩٢.

(١١٥)– الالوسی، حسام الدين واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٩٣.

(١١٦)– الالوسی، حسام الدين واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٩٤.

(١١٧)– الالوسی، حسام الدين واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٩٥.

(١١٨)– الالوسی، حسام الدين واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٩٧.

(١١٩)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٩٨.
(١٢٠)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل٩٩.
(١٢١)– چیا، محەمەد، هەمان سەرچاوە، ل٢٧٦.
(١٢٢)– چیا، محەمەد، هەمان سەرچاوە، ل٤١.
(١٢٣)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل١٠٠.
(١٢٤)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل١٠١.
(١٢٥)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل١٠٢.
(١٢٦)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل١٠٣.
(١٢٧)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل١٠٤.
(١٢٨)– احمد، قیس هادي: نظریة العلم عند فرانسیس بیكن، دار الشؤون الثقافیة العامة – (آفاق عربیة)، بغداد، الطبعة الثانیة، ١٩٨٦، ص٥٨.
(١٢٩)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل١٠٥.
(١٣٠)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل١٠٦.
(١٣١)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل١٠٧.
(١٣٢)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل١٠٨.
(١٣٣)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل ١٠٩.
(١٣٤)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل١١٠.
(١٣٥)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل١١١.
(١٣٦)– چیا، محەمەد، هەمان سەرچاوە، ل٢١٦.
(١٣٧)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل١١١.
(١٣٨)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل١١٢.
(١٣٩)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل١١٣.
(١٤٠)– الالوسی، حسام الدین واخرون: هەمان سەرچاوە، ل١١٤.
(١٤١)– شێخ، محەمەد: هیگڵ و فەلسەفەی تازەگەری، و: دلێر میرزا، بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆژنامەنووسی و چاپ و بلاَّوكردنەوە – (بەڕێوەبەرایەتی خانەی وەرگێڕان)، چاپخانەی (شڤان)، چاپی دووەم، ٢٠١١، ل٧.

# دير العاقول
# حيث صرع المتنبي
## دراسة تاريخية طبوغرافية

أ.د عماد عبد السلام رؤوف
كلية الاداب ـ جامعة صلاح الدين

### تاريخه قبل الإسلام

ليس في النصوص التاريخية ما يدل على تاريخ إنشاء (دير العاقول) واسم مؤسسه، خلافاً للعديد من الديارات المعاصرة له[1]، ويبدو انه اكتسب اسمه من شكل مجرى نهر دجلة القريب منه، فالعاقول، كلمة آرامية– عربية تعني منعطف

النهر والوادي[٢]. أما اسمه الحقيقي، فليس ببعيد أن يكون مشتقاً من اسم مؤسسه، أو منسوباً – كما جرى به العرف– إلى احد القديسين أو الشهداء، بيد أن معلوماتنا غير كافية لتوضيح هذا الأمر.

يرتقي تاريخ دير العاقول إلى عهود ما قبل الإسلام، فقد وردت الإشارة إليه في أخبار السنين الأولى للحكم الإسلامي في العراق. قال الدينوري المتوفى سنة ٢٨٢هـ/٨٩٥م عند حديثه عن فتنة الخوارج سنة ٣٩هـ/٦٥٩م "فاخذوا على الانبار، وتبطنوا شط الفرات حتى عبروا من قبل دير العاقول"[٣] . على أن من الغريب حقاً، إن ليس للدير أي ذكر، باسمه هذا، في مدونات المؤرخين النصارى طيلة القرون الأولى لانتشار النصرانية في العراق، مما يبعث على التساؤل فيما اذا كان للدير اسم آخر عرف به قبل الإسلام.

وفي الواقع فانه يفهم مما أوردته المصادر التاريخية النصرانية أن منطقة دير العاقول هذه كانت حافلة بعدد من الديارات المهمة، وقد ذكر منها ايشوعدناح مطران البصرة في القرن الثالث (التاسع للميلاد) دَيرَين يبدو أنهما كانا قريبين من موضع دير العاقول إلى حد كبير. قال في ترجمته للقديس مار دوسا "أسس دير بيت آرامايي (بلاد الآراميين ويريد السواد) بجوار مدينة بيت اشكفيل، ويدعى دير بحزايي حتى اليوم" ثم ذكر أنه أسسه هو، وأخ له في الرهبنة، اسمه يوحنا "عند قرية اشكفيل التي بجوار دورا قوني"[٤]. وعلى الرغم من عدم ورود أية إشارة إلى (بيت اشكفيل) هذه في بلدانية العراق القديمة، كما أن أحدا لم ينوه بدير بحزايي المذكور، فان دورا قوني بقيت معروفة تماماً طيلة العهود الإسلامية، بسبب اشتهارها بالدير المعروف قُني (أو قوني) نسبة إليها. وبما أن الأخير لم يكن يبعد عن دير العاقول – كما سنلاحظ في بحثنا – سوى بضعة كيلو مترات فقط، يكون دير بحزايي هذا اقرب المواضع إلى موقع دير العاقول، بل قد يحتمل القول بأنه

ليس إلا دير العاقول نفسه، بيد أن الأمر يبقى مجرد ظن طالما لم تظهر نصوص جديدة تؤكده، لا سيما وان كاتب الترجمة لم يذكر لنا أي شيء يمكن الاستدلال به على عصر مار دوسا المذكور.

أما الدير الآخر الموصوف بقربه من دير قني، فهو الذي أسسه مار كبرييل (جبرائيل) الكشكري. وقد ذكر ايشو عدناح أنه أسس ثلاثة أديرة في أماكن مختلفة من العراق، واحد منها (بقرب دورا قوني)، وأشار في ترجمته له أنه أقبل الى "دورا قوني حيث شيد ديراً بجوار قرية كرسا، ودعي دير كرسا حتى اليوم، واجتمع فيه الى مائتين (كذا) أخ (راهب)"[٥]. والظاهر أن هذا الدير هو الذي عرفه ايليا برشنايا (توفي ٤٣٨ هـ/١٠٤٦م) باسم (عمر[٦] مار جبريال د كرسا)[٧]. وليس لكرسا هذه أو ديرها أي ذكر لدى البلدانيين العرب، على أن وفاة كبرييل المتأخرة (سنة ١٢١ أو ١٢٢/ ٧٣٨-٧٣٩) تؤكد أن تأسيس الدير كان بعد دير العاقول بفترة طويلة.

## دير العاقول في العهود الإسلامية:

كثرت الإشارات إلى دير العاقول في كتب المؤرخين والبلدان وأهل الأدب، على حد سواء، منذ القرن الثالث للهجرة ( التاسع للميلاد). ويفهم من تلك الإشارات أن بلدة كبيرة كانت تقوم بجواره. وإذ كنا نجهل تأريخ تأسيس الدير نفسه، فأنه يصبح من المتعذر تحديد زمن نشوء هذه البلدة. وفي رواية متأخرة نقلها ابن طولون ألصالحي الدمشقي (المتوفى سنة ٩٥٣هـ/ ١٥٤٦م) إن قرية في نواحي الصلح الأعلى فوق الجانب الشرقي من واسط كانت تدعى في النصف الأول من القرن الأول للهجرة (السابع للميلاد) باسم (العاقول)[٨]ض وأغلب الظن أنها نشأت بعد تأسيس الدير، لأنها انتسبت إليه، فعرفت باسم (قرية أو بلدة أو مدينة دير العاقول)، ولو كان وجودها سابق عليه، لانتسب الدير إليها بطبيعة الحال.

